# سەردەم

37

شوبات
2005
سـالّی شەشەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی


خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین: هەڵکەوت عەبدوڵلا

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان

کاری کۆمپیوتەری: تاڤگە فائق

سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق

ناونیشان

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347

دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( 14665/615و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

www.sardam.info

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە


- سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.
- تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.
- بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.
- هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

# ناوەڕۆك

## فیکر و فەلسەفە



## ڕەخنە و لێکۆڵینەوە



## گفتوگۆ



## لە ئەدەبی گەلانەوە



## ڕانانی کتێب



## وێستگەکانی سەردەم



**نرخی (1200) دینارە**

# فیکر و فەلسەفە

- ڕەخنە لە فاشیزم

ستیوارت هیوز

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

- پۆل ریکۆر

هاشم سالح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- عەلمانییەت وەکو "خاڵی بەیەکگەیشتن"ی
نێوان موسڵمانان و مەسیحییەکان

د. محەمەد ئارکۆن

لە عەرەبییەوە: ئەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

- ڕۆژێك لە ئەسینای دێرین

ولیەم داڤیس

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

- پییەر بۆردیۆ
وەك بیریار و تێکۆشەرێك

محەمەد عەلی ئەتاسی

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

# ڕەخنە لە فاشیزم

ستیوارت هیوز
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

"هیچ پێشبینیەك بە درێژایی سەدەیەك پێشبینی.. هەرگیز وێنای شتێكی وەك فاشیزمی نەدەكرد. لە دامێنی ئاسۆی داهاتوودا، كۆمنیزم و سەندیكالیزم هاوشێوەكانی هەبوون.. جەنگ و ئاشتی و تۆفانی نوح و یان ژیرمانیزم و یان سلاڤیزم هەبوو.. فاشیزم نەبوو.. فاشیزم هەمووانی حەپەسان"[1]. ئەمە قسەی جۆزێ ئانتۆنیۆ بۆرگسێیە كە بیری لەو جموجوڵە دەكردەوە كە لە وڵاتەكەی ڕاوی نابوو، (لە هەمانكاتدا) سەرلێشێوان و سەرسوڕمانی ڕۆشنبیرانی لە بینینی دیاردەیەك دەردەبڕی كە هیچ یەكێكیان پێشبینی نەكردبوو.. شتێكی ئەوتۆ نەمابوو كە هەموو ئەو ئایندەبینیە ئاڵتونیانە لە ناوبەرێت كە لە سەدەی نۆزدەوە بە سەدەی بیست گەیشتبوو.

ڕۆشنبیرانی ئەوروپا حەپەسابوون، چونكە نەیاندەزانی بزوتنەوەكانی پەیڕەوی هیتلەر و مۆسۆلۆنی لە كوێوە بگرن و هەڵیسەنگێنن. نوسەران و مامۆستایانی زانكۆ ڕاهاتبوون بە قسە بچنە ناو هەر بگرە و بێنەیەكەوە.. بەڵام لە بارەی فاشیزمەوە قسە كەسی ڕێنمایی نەدەكرد كە چ شتێك ڕوودەدات. زەمان چووبووە دۆخی هەڵخەڵەتاندن و وروژاندن و خەوتنەوە، نەك ڕونكردنەوە و دەرخستن. درز لە نێوان ڕەفتار و گوتاردا، سنورە ئاساییەكانی ڕێ و ڕەسمی سیاسەتی بە چەندان فرسەخ بڕیبوو. بەتایبەتی ڕوون نەبووبۆوە كە ئایا فاشیزم بزوتنەوەیەكی كۆنەپەرستە یان شۆڕشگێڕ؟ ئایا ڕاستڕەوە یان چەپڕەو. زۆربەی ئەو كەسانەی دەستیاندەكرد بە شیكردنەوەی دەیانبینی كە فاشیزم لە چ خاڵێكی ڕەوتی مێژووی هاوچەرخەوە سەرچاوەی گرتووە: دەیانبینی سەرچاوەكەی یەكێتی نەتەوەیی ناتەواوی ئیتاڵیا و ئەڵمانیا و شكست و نائومێدی خەڵكی ئەو دوو وڵاتە لە جەنگی جیهانی یەكەم و لێكترازانە ئابوریەكانی دوابەدوای جەنگ و بێكاری گشتی لە سەرەتاكانی دەیەی 1930دا. كەسانێك كە زۆرتر دەچونە قوڵای مەسەلەكانەوە باسی جۆرێك نەگونجانی كۆمەڵگاكانی ئیتاڵیا و ئەڵمانیایان دەكرد جیاواز لە كۆمەڵگاكانی فەرەنسا

و ئینگلتەراو قبوڵکردنی سنوردارتری بەها دیموکراتیەکان لەلایەن چینی ناوەڕاستەوە. بەڵام ئاشکرا بوو ئەم هۆکارە پەرتوبلاو ودابڕاوانە بەس نییە. فاشیزم خاوەن دینامیکیەت و هێزێك بوو کە لە هیچ پێوەرێکی سادەدا جێی نەبۆوە.

بەڵام شتێك هەبوو کە هەموان – چ کەسانێك کە لە ئەوروپا مابونەوە و چ ئەوانەی کە کۆچیان بۆ ئەمەریکا کردبوو – لێی دڵنیابوون، ئەویش ئەوەبوو کە ئەو ڕژێمەی لە 1922 لە ئیتاڵیا و یانزە ساڵ دوای ئەوە لە ئەڵمانیادا هاتە سەر حوکم، ناوێك زیاتری نەبوو. دیارە بێ هۆ نەبوو کە مۆسۆلۆنی دەیەیەك پێش هیتلەر سەرکەوتبوو، هەروەها بێگومان هیتلەر رکێفی شتەکانی توندتر گرتبوو، وە چەندانجار لە مۆسۆلۆنی کە نمونەی هیتلەر بوو، زیاتر باوەڕی بە "نەژاد" هەبوو. بەڵام ئەمانە هەمووی مەسەلەی زەمانمەندی و توندی و لاوازی بوو.. هیچکەس لەو ڕۆژگارانەدا گومانی لەوە نەبوو کە ناسیۆنال سۆشیالیزمی ئەڵمانی شێوەیەکی تری –دیارە شێوەیەکی توندڕەوانەتری– هەمانجۆر ئەو حکومەتەیە کە "دۆچە" لە ئیتاڵیا دایهێنابوو. مۆسۆلۆنی ناوی حکومەتەکەی نابوو "فاشیزم" و دواجار ئەم ناوە بۆ هەموو لاسایکەرەوەکانی لەسەرتاسەری ئەوروپادا بەکاردەهێنرا. لەو سەردەمەدا کە فاشیزم لەسەر کار بوو کەسانێك کە ئەزمونیان کردبوو لە هەلومەرجێکدا نەبوون کە بە جۆرێك هەمەکیگۆیی ئاڵۆز، وێنای بکەن. ئەو سەختیانەی دەرئەنجامی فاشیزم بوو ئەوەندە واقعیبوون کە جێگەیەکی بۆ ئەمجۆرە وێنایانە نەدەهێشتەوە. بێگومان لەو کاتەدا هەر ساویلکانە و کۆمیدی دەهاتە پێشچاو گەر کەسێك بیویستایە بچێتە ناو وتوێژی لەفزی و شیکردنەوەی ئەو تاریکبیرانەی کە کەسانێك لەسەر بناغەی ئەو هەر هەڵێکیان بە مەبەستی بەراوردکردنی ڕژێمە فاشیستیەکان ڕەد دەکردەوە، چونکە دەیانگوت مەسەلەکە ئەوەندە ئاڵۆزە کە ناکرێ گشتگیر (تەعمیم) بکرێت. راستە لەم ناوەدا بە تایبەتی لە جەنگی جیهانی دوهەمدا سود لە زاراوەی "فاشیست" و "فاشیزم" بۆ ناوناتۆرەی هەڵنەسەنگێنراو وەردەگیرا، بەڵام ئەمکارە زۆرتر لە وتوێژە گروپبەندەیەکاندا ئەنجامدەدرا تا لە شیکردنەوەیەکی زانایانەدا. کەسانێك کە بە ویژدانی زانستیەوە لە فاشیزم دەکۆڵینەوە، بە دوای وردبینی ویتەوی فکریەوە بوون، و لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمە فاشیەکاندا چەندان ڕەنجیان کێشابوو، وە بێزاری خۆیان لە ڕژێمی فاشیسم نەدەشاردەوە، تا دەیانتوانی هەوڵیاندەدا بەڵگە و سەنەد کۆبکەنەوە و بەڵگە کۆکراوەکان بە پێوەری پسپۆریانەی قبوڵکراو، هەڵسەنگێنن.

لەبەرئەوە ئەو بزوتنەوە و ڕژێمانەی کە سەردارانی مامۆستایانی هونەری گێژکردنی خەڵکی و ئاڵۆزکردنی مەسەلەکان بوون و ئایدۆلۆژیاکانیان پڕ لە ناکۆکی بوو، بوون بە بوارێك بۆ تاقیکردنەوەی توانای کۆچبەران. فاشیزم نەك هەر ئەو کەسانەی دەستیان کردبوو بە لێکۆڵینەوەی لەناو زۆنی لە فزیدا غەرق نەکرد، بەڵکو رەخنەگرانی بۆ هەوڵی قارەمانە بۆ روونکردنەوە و دەرخستنی ورووژاند و تیورەسازی کۆمەڵایەتی بەرەو مەسەلە واقعیە پەلەکان ئاراستە کرد و ئەو مەسەلەیەی بە توندی هێنایە پێشی کە خەسڵەتە سەرەکیەکانی کۆمەڵگا پیشەسازیە ئەمڕۆییەکان چییە و تیورە مارکس و نیمچە مارکسیەکان تا چەند بەکەڵکی شیکردنەوەی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆ دێن. بەشێوەیەکی گشتی ڕژێمە فاشیەکان ئەو مەسەلەیەیان دەهێنایە پێشی کە کاتێك

شـــیکردنەوەکانی پێشـــوو، چ ناچـــارانە بـــەهۆی هەلومەرجـەوە و چ بـە هـۆی خەسڵەتی لێکۆڵـەرەوە، خــــاڵی بـــــەهادانان نـــــەبێت، ئایـــــا دەشـــــێت هەڵسەنگاندنێك بکرێت کە بایەخێکی درێژخایەنی هەبێت؟

1 )یەکەم تێڕوانینەکان:

**بۆرگێسێ و مانهایم و فرۆم**

سێ کەس لە رەخنەگرانی فاشیزم لـە هـەمووان زیاتر کاریگەریان هەبوو، وە کاریان لـە کەسـانی دی کرد، بەلاّم ئەوەی لەمبارەیـەوە نوسیان بـە پێـی ئـەو ماهیەتـەی کـە هـەیبوو نـەگرنگترین نوسـینەکانیان بـوو، نـە تـەوەرەی سـەرەکی لـە ژیـانی فکریانـدا پێکدەهێنا.

رەهەنـدی هاوبەشـی بۆرگێسـێ و مانهـایم و ئەریك فرۆم ئەوەبوو کە هەرسێکیان یـان لـە کۆتـایی یـان سـەرەتای چـالاکی ژیانیانـدا دەسـتیانکرد بـە تاوتوێکردنی فاشیزم و چالاکیان بە گشتی رووی لە شتی دی بوو. ئەوەی لەمبارەیەوە گوتیـان بـە ناچار کـاتی بـوو. هەرسـێکیان تێـڕوانین و بنەمایـەکیان پێشکەشـــکرد، بـــەلاّم هیچـــیان دەســـتیان بـــە شیکردنەوەیەکی تەواو و کامڵ نەکرد.

جۆزێپێ ئانتۆنیۆ بۆرگێسێ هێشتا پـەنجا سـاڵ تەمەنی نەبوو کە لە ساڵی 1931دا کاتێك سـەفەری بـۆ ئـەمـەریکا بـە نیـازی هەنـدێك سمینـار کـرد، لـە سـوێندی وەفـاداری (بـۆ رژێمـی مۆسـۆلۆنی) کـە بەسـەر هـەموو مامۆسـتایانی زانکـۆی ئیتاڵیـادا سـەپێنرابوو، سەرپێچیکرد و بڕیـاری مانـەوەی لـە ئەمـەریکا دا. بۆرگێسـێ لـە 1882دا لـە سیسـیل لـەدایکبوو.. رەخنـەگر و مامۆسـتای سـتاتیك و شاعیر و رۆمانوس بوو کە بە *enfant terrible* (منـاڵی بزێو و عەجولی) ئـەدەبیاتی ئیتاڵیا بـەناوبانگ بـوو.

بۆرگێسـێ هـەروەها پڕوپاگەندەکـەرێکی خـاوەن راو نهێنی ئاشکراکەر لـە بـواری مەسـەلە کۆمەلاّیـەتی و سیاسیەکاندا بوو کە وازی لە بیروڕا فەلسـەفیەکەی مامۆسـتاکەی خـۆی واتـە کرۆچـە هێنـابوو، وە رەوتـی تایبـەتی و نائاسـایی خـۆی دژ بـە فاشـیزم گرتبوە بەر.

سـەرەتا بۆرگێسـێ لـە ئەمـەریکادا لـە کـۆلێجی سمیس و پاشان لە زانکۆی شیکاگۆ سـەرقاڵی وانـە گوتنەوە بوو، لەم زانکۆیەدا بوو کە لەگەڵ یەکێك لـە کچـەکانی تۆمـاس مانـدا ئاشـنایی پەیـداکرد و هێنـای. تۆمـاس مـان سـەرەتا بـەهۆی سـی و شـەش ساڵ جیاوازی تەمەنەوە، ئەم پەیوەندییەی پێخـۆش نەبوو، بەلاّم زۆری پێنەچوو کە لـەم ناخۆشیە هاتـە دەرێ و بۆ براکـەی هـاینریش نوسـی کـە بۆرگێسـێ "پیـاوێکی زۆر هوشـیار و رۆح سـوکە و زۆر بـاش ماوەتەوە.. و تا دوا پلە رقی لە "دۆچە"یە.

زەمینــە و پێشـەکی فکـری بۆرگێسـێ زۆرتـر ئـەدەبی بـوو، لێرەوە وەك لـە کەسێکی وا پێشبینی دەکرێت، رەخنـەی ئـەو لـە فاشـیزم لەسـەر بناغـەی کاریگـــەری حســـی دامـــەزرابوو. نوســـینەکانی لەمبارەیـەوە زۆر دڵـرفێن و شـیرین بـوو. بۆرگێسـێ دەســـەلاّتێکی بەســـەر نوســـینی ئینگلیزیـــدا پەیـدا کردبـوو کـە بـۆ کەسـێك ئەوەنـدە درەنـگ دەسـتی بـەمکارە کردبـوو، یـەکجار سەرسـوڕهێنەر بـوو. نوســینەکانی تێکەڵەیــەك لــە حکایەتــە شــیرین و کاریگـەرەکان و پەخشـانەکەی پـڕ بـوو لـە هونـەری جـوانی سەرسـوڕهێنەر. هـەر ئـەم توانـای نمایشـە دەبـووە هـۆی ئـەوەی زیـاتر جـەخت لـە رەهەنـدە دیارەکـانی فاشـیزم بەشـێوەیەکی هونـەری – وەك هەوراز و نشێوی ئاراستەی فاشیزم بەرەو دەسەلاّت و سەرچـاوە کلتـوری و مێژووییەکـەی – بکـات.

بۆرگێسێ لە ئەزمونی حکومـەتی مۆسـۆلۆنیەوە بـەو

دەرئەنجامــە گەیشــتبوو کــە قبــوڵکردنی لەلایــەن خــەڵکی ئیتاڵیــاوە زۆرتــر دەرئــەنجامی لاوازی کەسایەتی و خەسڵەتە. ئەو بڕوای وابوو کە "پایە بەرجەســتەکانی فاشــیزم خــاوەن ماهیــەتێکی دەرونــی و هەســتیە" و فاشــیزم شــتێك بــووە کــە "سەرەتا لە دەرونەکاندا رویداوە (پاشان) رێگەی خــۆی لــەناو واقعیــەتی مێــژووی جــەماوەردا کردۆتەوە".

ساڵێك پاش دەرکەوتنی هیتلەر بۆرگێســیٚ لێکۆڵینەوەیەکی لە بارەی سەرچاوە فکریەکانی فاشیزمەوە بلاْوکردەوە کە ئەگەرچی بەشێوەیەکی سەرەکی پەیوەندی بە ئیتاڵیاوە هەبوو، بەلاْم بەگشتی ئاماژەی بۆ ئەو شتانەش دەکرد کە لە ئەڵمانیادا روودەدەن و ئەو بزوتنەوانەشی کە هیتلەر و مۆسۆلۆنی بونیادیان نابوو، دەگەڕانەوە بۆ یەك سەرچــاوەی کلتــوری. بۆرگێســیٚ ئــەم سەرچاوانەی لەو "پێشینانەدا" دەدۆزیەوە کە لە رووی "ئایدیالی و سۆزداریەوە" لە نێوان ئەو تاکانەدا هاوبەشبوو کە خاوەن خوێندنێکی "مامناوەندی" بوون. ئەو دەیگووت فاشیزم شتێکی نییە کە لەلایەن دێهاتی یان لای کەسانێکی "بەڕاستی بیریار" کە "خۆراکێکی فکری پاکیان دەوێت"، قبوڵبکرێت. بەلاْم بۆ کەسانێك کە تێشویەکی فکریان نییە و برسێتی دەچێژن، "ڕۆژانەی خۆراکێکی رۆحی" ئامادە بکات. فاشیزم "لە چرکەی یەکەمدا چ لە رووی کلتوری و چ لە رووی سیاسیەوە، جۆرێکی رۆمانسیەتی پەست و دزێو و سوکە.. شۆڕش نییە.. خۆ خواردنەوەیە" فاشیزم دەیەوێت خەڵك فێر بکات کە "گۆڕان" "جەوهەری" شتەکان و "سۆز و گەرمی.. فەزیڵەتە" چونکە لەسەر ئەو بڕوایە دامەزراوە کە زۆر، هەق دروستدەکات و "دەسەلاْت لە بری دادپەروەری" دادەنێت، بووە بە "مەرامی چینی ناوەڕاستی خوارەوە".

بۆچی فاشیزم لە ئیتاڵیادا سەرکەوت؟ بۆرگێسیٚ وەلاْمێکی سادەی نەدەدایەوە، بەڵکو زۆرتر بەلای ئەو بڕوایەدا دەچوو کە هۆی ئەمە تێکەڵیبونێکی سەرسوڕهێنەری مەزنی و لاوازیە لە مێژووی ئیتاڵیادا. بە نوسینی ئەو:

"ئیتاڵیەکان دوو هەزار ساڵ ئیمپراتۆریەتێکی جیهانی و مەزهەبێکی گەردونیان هەبوو.. خۆیان بە بەرزەفڕی خەیاڵی سیاسی و لە هەمانکاتدا وازهێنان لە کەسایەتی "خود" لە ژیانی کۆمەلاْیەتیدا بە خەمناکترین شێوە گرتبوو.. و لێرەوە ئامادەی قبوڵکردنی هەرشتێکی سەیر و تازەبوون. بە تایبەتی ئەگەر بکرێ ئومێد بەوە هەبێت کە ئەم نوێ و تازەییە، گیانێکی تازە بە بەرگرێی مەزنێتی کە لە رۆمانیەکانەوە بە میرات ماوەتەوە، بکاتەوە و گرێی مەزنێتی سەرسەختی بەرهەمی سەردەمی تازە کۆنترۆڵ بکات."

هەڵسەنگاندنە دەرونیەکانی بۆرگێسیٚ لە سنوری گوتارە دوبارە کلێشەیەکانی خوێندەوارە ئاسایەکانی دەیەی 1930 تێپەڕی نەدەکرد، بەلاْم باسی ئاگاداری ئەوی لە سەرگەردانی و بێ شوناسی و پەرێشانی رابەر و پەیڕەوان لە بزوتنەوەی فاشیزمدا دەکرد. بۆرگێسیٚ پاشان رایگەیاند کە دەبێ مۆسۆلۆنی لە "دەروازەی چاوی رۆمانوسێکی باشەوە" تاوتوێ بکەین، و گوتی دورە شتێك هەبێت کە فرۆید بتوانێت لە بارەی "دۆچە"ی ئیتاڵیاوە پێمان بڵێت. "فرۆید بە ئیحتیماڵێکی زۆر فایلی مۆسۆلۆنی بۆ یۆنگی هاوکاری دەنارد" (کە دیارە ئەگەری کارێکی وا پاش چارەکە سەدەیەك لە پچڕانی پەیوەندی ئەو دوانە، شتێکی دوور بوو) چونکە بە بڕوای

بۆرگێسیٚ رووبەڕووبونەوە لەگەڵ ئاوەها "کێشەی خۆپەرستی هەمەلایەنە"دا تەنها لە توانای نهێنیبین و غەیبگۆیەکی (وەك یۆنگدا) بوو.

کتێبەکەی بۆرگێسیٚ جالوت سیٚ ساڵ پاش وتارەکەی لە بارەی رەگوڕیشە فکریەکانی فاشیزمەوە بلاٚوبۆوە. ئەو لەم کتێبەدا هەندێك بابەتی لێکۆڵینەوەکانی پێشووی زیاتر پەرەپێدەدات، بەلاٚم کەمتازۆر تەنها سەرنجی لەسەر ئەزموونێك بوو کە لە ئیتاڵیادا روویدابوو. بەوردی هەوڵیدەدا تەفسیری مارکسیەکان بۆ فاشیزم کە لەو سەردەمەدا باو بوو، رەدبکاتەوە. دەیگوت: "چەند ئەو قارچکانەی لە ژێر درەختدا دەڕوێن یان ئەو درك و داڵەی کە بە لقەکانیدا سەردەکەوێت، دەتوانێت بۆمان رونبکاتەوە کە خودی درەخت چییە، هەر هێندەش هۆکارە کۆمەلاٚیەتی و ئابورییەکان دەتوانن فاشیزم رونبکەنەوە". پێشتر بۆرگێسیٚ گوتبووی کە فاشیزم "کەفوکوڵی هەژان و رۆشنبیر نماییە". لە چالوتدا هێشتا بڕوای وابوو کە ئەو پێناسەیە راستە و دەیگوت "گوناه لە زیهن دەروندا بووە، رزگاری و ئازادبوونیش دەبێت لە زیهن و دەرونەوە بجۆشێت" لێرەوە ئەو بڕوای وابوو هۆکاری هەستیار و چارەنوسساز ئەوەبووە کە هاوسەفەرانی ڕۆشنبیری چۆن کاردانەوەیان بەرامبەر حکومەتی مۆسۆلۆنی پیشانداوە و بە تاڵیەوە دەڵێت کە زۆربەی ڕۆشنبیران ترسنۆکانە کاریان کردووە. تەنانەت کرۆچیٚ کە جیهانی دەرەوە بە رەمزی بەرگری فکریان دادەنا، لە ڕێنمایکردنێك کە کەسانی بچوکتر چاوەڕێیان لێیدەکرد، کورتی هێنا: سەرەتا لەو ڕووەوە کە ماکیاڤیلیزمی ناو نوسینە پێش فاشیەکانی خۆی وەرنەگرتەوە و دووهەم لەو ڕووەوە کە لاوانی لەو دڵنیا کردبوو "کە زەحمەتکێشان لە پێناوی کلتوردا" کاردانەوەیەکی بەسە لە بەرامبەر حکومەتی زۆرداری وستەمدا و بەمشێوەیە ویستبووی ویژدانیان ئارامبکات.

بۆرگێسیٚ ئەو دەرئەنجامەی وەردەگرت کە "هەموو پایەکانی هەستی ئیتاڵیایی رووخان، چونکە لە بنەڕەتەوە بە هیچ شێوەیەك پتەو نەبوون". ئەمڕۆ دەزانین کە ئەم بەدبینیە زیادەڕەوی تێدایە، بەلاٚم لەوەش تێدەگەین کە بۆرگێسیٚ لەبەر چ هۆیەکی شەخسی ئەم قسانەی کردووە. ئەو پیاوێکی تەنیا بوو لە سەرزەمینێکی غەریبدا، بیٚ هیچ پەیوەندیەك لەگەڵ هیچ بزوتنەوەیەکی سیاسی کۆچکردودا و بیٚ بوونی پەروەردەیەکی پێویست بۆ شیکردنەوەی وردی ئایدۆلۆژی یان سیاسی. لێرەوە هیچ چارێکی نەبوو جگە لە پشت بەستن بەو تێشووە عەقلی و فکریەی کە هەیبوو، واتە قەریحەی خۆی و ئەز زانینە زانکۆییەی لە مێژووی کلتوری ئەوروپاوە فێری بووبوو. کتێبەکەی جالوت ریوایەتێکی مێژووی شیرین بوو لە روداوە مرۆییەکان و بەرهەمی ئایدیالیزمێکی بالاٚ، هەم بە مانای فەلسەفی و هەم بە مانای ئاسایی بوو کە راستەوخۆ لای هەموانەوە پێشوازی لێکرا. ئەگەریش لە سنوری دەربڕینی مەعنەوی فاشیزم زیاتر نەدەڕۆیشت، لایەنیکەم پیشانیدەدا فاشیزم لای چ کەسانێك دڵنشینە، واتە هەمان ئەو کەسانەی کە بوونە جێی سەرنجی لێکۆڵەرەوانی دوایی.

کارل منهایم لە دوو دەیەی دوای تەمەندا چیدی هەرگیز بە لوتکەی سەرکەوتن لە جیهانی ئەندێشەدا نەگەیشتە ئەو ئاستەی کە لە 1920دا بە هۆی کتێبی "ئایدۆلۆژیا و یۆتۆپیا"وە داگیریکردبوو. کۆچکردن بۆ ئینگلتەرا لە 1933دا بووە هۆی غافڵبوون لە چەند مەسەلەیەکی تیوری

کە باسکردنی (کارل مانهایمی) لە پاش مردنی ماکس فیبەرەوە گەیاندبووە داهێنەرترین کۆمەڵناسی ئەڵمانی. مانهایم وازی لە کۆمەڵناسی زانین هێنا کە گەلێك حەزی لێدەکرد و روویکردە شتە وەزیفی و تەنانەت پڕوپاگەندەکان، یەکێك لە پەخشکار (ناشر)ە لەندەنیەکانی رازیکرد وەك بەڕێوەبەری کۆمەڵەیەك بە ناوی "کتێبخانەی نێو نەتەوەیی کۆمەڵناسی و چاکسازی کۆمەلآیەتی" پشتیوانی لێبکات. ئەو بەرهەمانەی لەم کۆمەڵەیەدا بلأوکرایەوە بریتی بوو لە زنجیرەیەك وتار کە بە شێوەیەکی سەرەکی قەڵەمی نوسەرانی ئەمریکی و ئەوروپایی و نا ئینگلیزی لە بوارەکانی سەرژمێری و پەروەردە و یاساکان و ئەنترۆپۆلۆجیا و دیندا دەیانوسی. خودی منهایمیش سەرقاڵی پڕوپاگەندەکردن بوو بۆ "بەرنامەڕێژی دیموکراتیك" کە بڕوای وابوو تاکە ڕێگەی ڕزگاری رۆژئاوایە لە چنگی دیکتاتۆری و جەنگ و لەم ئاستەشدا چەندان سمیناری گێڕا و چەندان شتی نوسی.

لە نوسینەکانی قۆناغی دوایی مانهایمدا هەم کاریگەری ئینگلتەرا بەسەریەوە دیاربوو، واتە دیاربوو کە ئاراستەی بیریارانی کۆمەلآیەتی ئینگلیز بەرەو بەرژەوەندی عەمەلی و چاکسازی کۆمەڵگا، پاڵیان پێوەنا کە بیروڕاکانی خۆی بە شێوازێکی سەر ڕاستر و ئاسانتر بۆ تێگەیشتن دەربڕێ — هەم دەبینرا کە ئەم هەستە تازەیەی پەیام بۆتە هۆی گەڕانەوەی بۆ سەرچاوە سەرەکیەکانی بیری خۆی. مانهایم لە لاویدا پێش جەنگی جیهانی یەکەم لە بۆدابێستدا ئەندامی کۆمەڵێك نوسەری لایەنگری چەپ بوو کە زوربەیان وەك خۆی یەهودی بوون و بە پەیڕەوکردنی لۆکاش، ڕۆشنبیرانیان بە ڕزگارکەری ئایندەی کۆمەڵگا دەزانی. دیارە ئەم تێڕوانینە لە هەلومەرجێکی وەك ئەو ڕۆژەی مەجەرستاندا بە تەواوی دەرك دەکرا: چینی حوکمڕانی ئەرستۆکرات و بەڕێزەکان، سەرسەختانە دژی هەموو گۆڕانێك بوون و بۆرژوازیە خوێندەوارەکان نەك هەر ژمارەیان کەمبوو، بەڵکو خاوەن هیچ دەستڕۆیشتنێکی ئەوتۆ نەبوون. ئەم هەلومەرجە بووە هۆی ئەوەی مانهایم لەسەرتاسەری تەمەنیدا پەیوەست بێت بە کۆمنیزمەوە، ئەگەرچی پەیوەندی بە مارکسیزم و باڵی چەپی سیاسیەوە ناسکتر و پڕ لەسەروژێری زیاتر بوو لە کەسانی دی. مانهایم هەلومەرجی خۆی بە هەلومەرجی بیریارێکی "ئازاد لە لایەنگری" دەبینی. ئەم تێڕوانینە پاش کۆچکردنی بۆ ئەڵمانیا لەو چەمکەدا دەرکەوت کە ڕۆشنبیر زۆرتر ناوبژیوان یان هۆکارێکی نێوان چینەکان و بەرژەوەندییە جیاوازەکانە لە کۆمەڵگادا، تا ئەوەی یەکێك بێت لە نوێخوازە کۆمەلآیەتییەکان. یەکێك لە پایەکانی بانگەشەکانی لە "ئایدۆلۆژیا و یۆتۆپیادا" هەر ئەم بیرۆکەیە بوو، بەلأم پاش دووهەم کۆچکردنی بۆ ئینگلتەرا هەستی کۆنی رزگارکەر دووبارە تیاییدا تازە بووەوە. مانهایم هەڵوێستی لێکۆڵەرەوانە و ئازاد لە لایەنگری ساڵەکانی ناوەڕاستی ژیانی لە ئەڵمانیادا بە بازدانێکی گەورە بەجێهێشت و تێکەڵەیەکی سەرسوڕهێنەری لە سەلیقەی تایبەتی خۆی بۆ دەستەبژێرخوازی سالأنی ژیانی لە مەجەرستان و ئەو باوەڕە ئەنگۆساکسۆنەی کە بۆ هەر کێشەیەکی کۆمەلآیەتی یان سیاسی بێگومان دەبێت چارەیەکی گونجاو هەبێت، دروستکرد.

کتێبی "مرۆڤ و کۆمەڵگا لە سەردەمی چاکسازیدا" دەریدەخست کە مانهایم لە بواری بیروڕاکاندا قۆناغی ئەڵمانیای بەجێهێشتووە و چۆتە قۆناغی ئینگلیزیەوە. ئەم کتێبە پاش دوو

ساڵ کۆچکردنی نوسەر بۆ ئینگلتەرا، سەرەتا بە زمانی ئەڵمانی لە هۆڵەندەدا بڵاوکرایەوە و پاشان بە دەستکاری و خستنەسەری لە 1940دا بە ئینگلیزی بڵاوکرایەوە. لە سەرەتای کتێبەکەدا مانهایم ئەوە روونده‌کاتەوە کە هەلومەرجی باڵادەست لە کاتی نوسیندا، کاری کردۆتە سەر بابەتی کتێبەکە. دەیگوت من یەکێك بووم لەو کەسانەی کە دەستی چارەنوس ئەوەی "بۆ رەخساند لە زۆر وڵاتدا بژین و ببینن کە بیروبۆچونە جیاوازەکان لەگەڵ بیروبۆچوونی ئەواندا چونیەکە" لەبەرئەوە بە ئەرکی خۆم زانیووە ئەم بۆچونانە لە "سەنتزێکی تازەدا" پێکەوە تێکەڵبکەم و بە تایبەتی ئەو هەستەی کە سەرچاوەیەکی ئەڵمانی هەیە "لەسەر لوتکەی بورکانێك دانیشتووم" لەگەڵ ئەو خوشبینیەی کە دەرئەنجامی ژیانمە لە ئینگلتەرەدا تێکەڵبکەم کە "لە وڵاتێکدا دەژیم دیموکراسی لیبراڵ بە گشتی بێ هیچ کەموکوڕیەك کار دەکات".

مانهایم دەیگوت ئەگەرچی نیشتەجێبونم لە ئینگلتەرا یارمەتی داوم "خۆم لە کوێتی گومانی خۆم بەرامبەر بە چالاکی و هێزی زیندووی دیموکراسی رزگار بکەم"، بەڵام بڕواکەی پێشووم هەروەك خۆیەتی کە گۆڕانکاریە قوڵە بونیادیەکان دەبێتە هۆی داڕزان و خوسانی ئەو بناغانەی کە لایەنگران و بەرگریکاران لە دیموکراسی بوونیان لە رووی کۆمەڵایەتییەوە بە بەڵگەنەویست دەزانن.

مانهایم هەستیکرد بۆ پێناسەکردنی ئەم گۆڕانکاریانە "کوێرانە دەچێتە پێشێ" و ئەو کارەی قوڵی بۆ هەڵمالیووە، ناتەواو و دوورە لە هەموو جۆرە "وەهمێکی برانەوە و بەڵگەی رەها". لەگەڵ ئەمانەشدا مانهایم لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە "دەیەکانی رابردوو" لە رووی "ئەخلاق و عەقڵ"ەوە شایەتی جۆرێك پێشکەوتنی پێچەوانە بووە. و هاوڕا لەگەڵ هێگڵیەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، ئادرنۆ و هۆرکهایمەر، دەرکەوتنی حکومەتە دیسپۆتیزمەکانی بە جۆرێك لە داڕمانی عەقڵەوە دەبەستەوە و مەترسی ئاوەها داڕمانێکی دەگەڕانەوە بۆ خەسڵەتی کۆمەڵگا مەزنە پیشەسازیەکان. ماکس فیبەر پێشتر گوتبووی کە ئەمجۆرە کۆمەڵگایانە بوونەتە هۆی دروستکردنی "زنجیرەیەك کردار" کە "لە رووی عەقڵەوە تا دوا پلە قابیلی حسابکردن و پێشبینیکردنن" و ئەمەش پەیوەستە بە "رێگەکانی بەرگرتن بە تێرکردنی خواستە هەنوکەییەکان و وازهێنان لە تێرکردنی یەکسەری خواستەکان" و "میکانیزمی کۆمەڵایەتیان" بە ئاستێك لە ناسکی گەیاندووە کە "بچوکترین خەلەلی ناعەقڵانی رەنگە فراوانترین کاریگەری لەسەر دابنێ"، و لە هەمانکاتدا کۆمەڵێك "وزەی دەرونی کۆنترۆڵنەکراو و کەڵەکەبویان" دروستکردووە کە رەنگە "یەکسەر دەزگای ناسکی ژیانی کۆمەڵایەتی، تێکبشکێنێ". مانهایم رەهەندی دەرونی – کۆمەڵایەتی بزوتنەوە فاشیستیەکانی لەم ململانێ چارەنوسسازەی نێوان عەقڵ پیشەیی تەکنیکی و بزواندنی جەماوەردا – یان بە دەربڕینێکی تر لە کار و کاردانەوەی دیالەکتیکی نێوان ئامێرە ناسکەکان و دڕندایەتی شاراوە و بەزەبردا، دەبینی.

مانهایم بڕوای وابوو "تا هەنوکە" خەڵکی بڕوایان وابووە کە "ململانێی بە رێژە ئازاد لە نێوان شێوازە جیاوازەکانی پەروەردە و ڕاگەیاندن، لە رێگەی هەڵبژاردنی سروشتیەوە، ئەگەری گەیشتن بە بەرزترین پلەی بۆ تاکە عەقڵانی و خوێندەوار و شایستەتر لە کەسانی دی، رەخساندووە"، بەڵام ئەزمونەکانی دەیەکانی 1920 و 1930 بێ بناغەیی

ئەم باوەڕەی سەلماندووە و "میکانیزمە ئاساییەکانی" هەڵبژاردن نەیتوانیوە کاربکات. لەبری ئەمە جۆرێک "هەڵبژاردنی نێگەتیڤی دەستەبژێرەکان" پەیدابووە، بەو مانایەی "کەسانێك کە لە رابردوودا خاوەن و پارێزەری نەریتە کلتوریەکان بوون، هەنوکە هێواش هێواش شەرم لە بەهاکانی خۆیاندەکەن و ئەو بەهایانە بە نیشانەی لاوازی.. و جۆرێك ترسنۆکی دەزانن" و لە هەمان کاتدا "نوێنەرانی کلتورە ناوچەییەکان" بە پشتبەستن بە ترسان لە بێگانە (*xenophobia*) و ئەوەی لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا بە هونەر دادەنرێت، دەستیان کردووە بەبێ بایەخکردنی دروشمە گەردونیەکان.

مانهایم هەرگیز وازی لەو بڕوایە نەهێنا کە کلتوری مەزن پەیوەندی بە بەها ئەرستۆکراتیەکانەوە هەیە. لە ئینگلتەرا هێشتا ئەو ئەگەرەی دەبینی کە چینی سەرەوە لەگەڵ هەرسکردن و راکێشانی ئەو تاکانەی هێواش هێواش لە چینەکانی خوارەوە دێنە ناوی، توانای بەرگریکردن لە پلە و پایەی تەقلیدی خۆشی هەبێت، بەڵام لە ولاّتانی تری ئەورووپادا دەیبینی گرووپە کۆنەکان و رۆشنبیران هێواش هێواش "توانای هەرسکردن و راکێشان" لە دەستدەدەن و بە بەرامبەرەکەیان دەدۆڕێنن و ڕکێفی رابەرایەتی سیاسی و کلتوری بە تاکەکانی چینی ناوەڕاستی خوارەوە — واتە "کارمەندانی ئاستی خوارەوەی دەوڵەت و پیشەوەران و بازرگانان و جوتیارانی بچوك و دەست کورتەکانی خاوەن دەرامەتی جێگیر" — تەسلیمدەکەن. مانهایم بڕوای وابوو ئەم گرووپە تێکەڵە خۆبەخۆ کۆنەپەرستە: لە هەموو لایەکەوە لە ژێر مەترسیدایە و هەوڵدەدات بە "پشتبەستن بە هەموو ئەو هونەرە سیاسیانەی لە بەردەستدان و بەمەبەستی سنوورداركردنی پەرەسەندنی شێوازە عەقڵ پەسەند و لۆژیکی لە پیشەسازیدا و بەرگرتن بە پەیدابوون و پەروەردەبوونی تاکە عەقڵ پیشەکانی ئەمڕۆ و چەکدار بە دروشمە مرۆڤ دۆستەکان، خۆی ڕزگار بکات".

بەمشێوەیە مانهایم لە ڕێگەیەکی یەکجار جیاوازەوە بەهەمان ئەو دەرئەنجامە گەیشتبوو کە بۆرگێسی پێی گەیشتبوو، وە دواجار چاوی بڕیبووە هەمان ئەو چینەی کۆمەڵگا، کە بۆرگێسی چاوی تێبڕیبوو. نوسەری ئیتاڵیای (واتە بۆرگێسی)بە دوای سەرچاوەکانی رۆمانتیزمی تازەی تاکەکەسە نیمچە خوێندەوارەکاندا گەڕابوو، وە گەیشتبوو بە سەدەی نۆزدەهەم، لێکۆڵەرەوە مەجەری و یەهودی و ئەڵمانی و نێشتەجێی ئینگلتەرا تێزەکانی ماکس فیبەری هەڵگرت و رەنگێکی فرۆیدی پێبەخشی بەمشێوەیە روونیکردەوە کە مەبەست لە "هەڵبژاردنی نێگەتیڤی دەستەبژێرەکان" چییە. مانهایمیش وەك بۆرگێسی پەنجەی خستە سەر چینی ناوەڕاستی خوارەوەی کۆمەڵگا، بەڵام تەنها بە دەرککردنی ئەو ترس و پەشێویانە وازی نەهێنا کە تاکەکانی ئەم چینەی کردووە بە گرووپی سەرەکی خزمەتکارانی بەزەبری فاشیزم. ئەو هەروەها پەردەکەی لابرد بۆ ئەوەی ببینێت لە پشت ئەو تاکە تۆقیوانەوە، چ کەسانێك رەنگە لە تاریکیدا کەمینیان دانابێت، و بەو تێڕوانینە گەیشت کە بێگومان لە کاتی شێتبوونی جەماوەردا، دەبێت کەسانێك هەبن کە هێمن بمێننەوە و هێزی خۆیان بۆ حسابکردنی عەقڵانی بپارێزن. ئەمجۆرە کەسە بەهێز و خاوەن نیعمەتانە هەمان سەرکردەکانی سوپا و بازرگانە سەرمایەدار و بەرپرسیارە گەورەکانی دەوڵەتن کە

هەندێکجار هێشتا دەیانەوێت سود لەم نەبوونی زەمانەتی گشتیە بۆ خۆیان وەربگرن و رەنگە کەسانێك بدۆزنەوە و پشتیوانی لێبکەن کە باشتر لە خۆیان خاوەن توانای رابەریکردنی جەماوەر بن بە نوسینی مانهایم:

ناکرێ چاوەڕێ بین هەمان ئەرستۆکراتە کۆنەکان.. یان رکێفکەرانی پێشووی بازرگانی و پیشەسازی کە بە شێوازەکانی حسابکردنی عەقلانیانەوە بە بار هاتوون، نهێنی دەستکاری رەمزەکانیش بەدەست بێنن.. ئەوان پێویستیان بە یەکگرتنە لەگەڵ جۆرێکی تازەی رابەردا. و ئەم رابەر و رابەرە تازانە دەبێت لە هەمان کونج و کەلەبەری کۆمەڵگاوە بێنە دەرێ کە تەنانەت لە ڕۆژگارە ئاساییەکانیشدا دیدی ناعەقلانی بەسەریاندا زاڵە و وێنای ئاڵۆز و پەرشوبلاوی نەبوونی زەمانەت لە ناویاندا لە هەموو شتێکی دی توندتر و درێژخایەنترە. کەوابوو دەبێت خودی رابەریش هەمان ئەو هەڵچوون و داچوونەی سۆزداریەی ئەزموون کردبێت کە رەهەندی هاوبەشی هەموو ئەو کەسانەیە کە کۆت و بەندەکانی دارمانی چەند بەشێکی کۆمەڵگایان هەست پێکردووە".

رابەرانی فاشیست بە ئەزمونێکی راستەوخۆ فێر بووبوون کە چۆن گەمە بە پەشێوی سەرتاپاگیری هاولاتیانیان بکەن. بەلام لە هەمانکاتدا ناچاربوون هێزەکانی خۆیان بۆ حسابکردنی عەقلانیش پەروەردە بکەن و کەسانێك کە خاوەن توانایەکی وابوون لە بەرزترین ئاستدا، بۆ لای خۆیان راکێشن. مانهایم تەنها پڕۆژەی گشتی یەکگرتنی ئەم هاودەستە ناچونیەك و شاراوەیەی پشت دەمامکی فاشیزمی وێنەکرد و شیکردنەوە دەرونی و کۆمەلایەتیەکەی خۆی کورتکردەوە بۆ هێڵە هەمەکی و پەراوێزیەکانی ئایدیالی نمونەیی *ideal type*. وردەکاریەکانی ئەم پڕۆژە گشتیە دەبوو لەلایەن جۆرێکی تری بیریار، لەسەری بڕوا و وردەکاریەکان ببینێ و باوەڕی بەوە بێت کە تەنها کاتێك شیکردنەوەی دیاردەی فاشیزم هەقی خۆی وەردەگرێت کە بە لێکۆڵینەوەی سەرتاپاگیری ئەزمونی دەوڵەمەند بکرێت.

مانهایم 11 ساڵ لە بۆرگێسێ بچوکتر بوو، بەلام لە ڕووی ئەزمونی مێژووییەوە بە هاو نەوەی ئەو دەژمێررا. هەردوکیان بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم گەیشتبونە کەماڵی فکری و وەك پەروەردەکراوەکانی پێش جەنگ، سودیان لە هەستی زەمانەتی ئابوری و رێزی کۆمەلایەتی وەرگرتبوو. جیاوازی تەمەنی مانهایم و ئەریك فرۆم کەمتر بوو بەلام لەگەڵ ئەمەشدا لە ڕووی دەرونیەوە ماوەی دەخستە نێوان ئەو دوانەوە. فرۆم لە 1900دا هاتبووە دنیاوە و سەر بە نەوەیەك بوو کە تاکەکانی لەسەردەمی جەنگدا هەرزەکاریان بەسەر بردبوو، وە پاشان لە ساڵە پڕ پێچوپەناکانی دەیەی 1920دا بەرخوردی فکری چارەنوسسازیان توشبوو بوو.

فرۆم دەرونشیکاری خوێند، بەلام کەم کەم بە جۆرێك گۆڕا کە لەفرۆید دورکەوتەوە، هەم پێش کۆچکردن بۆ ئەمەریکا لە 1934دا و هەم پاش ئەو، لەگەڵ هیگلیەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرتدا، هاوکاری هەبوو. بەلام پاشان لەوانیش جیابۆوە لەبەرئەوە کاتێك دوای حەوت ساڵ دەستیکرد بە بلاوکردنەوەی یەکەم کتێبی خۆی بە ئینگلیزی (بەناوی) "راکردن لە ئازادی"، پێشتر تێکەڵەیەکی بە سەلیقەی تایبەتی خۆی لە فرۆیدیزمی چاکسازیکراو و مارکسیزمێکی تەنك دروستکردبوو

کە لە ئەمەریکای وڵاتی تازەیدا زۆر جێیگرت. "ڕاکردن لە ئازادی" وەك "جالوت"ی بۆرگێسیێ ڕەوان و خۆشخوێن و گونجاوی سروشتی خوێندەوارە ناپسپۆڕەکان بوو. ڕەهەندێکی هاوبەشیشی لەگەڵ کارەکانی مانهایمدا هەبوو کە وەك نوسەرە ئەڵمانیەکان خاوەن ژێر خانێکی تیورەی کۆمەڵایەتی و دەروونناسی بوو.

فرۆم لە ڕونکردنەوە دەروونناسیەکان بە تەنیا ڕازی نەبوو، هەروەها نەیدەویست هیچ جۆرە نەخشەیەکی سەرەتایی مارکسیزم قبوڵبکات و لێرەوە هەوڵیدا بناغە و ڕەگەزەکانی هەردووکیان لە هەڵسەنگاندنێکی مێژوویی درێژخایەندا بۆ هۆکانی قبوڵکردنی فاشیزم، کۆبکاتەوە، ئەو ئەزمونەی لە ئیتاڵیای فاشیزمەوە بەدەستهاتبوو، خستە لاوە و دەرکەوتە توند و تیژی نائارامیەکانی ئەمڕۆی لە قۆناغێکی مێژووی وڵاتەکەیدا (ئەڵمانیا) خستە بەرچاو. تازەترین خەسڵەتی کتێبەکەی فرۆم ئەو بڕوا سادە و جیاوازە لەگەڵ تەرتیبی زەمەنی ڕوداوەکاندا بوو کە سەردەمی چاکسازی دینی (ڕیفۆرم) لە ئەڵمانیادا هەر لە سەرەتاوە هەواڵی مێژووی کۆمەڵایەتی کۆماری ڤایمار و قۆناغی نازیزمی دەدا. بەڵگاندنەکەی فرۆم وابوو کە چ لە سەردەمی کۆن و چ لە سەدەی بیستدا، گۆڕانکاری لە ناکاوی ئابوری، بونیادی تەقلیدی کۆمەڵگای سەروژێر کردووە. لە هەریەك لەم دوو سەردەمەدا "هەستی بێتوانایی و تەنیایی تاکی گۆشەگیر زیادی کرد، "ئازادی" ئەو لە کۆت و بەندە کۆنەکان ئاشکراتربوو، وە تواناکانی بۆ خۆشنودی فەردی لە مەسەلە ئابورییەکاندا سنوردارتر بوو، وە ئەم لە بەرامبەر هێزە دێوئاساکاندا هەستی بە مەترسیکرد". چ لە سەدەی شانزەهەم و چ لە سەدەی بیستدا، دەرئەنجامی ئەم شتە "داواکردنی وەسواس ئامێزی یەقین" بوو، "ڕاکردنێك بوو لە پەشێوی" بۆ باوەشی ڕابەری مەزهەبی یان ئایدۆلۆژی، واتە لۆسەر یان هیتلەر.

فرۆم بڕوای وابوو ئەمجۆرە ڕاکردنە لە ئازادیە ڕوکەش و درۆزنانەیە، لە خەسڵەتەکانی چینی ناوەڕاستی خوارەوە بوو. "تەنیایی تاك و سەرکوتکردنی زیندوێتی و هەستی تێکەڵبوون لە تاکەکاندا.. لە بارەی ئەم چینەوە لە هەموو چینەکانی دی زیاتر ڕاست بووە". نازیزم توانی بەهۆی هەوڵی ویرانکارانەی تاکەکانی ئەم چینەوە، لای ئەم چینە قبوڵبکرێت و سودییان بۆ دژایەتی دوژمنان لێوەربگرێت. چونکە تاکی ئاسایی چینی ناوەڕاستی خواروو، هەلومەرجی خۆی دەرك نەدەکرد و بڕوای وابوو سەرچاوەی کێشەکانی دەگەڕێتەوە بۆ شکست و شەرمەزاری وڵاتەکەی، نەك بۆ ئەوەی خۆی لە بواری ئابوریدا لەسەردەم دواکەوتووە و بەجێماوە و تێنەدەگەیشت کە حکومەتەکەی هیتلەر چەند لە ڕووی مانەوەی کۆمەڵایەتیەوە، زیانبەخشە. بە کورتی ئاوەها کەسێك دەرکەوتی کلاسیکی شتێك بوو کە مارکس ناوی نابوو "هوشیاری درۆزنانە".

بەمشێوەیە هۆکار و ڕوونکردنەوەکانی فرۆمیش وەك مانهایم باسی ناکۆکی نێوان ئایدۆلۆژیا و واقعی ئابوری لە بزوتنەوە فاشیستیەکاندا دەکرد. دیارە فرۆم جیهانی سۆزداری چینی ناوەڕاستی خوارەوەی وردتر لە بۆرگێسیێ و مانهایم وێنە دەکێشا. وەك ئەو دوانە بڕوای وابوو نهێنی سەرکەوتنی فاشیزم دەگەڕێتەوە بۆ دنیایی ناسکی تاکی ئاسایی و بێ توانای کۆمەڵگا و لێرەوە دەیزانی کە مەسەلەکە هەر کورت نابێتەوە بۆ ئەمە. بەڵام نوسینەوەی درێژەی چیرۆکەکە پێویستی بە ئاگاداری لە وردەکاری

روداوەکان و پسپۆڕییەك لە ئابوریدا هەبوو کە فرۆم خاوەنی نەبوو. بابەتەکانی "راکردن لە ئازادی" پەرشوبڵاو و ئاوازەکەی ئامۆژگاریکارانە بوو. کتێبەکە پڕ بوو لە روونکردنەوەی سادەی دەرونشیکاریانە و پاش چەند ساڵ چیدی وەك سەرەتا کە سەرنجەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، کاری لە خوێنەران نەدەکرد. ئەندێشەکانی دوایی پیشانیاندا کە فرۆم بە بەراورد بە قۆناغە جیاوازەکانی مێژوودا، زیادەڕەوی کردووە و ئەو پێکهاتەیەی کە بە مەبەستی دەستنیشانکردنی هۆکارەکان دروستیکردووە، زۆر سادەیە.

## سەرچاوە

بەشێکە لە فەسڵی سێهەمی کتێبی (ستیوارت هیوز: هجرت اندیشه اجتماعی. ت: عزت الله فولادوند. چاپ اول.. تهران.. طرح نو 1376).

# پۆل ریكۆر

هاشم سالح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**بەرایی:**

لەئێستادا "پۆل ریكۆر" بەپیری فەیلەسوفە هاوچەرخەكانی فەرەنسا دادەنرێت. ئەم پیاوە تەمەنی لەهەشتاو چوار ساڵ بەرەو سەرەو تا ئێستاش چالاكەو لەكایەی فیكری فەرەنسی و ئەوروپی و نێو دەولەتیدا ئامادەگی هەیە.

فەرەنسییەكان پاش ئەوەی بۆ ماوەیەكی زۆر پشتگوێیان خست، بەهۆی خەریكبوونیان بەرێبەرانی بونیادگەری، وەك: "كلۆد لێڤی شتراوس، میشێل فۆكۆ، ژاك دێریدا.. هتد"، ئێستا سەر لەنوێ گرنگی پێدەدەن و لەم ماوەیەی دوایدا چەندین كتێبی خۆی و كتێبگەلێك كە لەسەر ئەو نوسراون بلاوكراونەتەوە. هەروەها چەندین گفتوگۆی دوورودرێژی لەگەڵدا سازكراوەو چەند تەوەرێكیشی لەگۆڤارە تایبەتەكاندا بۆ تەرخان كراوە.

## "پۆل ریكۆر" كێیەو تایبەتمەندییەكانی چین؟

"پۆل ریكۆر" ساڵی *1913* لەفەرەنسا هاتۆتە دنیاوەو پاش هاتنە دنیاشی دایكی كۆچی دوایی كردووە. ساڵی *1915*و لەجەنگی جیهانی یەكەم دژ بەئەڵەمانەكان باوكیشی كوژراوەو لەوكاتەدا "ریكۆر" تەمەنی تەنها دوو ساڵان بوو. بەمجۆرە ئەركی بەخێوكردنی دەكەوێتە ئەستۆی باپیرەو داپیرەی و خوشكە گەورەكەی و پوری. ئەمە وایلێكرد هەر لەسەرەتاوە هەست بەتەنهایی بكات.

ئەگەرچی "ریكۆر" خوێندكارێكی هاروهاج و سەربەگۆبەن بوو لەقۆناغی سەرەتاییدا، بەلام حەزێكی زۆری لەخوێندنەوە بوو. لەو قۆناغەدا دەستی كرد بەخوێندنەوەی نوسینی نوسەرە مەزنەكانی وەك: "رابیلیێ و مۆنتاین و پاسكاڵ". هەروەها كەوتە خوێندنەوەی رۆمانەكانی "فلۆپێرو ستاندال و تۆلستۆی". بەلام ئەوەی دواتر لەرووی فەلسەفیەوە كاریگەری زۆری لەسەر بەجێهێشت "دێستەڤیسكی" بوو. "ریكۆر" لەشوێنێكدا دەڵێت: (رۆمانی تاوان و سزا بیركردنەوەی فەلسەفیمی دەربارەی خراپەكاری لەجیهاندا یەكلایكردەوە). یەكەمین رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆی لەگەڵ زوڵم و خراپەكاریدا لەساڵی *1923-1924* دابوو، ئەو دەمە تەمەنی لەیانزە ساڵێك زیاتر نەبوو. ئەوە

لەسەروەختی ئەو سکاندالە بەناوبانگە دابوو کە لە ئەمریکا، لە دوو کرێکاری کۆچبەری ئیتالی روویداو بەتاوانێك تاوانبارکران کەنەیانکردبوو، لەپای ئەوەدا سالی 1927 بریاری لەسێدارەدانیان بۆ دەرچوو. ئەمەش لەپێناو رازیکردنی رای گشتی ئەمریکیدابوو کە ئەو کات لەدژی بیانیەکان تاوی سەندبوو. لەراستیدا ئەو دوو کرێکارە بوونە قوربانی ئەو شەپۆلی دژە بیانیەی لەئارادە بوو، ئەگەرنا هیچ تاوانێکیان نەبوو.

سەبارەت بەم رووداوە "پۆل ریکۆر" دەلێت: (زۆر لەم رووداوە تورە بووم، ئەم زولمە ناڕەوایە هەستی ئەوەی دامێ کەخراپەکاری لەدنیادا هەیەو هەستم بەگوناه کردو پێموابوو ئەوەی روویدا من لێی بەرپرسیارم). وەك دەبینین "ریکۆر" هەر لەسەرەتاوە، چاوی بەرووداوە تراژیدیەکان هەلهێناوە. تراژیدیای ژیانی کەسێتی خۆی‌و تراژیدیای ژیانی گشتیش لەدەوروبەریدا.

لێرەوە بۆی ئاشکرا بوو کە شەڕو خراپەکاری هەیەو لەسەروو خواست‌و ئیرادەی ئێمەوەیە. بەکورتیەکەی شەڕو خراپە کێشەیەکی بابەتییە، لەبەرئەوەش دواتر یەکێك لەکتێبە سەرەکییەکانی خۆی بۆ ئەم مەسەلەیە تەرخان دەکات، بەناوی (هێماگەری شەڕ). کاتێك سەدەی بیستەمیش بەو هەموو جەنگ‌و تاوان‌و دزێویەوە دەستی پێکرد، "ریکۆر" زیاتر هەستی بەگرنگی شەڕو خراپەکاری کرد لەجیهان‌و مێژوودا. مێژوو سەرتاپای کامەرانی‌و دەسکەوتی ئیجابی‌و پێشکەوتن نییە، بەلکو هاوکات تراژیدی‌و ترسناك‌و مالوێرانیەو پێویستە هەردوو روەکەی ببینین.

بەلام لێرەدا دەبێت باس لەوەش بکەین کە ئەو شەڕو خراپەکاریانەی "ریکۆر" لەژیانی خۆیداو لەژیانی گشتیشدا رووبەڕووی بووەوە، نەبووە مایەی ئەوەی لەژیان نائومێد بێت یاخود رق لەژیان هەلگرێت. رەنگە ئەو باوەڕە ئاینیەی کە هەیبوو یارمەتیدەری بووێت، تاڕووبەڕووی ئەو نەهامەتیانە بێتەوەو دواجاریش بەسەریاندا زال بێت.

ئەو پێیوایە خێرو چاکە لەپێش شەڕو خراپەوەیەو یەزدان بۆ خۆی خێرو چاکەیەو بونی خراپەو زلم‌و زۆریش لەدنیادا، نابێت رێگری ئەوەمان لێبکات کەتێکەل بەدنیا ببینین‌و هەولی گۆڕینی شتەکان بەرەو باشتر بدەین. چونکە ئەمە کارێکە دەکرێت، بەپێچەوانەی ئەوەی نهلیزم‌و ئانارشیست‌و پوچگەراکان باسی دەکەن. کەواتە نابێت بەبیانوی ئەوەی شەڕو خراپە هەبووەو هەر دەشمێنێت، دەستەوستان بین لەئاستیدا، بەلکو دەبێت هەولی سنوردارکردن‌و کەمکردنەوەی بدەین لەجیهاندا.

تایبەتمەندی دیارو بەرچاوی "پۆل ریکۆر" ئالێرەدایە، چونکە ئەو یەکێکە لەو فەیلەسوفە دەگمەنانەی بێ هیچ ترس‌و شەرمێك باس لەئیمانداری خۆی دەکات. وەکو دەزانین ئاقاری پۆزەتفستی یاخود بێ بڕوایی لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە، دەسەلاتێکی بالای بەسەر فەیلەسوفانی ئەوروپادا هەبوو. هەر لەبەر ئەمەبوو "سارتەر" تاوانباری دەکرد بەوەی (قەشەیەکەو دەم لەفەلسەفە دەدات)، بەلام ئەم گالتە پێکردنە کۆلی پێنەدا لەوەی بەردەوام بێت لەسەر رێچکای خۆیی‌و بەردەوام دوانەی زانست‌و ئیمان یان فەلسەفەو ئایین پێکەوە کۆبکاتەوە. مامۆستای یەکەمینیشی لەم بوارەدا "گابرێل مارسێل"ی رابەری بونخوازی ئیمانداری فەرەنسی بوو، ئەمەش پێچەوانەی "ژان پۆل سارتەر" بوو کە ڕابەرایەتی ئاقاری بێ باوەڕی لەفەلسەفەی وجودیدا دەکرد.

ئێمەی رۆشنبیرانی عەرەب پێمان وایە تەواوی فەلسەفەی هاوچەرخی ئەوروپی بێ باوەڕییەو، بگرە پێمان سەیرە كەسێك هەبێت لەیەك كاتدا فەیلەسوف و ئیمانداریش بێت. پێویستە بڵێم ئەمە وێنەیەكی شێواو نامێژووییە، دەربارەی مۆدێرنەی ئەوروپی. چونكە رۆژێك لەرۆژان ئاقاری ئیمانداری لەوێدا نەمردووە، ئەگەرچی لەسەدەی نۆزدەوە گرنگی كەم بۆتەوەو دابڕانێك لەنێوان زانست و ئاییندا دروست بووە.

لەئەوروپادا فەیلەسوفی ئیمانداری گەورە هەیە، لەوانە: "كارل یاسبەرز- كە یەكێكە لە سەرچاوەكانی ریكۆر- و گابرێل مارسێل و بیرگسۆن و.. هتد". "گابرێل مارسیل" لەماڵەكەیدا ساڵۆنێكی بۆ فەلسەفەو قسەكردن لەفەلسەفە كردبووەوەو هەموو رۆژێكی هەینی ژمارەیەك خوێندكاری فەلسەفەی زانكۆو هەندێك كەسایەتی بەتەمەن گەورەتر لەوان، ئامادەی دەبوون.

"ژان پۆڵ سارتەر" و"مێشێل پۆتۆر"ی نوسەر ئامادەی هەندێك لەو دانیشتنانە دەبوون. كاتێك "پۆل ریكۆر" ئاشنایەتی لەگەڵ "گابرێل مارسێل"دا پەیدا كرد، سەرسام بوو بەكارەكتەرو شێوازی پرسیاركردنی فەلسەفی بەشێوەی "سوكرات". فەلسەفەی زانكۆ لەو سەردەمو زەمانەدا رۆچوبووە ناو شتە ئەبستراكت و تیۆریزەی دوور لەواقیع و كێشە عەمەلیە واقیعی و بەرچاوەكانی فەرامۆش كردبوو.

هەرچی "گابرێل مارسێل"ە، ئەوا لەدانیشتنەكانیدا رێگەی نەدەدا بەمشتومڕكردن لەسەر كێشە ئەبستراكتەكان و بەڵگە هێنانەوە بە "كانت و دیكارت"، بەڵكو بەئامادەبووانی دەوت: (لەئەزمونی تایبەتی خۆتانەوە فەلسەفەكاری بكەن، نەك لەوەی لە ناو كتێبەكانەوە وەرتانگرتووە). پاش ئەوە "ریكۆر" ئاشنایەتی لەگەڵ فەلسەفەی فینۆمینۆلۆژیادا پەیدا كرد، ئەو فەلسەفەیەی لەچاودێریكردنی خودی شت و دیاردەكان خۆیانەوە دەست پێدەكات، نەك لەئەبستراكت و قسەی بەتاڵەوە. لێرەوە فەلسەفەی بوون یان فەلسەفەی بونخوازی: واتە ئەو فەلسەفەیەی لەكێشە واقیعیەكانی بوون دەدوێت و خۆی بەشتە ئەبستراكت و دوور لەواقیعەكانەوە خەریك ناكات. هەر لەبەرئەم هۆیەش بوو لەناوەڕاستی سەدەی رابردوودا، "سارتەر" بەسەر ئەو فەلسەفەیەدا زاڵبوو كە لەسۆربۆندا باڵا دەست بوو. تەنانەت بونخوازی بوو بەمۆدێك تا ئەو دەمەی مۆدی بونیادگەری هاتە ئاراو لەسەر تەختی فەلسەفە هێنایە خوارێ.

## "پۆل ریكۆر" و "كارل ماركس"

پاش ئاشنابوونی بەفەلسەفەی فینۆمینۆلۆژیا، "ریكۆر" پەیوەندی كرد بەئاقاری (كەساندنی مەسیحی- *Personalizd*) كە "ئیمانوێل مۆنێ" رێبەرایەتی دەكرد، بەڵام تاكە جیاوازییەك كە لەنێوان ئەمو فەیلەسوفە ئیماندارەكانی تردا هەبوو، ئەوە بوو كە "ریكۆر" چەپڕەوێكی خوێن گەرم بوو. داخۆ بڵێی ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە بەڕەچەڵەك پرۆتستانتی بووە؟ یاخود هەستێكی زۆری هەبوو بەبوونی زوڵمو خراپەكاری لەجیهاندا؟ رەنگە پەیوەندی بەهەردووكیانەوە هەبێت. سەرەڕای ئەوەش هەر لەسەرەتاوە لەژێر كاریگەری فیكری "ماركس"دا بوو. "ریكۆر" ئەگەرچی خاوەن بیروباوەڕێكی دینی بوو، بەڵام ئەمە رێگر نەبوو لەوەی بەسەر ماركسیزمدا بكرێتەوە.

ساڵی *1938* "ریكۆر" وتارێكی لەژێر سەردێڕی (پێویستی ماركس)دا نوسی، تیایدا جیاكاریەك

لەنێوان مارکسیزمی دۆگماتیستو مارکسیزمی ڕەخنەیدا دەکات. یەکەمیان پێیوایە گەشتۆتە چارەسەری کۆتاییو کلیلی تەفسیرکردنی جیهانی لەمستایە, بەڵام دووەمیان دان بەفیکرێکی دیکەی غەیرە مارکسیدا دەنێتو ئیعتراف بەڕەوایەتی بوونی دەکات.

"ریکۆر" پێیوایە مارکسیزمی ڕەخنەیی سەرلەبەر لەفەلسەفەی ئایدیالیستی رزگارمان دەکات. هاوکات رێ لەبەخوا کردنی مرۆڤ دەگرێتو بەسەر دیدگایەکی رێژەگەرایدا دەکرێتەوە کە بەداخەوە "مارکس" بەهۆی پێداگرتنی زۆری لەسەر هێزی بەرهەمهێنان یاخود ژێرخان, ئافەرۆزی کردبوو. لاوازی "مارکس" لەوەدایە کەجگە لەهۆکارە مادیو ئابوریەکان, تەواوی هۆکارەکانی تری فەرامۆشکردبوو. بەڵام "ریکۆر" تەنانەت لەرەخنەکردنی ئایین لەلایەن "مارکس"ەوە شتی ئیجابی دەبینێت, چونکە مەسیحیەت لەپرانسیپە سەرەکیو جەوهەریەکانی ئینجیل لایدابوو. بەم پێیە ڕەخنەکانی "مارکس" لەئایین سەرەڕای ئەوەی ڕەخنە گەلێکی رادیکالیش بوون, بەڵام ڕەخنەیەکی ئازادیخوازانە بوو.

"مارکس" توانی لەفەلسەفەی روحانی ئایدیالیستی رزگارمان بکات, ئەو فەلسەفەیەی پێیوابوو مرۆڤ لەسەرو هەموو مەرجێکی مادیو ئابورییەوەیە. ئەمەش بۆچونێکی ئایدیالیستی ئەبستراکتەو لەبەردەم تاقیکردنەوەدا خۆی بۆ راناگیریت. رۆحانیەتێکی ئایدیالیستی لەمجۆرە, بەختەوەرییەکی وەهمی دروستکردبوو, بۆ دڵخۆشی دانەوەی ئەو مرۆڤانەی هەژاربوونو هەلومەرجێکی مادی ناهەمواریان هەبوو, تەنانەت هانیان دەدات بۆ ئەوەی بەچارەنوسی خۆیان رازی بنو گلەیی لەبەختی خۆیان نەکەن. بەمجۆرە ئایین بوو بە جۆرێك لە (ئەفیونی گەلان) وەکو "مارکس" خۆی دەیوت.

"پۆل ریکۆر" ئەگەرچی کەسێکی ئیماندار بوو, بەڵام بۆ ساتێك دوودڵ نەبوو لەوەی بداتە پاڵ ئەم دیدگا ڕەخنەییەی "مارکس"و تەنانەت پێیوابوو, کڵێسای مەسیحی دەستی لەهەڵایسانی جەنگی ناوخۆی ئیسپانیادا هەیە, بەهەموو خراپیو دزێوییەکانەوە. "ریکۆر" دەیوت: (فێندەمێنتالیزمی مەسیحی بەردەوام لەبەرەی رژێمە موحافیزکارو سەرکوتکارە کاندابووە, بەتایبەتی لەسایەی ئەو رژێمانەدا کە مەسیحیەت تیایاندا ئایینی رەسمی دەوڵەت بووە).

لەلایەکی ترەوە "ریکۆر" دۆگماتیستی "مارکس" دەگێڕێتەوە بۆ دۆگماتیستی "هیگڵ"ی گەورە مامۆستای, چونکە ئەوە "هیگڵ" بوو کە رژێمی فەلسەفەی کۆتایی پێهێناو وتی: (هەرچی واقیعە ئەقڵانیە)و راشیگەیاند کە دەکرێت بگەینە مەعریفەیەکی رەهاو یەکجارەکی. بەڵام ئێمە ئەوە دەزانین کەنابێت مەعریفەی مرۆڤ رەهاو داخراو بێت, بەڵکو پێویستە بەردەوام کراوەبێت بۆ کەشفکردنو دۆزینەوەی شتی نوێ. لەبەرئەمە "ریکۆر" بەناوی مارکسیزمی ڕەخنەییەوە, داوای دژایەتیکردنی مارکسیزمی دۆگماتیستی دەکرد.

### "پۆل ریکۆر"و "ژان پۆل سارتەر"

لەپاش دووەم جەنگی جیهانی ئەوەی لەکایەی رۆشنبیری فەرەنسیدا ئەستێرەی بەختی لەدرەوشانەوەدا بوو, "ژان پۆل سارتەر" بوو. سەرەوەختێك لێکچەرە بەناوبانگەکەی (بونخوازی فەلسەفەیەکی مرۆگەرییە) پێشکەش کرد, هۆڵەکە پری بوو لەخەڵكو ئەوانەی بەپێوە وەستابوون ژمارەیان زۆر لەوانە زیاتر بوو کەدانیشتبوون.

بەمجۆرە فەلسەفەی بونگەرایی وەکو فەلسەفەیەکی ئازادیخوازیو شێوازێکی ژیان لەدایکبوو, تەنانەت بووە مۆدەیەکی باوو گازینۆکانی (سان ژێرمان دی بری) گرتەوە.

بونگەرایی سەرکەوتوو کۆنترۆڵی کایەکەی کرد, لەبەرئەوەی خەڵکی چاوەڕێیان دەکردو لەوکاتەشدا وەڵامێك بوو بە خواستو ویستەکانی خەڵکی.

لەڕاستیدا بۆچوونی "سارتەر" سەبارەت بەئازادی, لەگەڵ ئەو کەشوهەوا ئازادو پڕ خۆشیەی لەوکاتەدا لە فەرەنسادا هەبوو (واتە ساتەوەختی رزگاری فەرەنسا لەدەست ئەڵەمانەکان, پاش ماوەیەکی زۆر لە ژێر دەستیو سەر شۆڕیو نەهامەتی), کۆكو گونجاو بوو. تایبەتمەندی "سارتەر" لەوەدا بوو کەتێکەڵیەکی لەفەلسەفەی فینۆمینۆلۆژی "هۆسێرل"و فەلسەفەی ئۆنتۆلۆژی "مارتن هایدگەر" پێشکەشکردو سەرەنجامیش کتێبە بەناوبانگەکەی (بوونو نەبوون)ی لێهاتە بەرهەم.

"سارتەر" خۆی پێیوابوو فەلسەفەی بونگەرایی دەبێت بەدوو بەشەوە: بونگەرایی مەسیحی کە نوێنەرەکانی بریتین لە: "گابرێل مارسێلو کارل یاسبەرز", لەگەڵ بونگەرایی بێ باوەڕدا کەنوێنەرەکانی بریتین لە "مارتن هایدگەر"و "سارتەر" خۆیو چەند فەیلەسوفێکی تری فەرەنسایی.

"سارتەر" لەلێکچەرە بەناوبانگەکەیدا باسی لە (نەبونی خوا کرد), ئەمەش "پۆل ریکۆر"ی نیگەران کردو بووە مایەی ئەوەی لێی نزیك نەبێتەوە. بێ باوەڕی رادیکالانەی "سارتەر" توشی شۆکی دەکرد, لەبەرئەوەی "سارتەر" پێیوابوو ئەوە بەڵگەنەویستێکی فەلسەفیەو مشتومڕ هەڵناگرێت, بەڵام "ریکۆر" پێی وابوو مەسەلەیەکی وا مشتومڕ هەڵدەگرێتو نابێت بەو ئاسایییەو زووبەزوو یەکلایی بکرێتەوە.

هاوکات "ریکۆر" دژ بەو عەدەمیەتەی "ژان پۆل سارتەر" بوو کەدەیوت: (مادامەکی دواجار دەمرینو لەناو دەچین کەواتە هیچ شتێك مانا نییە. سەرەتاو کۆتایی هەر عەدەمەو ئەمەش تاکە حەقیقەتێکە کەهیچ حەقیقەتێك سەرووی ناکەوێت). سەرەڕای ئەمانەش "ریکۆر" دژ بەو فەردگەراییەی "سارتەر" بوو کە زیادەڕۆیی تێدا بوو, بەتایبەت لەدەستەواژە بەناوبانگەکەیدا (دۆزەخ ئەوانی ترن) تەعبیری لێدەکات. ئەمە لەکاتێکدا "ریکۆر" حەزی بەپەیوەندی ئینسانی دەکردو پێیوابوو ژیان لەڕێی پەیوەندیبەستن لەگەڵ ئەوانی تردا مانای دەبێت.

لەبەرئەم هۆیانە "پۆل ریکۆر" نەبوو بە سارتەری یاخود بە وجودی, سەرەڕای ئەوەی بەبەهرەو لێهاتویی "سارتەر" سەرسام بوو کە لەبوارەکانی (شانۆو رۆمانو رەخنەی ئەدەبیو فەلسەفەو... هتد), شوێن دەستی دیار بوو. سەرەکیترین پرسیارێك کە لەوکاتەدا "پۆل ریکۆر" بەبەردەوامی لەخۆیی دەکرد, ئەوە بوو: چۆن بتوانین دیالۆگێك لەنێوان فەلسەفەی بونگەراییو ئیمانی مەسیحیدا دروست بکەین؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە "ریکۆر" دەستی کرد بەدروستکردنی جیاکاریەکی سەرەکی لەنێوان ئیمانو ئاییندا. بەڵام خەڵکی بەردەوام ئەم دوو چەمکە تێکەڵ بەیەك دەکەن, ئەم تێکەڵکردنەش هۆکاری ئەو کیشەو بەدحاڵی بوونە مێژووییەیە کە لە نێوان فەلسەفەو ئیماندا هەیە.

بەبۆچونی "ریکۆر" ئیمان ئایین نییە, یاخود دەتوانین بڵێین ئیمان لەئاینێکی دیاریکراودا کورت ناکرێتەوە, بەڵکو دەچێتە ناو هەموو ئایینەکانەوەو

بەجێشیان دێڵێت. هاوكات زۆر جار پیاوانی ئایینی بەناوی ئایینەوە كەوتونەتە سەركوتكردنی ئیمان و فیكر! لەم بارەیەوە "پۆل ریكۆر" دەڵێت: (سەرجەمی مێژووی فەلسەفە بریتییە لە، بەگژداچونەوەی ئەو دامودەزگا ئسوڵیانەی زانایان و فەیلەسوفان تەكفیر دەكەن و تەنانەت هەندێك جار كار دەگاتە سەر كوشتن و سوتاندنیشیان). بۆ سەلماندنی ئەم قسانەش نمونە بەوە دەهێنێتەوە كە "گالیلۆ و سپینۆزا و سێرڤیێ" چیان بەسەرهات.

یەكەمیان كاتۆلیكەكان تاوانباریان كردو دووەم یەهودییەكان تەكفیریان كردو حاشایان لێكرد، سێهەمیشیان پرۆتستانتەكان سوتاندیان.. ئەوەی فیكری فەلسەفی دژایەتی دەكات، ئەم مەیلە سەركوتكارییەیەكە لای فێندەمێنتالیستە یەهودی و مەسیحیەكان هەیە. ناكرێت لەتەواوی مێژووی فیكر بگەین، ئەگەر ئەم مەسەلەیە لەبەرچاو نەگرین. لەبەرئەوەی كۆی ئەو مێژووە بریتیە لە ململانێی نێوان فیكری فەلسەفی و فیكری ئایینی دۆگماتیستی. بەڵام ئەگەری ئەوەش هەیە فەلسەفەش وەرگۆڕێت بۆ سستمێكی كلۆمدراو و دۆگما، ئەگەر خولیای رەخنەگرتنمان نەماو بە وەڵامە ئامادەو حازر بەدەستەكان رازی بووین.

لێرەوە پێویستە تیۆلۆژیا و فەلسەفە پێكەوە لەچنگی ئەو مەیلە دۆگماییە دەربهێنین كە مرۆڤ بەخۆڕسك حەزی پێیەتی، ئەو كات دەتوانین دیالۆگێك لەنێوان فەلسەفەو ئاییندا دروست بكەین.

## "پۆل ریكۆر" و بونیادگەریی

لە سەرەتای ساڵی *1963* و تەنانەت پێشتریش، بونگەرایی "سارتەر" دەستی بەپاشەكشە كردو بونیادگەری جێگای گرتەوە. بەمجۆرە بونیادگەری هەژمونی خۆی بەسەر تەواوی بوارە مەعریفیەكاندا، واتە بەسەر فەلسەفەو زانستە مرۆڤایەتیەكاندا سەپاند. بابزانین هەڵوێستی "ریكۆر" لەم فەلسەفە نوێیە چی بووە؟

هەڵبەتە "ریكۆر" لەوانەیە كەحەزی بەململانێ نییەو ئەوەی بەچاكتری دەزانێت، بیركردنەوەیە بەشێوەیەكی هێمن و كۆنكرێتی و خۆپاراستن لەهاشوهوشی دروشمبازی و ئەو مۆدانەی ناو بەناو شاری پاریس دەگرێتەوە. چونكە ئەو شتانەی مۆدن دێن و دەڕۆن، بەڵام فیكر دەمێنێتەوە.

بەمجۆرە دەبینین پاش پۆزەتیڤیزم فینۆمینۆلۆژیا دێت و دوای فینۆمینۆلۆژیا بونگەرایی و پاشان ماركسیزم و بونیادگەری و.. هتد. ئێستاش پێدەنێتە قۆناغێكی تازەترەوە، قۆناغی پۆست- بونیادگەریی. چەند ساڵێك بەر لە ئێستا كێ لەو باوەڕەدا بوو كە بونیادگەریی پاشەكشە بكات و رەونەقی نەمێنێت؟ ئێمەی خوێندكارانی عەرەب كەلەو قۆناغەدا چوینە فەرەنسا، پێمان وابوو بونیادگەری راستیەكی حاشا هەڵنەگرەو مشتومڕ هەڵناگرێت. پێمانوابوو بونیادگەری ئەو كلیلە ئەفسوناوییەیە كەبەیەكجار تەواوی كێشەكان چارەسەر دەكات.

بەڵام لەپڕێكداو بەچاوی خۆمان مەرگ و كەناركەوتنی بونیادگەریمان بینی. دەبێت لەسەر وەختی باڵادەستی و رەواجی زۆری بونیادگەریدا، "پۆل ریكۆر" چ هەڵوێستێكی هەبوو بێت؟

"ریكۆر" گرنگی زۆری پێداو لەو دەسكەوتە ئیجابیانەش ئاگادار بوو كەبونیادگەریی لەگەڵ خۆیدا هێنابووی. بەڵام وەكو ئەوانەی شوێن مۆدو دیاردە تازەكان دەكەون، نەكەوتە ژێر كاریگەریی بونیادگەریی و ستایشكردنی.

لە سەرەتای شەستەكاندا بونیادگەریی رۆڵێكی گەورەی گێڕا، لەرزگاركردنی زانستە

مرۆڤایەتیەکان لەدەست ئەو ئاقارە کۆنسێرڤاتیڤەی لەسۆربۆندا لە ئارادا بوو. بەهاتنی بونیادگەری زۆرێك لەتوێژەران دەستبەرداری فەلسەفەبوون و کەوتنە لێکۆڵینەوەی یەکێك لە زانستە مرۆڤایەتییەکانی وەك: کۆمەڵناسی و رەگەزناسی و دەرونشیکاری و مێژوو.. هتد. ئەمە وایکرد "سارتەر" رەونەقی جارانی نەمێنێ و فەیلەسوفێکی تازە پێگەیشتوی وەك "میشێل فۆکۆ"، جێگای بگرێتەوە. دەبێت هەڵوێستی "ریکۆر" لەمە چی بووبێت؟

ئەو کوێرانە نەکەوتە پەسەندکردن یان رەتکردنەوەی بونیادگەری، بەڵکو وەکو فەیلەسوفێك کەوتە مشتومڕکردن لەگەڵیدا، بۆ ئەوەی فەلسەفەکەی بەمیتۆدو زاراوەی تازە دەوڵەمەندتر بکات. ئەمە وایکرد "ریکۆر" دوای مردنی بونیادگەریش زیندووبێت و لەگەڵ ئەودا سەرنەنێتەوە، وەکو لە فەیلەسوفەکانی تر روویدا. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو گرنگی دانەیە بە "ریکۆر" لەساتەوەختی ئێستادا.

سەبارەت بەبونیادگەریی، "ریکۆر" دەڵێت: (زانستە مرۆڤایەتیەکان لەسەردەمی بونیادگەریدا قەڵەمبازی مەعریفی گەورەی داو نابێت فەیلەسوف لەبەرامبەر ئەو گۆڕانانەدا دەستەوستان بێت. فەلسەفەی خودگەرایی یاخود بونخوازی کە لەپێشکەوتن و بەرەو پێشچونی زانست دابڕابێت، بەرەونەمان دەچێت یاخود دەبێت بەشیعرو ئەدەب. هاوکات فەلسەفەی بابەتگەرایی یاخود بونیادگەریی گەر لەبوون و کێشەکانی دوور کەوێتەوە، دواجار دەبێتە چەند هاوکێشەیەکی ماتماتیکی وشكوبرنگ). دواتر بونیادگەریی فۆرمالیستی چارەنوسی بەمە گەیشت.

پێویستە لەنێوان پرسیاری ژیان و پرسیاری فیکردا هەڵوێستێکی مامناوەند وەرگرین و بەلایەکیاندا داینەشکێنین. فەلسەفە بەو دیالۆگە دەژی کە لەنێوان پرسیاری زیندەگی و پرسیاری فیکردا هەیەو بەجیابونەوەشیان کۆتایی دێت. بەڵام بونیادگەرە سەرسەختەکانی وەك: "لوی ئالتۆسێرو کلۆد لیڤی شتراوس و رۆلان بارت و ژاك لاکان و میشێل فۆکۆو پییر بۆردیۆ"، لەم چارەسەرە مامناوەندیە رازی نەبوون کە "ریکۆر" دەیخواست. هەر لەبەرئەوەش هەوڵی کەنارگیرکردنیان داو لەوەشدا سەرکەوتوبوون.

لەوکاتەدا "ریکۆر" هەڵهات بەرەو ئەمریکا، تا لە زانکۆکانی ئەوێدا خەریکی وانە وتنەوەبێت و ماوەی بیست ساڵێك لەوێدا مایەوە، واتە تا ئەو کاتەی بونیادگەری پاشەکشەی کردو ئەو کاریگەرییەی جارانی نەما. بونیادگەراکان تاوانباریان دەکرد بەوەی کەسێکی رۆحانیە نەك زانستی و کەسی واش بەکەڵکی ئەم سەردەمە پێشکەوتووەی بونیادگەری نایەت! "ریکۆر" بەرلەوەی بەرەو ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەڕێ بکەوێت، دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخسا تا بکەوێتە جەنگێکی فیکری لەگەڵ "کلۆد لیڤی شتراوس"ی رابەری بونیادگەری فەرەنسی و بگرە جیهانیش. ئەم مشتومڕەش لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری "*ESPRIT*" دەستی پێکرد. ئەمە مشتومڕێکی فیکری بەناوبانگ بوو لەشەستەکاندا.

ئەگەرچی لەو سەردەم و زەمانەدا زەمینە بۆ بونیادگەراکان لەبارتر بوو، بەڵام "ریکۆر" لەو رووبەڕوو بونەوەدا شکستی هێنا. باbزانین ناوەڕۆکی ئەو دیالۆگە چی بووەو تەوەرە فیکرییە سەرەکیەکانی کامانە بوون؟

سەرەکیترین خاڵی ناکۆکی نێوانیان، لەسەر ئەو تێڕوانینە ساردو سڕەی میتۆدی بونیادگەری بوو. "کلۆد لیڤی شتراوس" لافی ئەوەی لێدەدا کە بەشێوەیەکی بابەتی تاوتوێی شتەکان دەکاتو ناهێڵێت مەسەلە زاتیەکانی خۆی تێکەڵ بە کارەکانی بن. کاری "شتراوس" لێکدانەوەو شرۆڤەکردنی چیرۆکو ئەفسانەی میللەتە سەرەتاییەکانە، وەك چۆن زانایەکی رووەکزانی باس لە گوڵێك دەکات. "شتراوس" کاتێك لەئەفسانەکان دەکۆڵێتەوە تەنها بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت کەبزانێت چۆن چۆنی لەڕەگەزە سەرەتاییەکانی دروست بووەو مانای بەلاوە گرنگ نییە، لەبەرئەوەی مانا شتێکی هولامیو نامادییەو ناچێتە ژێر باری لێکۆڵینەوەی زانستی.

لەوەڵامی ئەم بۆچونەدا، "ریکۆر" دەڵێت: (من لەمەبەستی تێدەگەمو دان بەوەشدا دەنێم کەبونیادگەری میتۆدێکی بەپێزە بۆ لێکۆڵینەوەی فۆرمالیستی لەئەفسانەو چامەی شیعریو بونیادی کۆمەڵایەتیو.. هتد، بەڵام لەوە تێناگەم بۆچی دەیەوێت مەسەلەی مانا لە لێکۆڵینەوەکانی بکاتە دەرێ. ئایا دەق بریتی نییە لەفۆرمو ناوەڕۆك؟ کەواتە بۆچی دەیەوێت لەفۆرم یاخود لەبونیادی پێکهاتەی دەق تێبگەین، بەڵام قەرەی ناوەڕۆكو ماناکەی نەکەوین؟).

لەبەرامبەردا "کلۆد لیڤی شتراوس"، "ریکۆر"ی بەوە تاوانبار کرد کە فەیلەسوفێکی خودگەرایە نەك فەیلەسوفێکی زانستی، "ریکۆر"یش بەوە وەڵامی دایەوە کە ئەویش فەیلەسوفێکی ساردوسڕەو لە زانستی بوونیدا زیادەڕۆیی دەکات. لە ڕاستیدا "شتراوس" دەیەوێت وەکو مارومێرو یان وەك شتەکانی تری ناو سروشت لەمرۆڤ بکۆڵێتەوەو هیچ جۆرە حسابێك بۆ خەسڵەتە رۆحیو مەعنەویەکانی یان بۆ دەسکەوتو بەرهەمەکانی ناکات. ئەمەش خاڵی ناکۆکی سەرەکی نێوان رابەری بونیادگەریو "پۆل ریکۆر"ە.

گەر زیاتریش بڵێین: "شتراوس" کەسێکە ئێجگار رەشبینە بەرامبەر بەمرۆڤو سروشتو لەمەشدا بە "میشێل فۆکۆ" دەچێت کە لە کۆتایی کتێبە بەناوبانگەکەیدا (وشەکانو شتەکان)، (مەرگی مرۆڤی) راگەیاند. "شتراوس" زیاد لەجارێك باسی لەوە کردووە کەئەوەی ئەو دەیەوێت پێکەوەنانی مرۆڤ نییە، بەڵکو لێکشیتاڵکردنو لەناوبردنیەتی! عەدەمیەتی "شتراوسو فۆکۆو.. هتد"، لێرەدایە. چونکە ئەوان هیچ بڕواو متمانەیەکیان بەمرۆڤ نەماوە، پاش ئەو هەموو جەنگو کارەساتانەی لەناوخۆو دەرەوەی کیشوەری ئەوروپادا روویاندا.

لەبەرئەوە "شتراوس"و "فۆکۆ" تاوانبارکران بەوەی رێبەرانی ئاقاری ئەنتی- هیومانیزم دەکەن، لەفەلسەفەی هاوچەرخی فەرەنسیدا. پاش ئەو هەموو کارەساتوماڵوێرانییەی لەسەدەی بیستەمدا روویدا، متمانەکردن بەمرۆڤی خۆرئاوایی مەحاڵەو ئەوان ناتوانن متمانە بەمرۆڤ بکەن. پاش ئەوەی مرۆڤی ئەوروپی چووە قۆناغی شارستانیبوونەوە، پێشبینی دەکرا کەبەربەریەتو شەڕانگێزی کۆتایی بێت، بەڵام هەر بەچاوچنۆکیو خۆپەرستیو پاوانخوازی خۆیەوە مایەوە. چاکترین بەڵگەش ئەو تاوانانەی کۆلۆنالیست بوو کە لە جەزائیرو ڤێتنامو .. هتد، روویاندا. ئیتر چۆن دەکرێت متمانە بەمرۆڤی ئەوروپیو شارستانیەتەکەییو راگەیاندنەکانی بکەین دەربارەی مرۆڤایەتیو مافی مرۆڤو پێشکەوتن، پاش هەموو ئەوانەی کە ڕوویاندا؟

ئەمە ئەو پرسیارە بوو کە "میشێل فۆکۆ" لە فەلسەفەی خۆرئاوای کرد. بەڵام "فۆکۆ" ئەوەندە رەخنەی لەو شارستانیەت و نوێگەرییەی خۆرئاوا گرت, هێندەی نەمابوو رایانبماڵێت و دوچاری رەشبینیەکی وەها ببێت کەبەحەتمی بەرەو عەدەمیەت دەچێت.

لەوەڵامی ئەوانەدا, "ریکۆر" بە "فۆکۆ" دەڵێت: (من دان بەڕوایەتی تەواوی ئەو رەخنانەدا دەنێم, بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانە دەمەوێت دەستبەرداری بڕوا بوون بەمرۆڤ نەبم و سەرەڕای هەموو شتێ, پێویستە متمانە بەماناو حەقیقەت و مرۆڤ بکەین, گەر نا ئەوا هەڵدەخلیسکێینە ناو دەهلیزەکانی عەدەمیەت و رەشبینییەوە کە هیچ ئاکامێکی نابێت).

لەم سەروبەندەدا دەبینین "یۆرگن هاپرماس"ی فەیلەسوفی ئەڵمانی, هەمان هەڵوێستی "پۆل ریکۆر"ی هەیە لەفەیلەسوفانی بونیادگەری و بەوە تاوانباریان دەکات کە ئەوانە دەیانەوێت مۆدێرنە لەناوبەرن. تا ئێستاش ئەم مشتومڕو کێشمەکێشە لە نێوان فەیلەسوفانی ئەورووپاو ئەمریکادا بەردەوامەو درێژەی هەیە. ئەمە شەڕی مۆدێرنەو پۆست مۆدێرنە, ئەقڵانیەت و نائەقڵانیەت, بڕوابوون بەمرۆڤ و نائومێد بوونە لەمرۆڤ.

## سەرچاوە

رۆژنامەی (الشرق الاوسط).

# عەلمانییەت وەکو "خاڵی بەیەکگەیشتن"ی نێوان موسڵمانان و مەسیحییەکان

د. محەمەد ئارکۆن
لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

## موسوڵمانان و مەسیحییەکان
## میراتی رابردوو

لێرەدا دوو هێڵی بەیەکگەیشتن لە نێوان موسڵمانان و مەسیحییەکاندا هەیە کە دەبێ یەکێکیان هەڵبژێرین، ئەمە ئەگەر مافی هەڵبژاردنمان بۆ برەخسێت، چونکە ئەم مافە هەموو کاتێ مسۆگەر نییە بەهۆی بوونی چەندین کۆت و سەپاندن، مەبەستم لە کۆت و سەپاندنی سیاسیی نییە، لانیکەم لە فەرەنسەدا.. بەهەرحاڵ ئەو دوو هێڵە ئەمانەی خوارەوەن:

1-هێڵی یەکەم هێڵێکی تەقلیدییە و بریتییە لە چوونە ناو گفتوگۆ و مشتومڕێکی بێ ئەنجام و نەزۆك کە کۆتایی نایەت. بۆ نموونە گرفتی بەراوردکردنێکی تایبەت بە لاهوتی هەردوو لایەنی ئیسلامی و مەسیحی، ئینجا گرفتی پێغەمبەرایەتی و سروش و گرفتی کوڕی خودا و.. هتد. هەموو ئەم شتانە بە ڕێگەیەکی تەقلیدی و لە میانی موفرەداتی فەرهەنگی کۆنی لاهوتی چارەسەر دەکرێن. جا ئەگەر چووینە ناو ئەو چەشنە گفتوگۆ و مشتومڕە گەرمانەی نێوان موسڵمانان و مەسیحییەکان، ئەوا هەرگیز لێی دەرناچین. ئەم جۆرە گفتوگۆیانە چەندین سەدەیە تا ئەمڕۆش بەردەوامە.

هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی هەرسێ ئایینە ئاسمانییەکەوە، ئەم مشتومڕەی نێوان ئیسلامی - مەسیحی، یان نێوان یەهودی - مەسیحی یان یەهودی - ئیسلامی بوونیان هەیە. لێرەدا چەندین کتێبخانە هەیە پڕن لەو کتێبانەی ئەو جۆرە گفتوگۆیانەیان لە خۆ گرتووە. ئەم ئەزموونە هەزاران جار ئەوەی سەلماندووە کە مومکین نییە لەو ڕێگەیەوە چارەسەرێك یان دەرچەیەك بدۆزرێتەوە. زۆر کەس باسی دیالۆگی مەسیحی - ئیسلامی دەکەن، بەڵام من ئەم وشەیەم پێ خۆش نییە، نەك لەبەرئەوەی دژی دیالۆگم، بەڵکو

لەبەرئەوەی ئەم وشەیە رەواییەك بە دوو خودگەراو بە دوو خەیاڵکراوی جەماعی دەبەخشێت کە هەردوو ئەو خەیاڵگەیە لە ئاستی وێناکردنە بە میرات بۆماوەکانیانەوە دەچنە ناو پێکدادانێکی راستەوخۆوە. (واتە ئەم چەشنە دیالۆگ و مشتومڕە بێ ئەنجام و نەزۆکە دەبێتە مایەی پێکدادانی هەردوو خەیاڵگەی ئایینیی مەسیحی – ئیسلامی). ئەمە لە کاتێکدا کە دەبێ ئێمە بچینە نێو قووڵاییەکانەوە تا بگەینە ئەو ڕێسا هاوبەشە یان ئەو ڕیشە هاوبەشەی بیروباوەڕەکانی لەسەر دامەزراوە، مەبەستم ئەو بیڕوباوەڕانەی یەکدی نەفی دەکەن و ئەوانەی لە راستیدا پەیوەستن بە بارودۆخێکی مێژوویی و کولتووریی دیاریکراوی مێژووەوە. کاتێکیش ئێمە ئیشکالیەتەکان لە شوێنگە تەقلیدییەکانی خۆیان دەلەقێنین و دەیانبەینە ناو ئاستێکی تری شیکردنەوە و تێگەیشتنی هاوبەشەوە، ئەوا لەو ئاستەدا نامێنینەوە کە بریتی بین لە چەند بازنەیەکی داخراوو لەگەڵ یەکدیدا لە شەڕ و ململانێدا بین. واتە بە لەقاندنی ئیشکالیەتە تەقلیدییەکان دەتوانین بازنەکان بە ڕووی یەکتردا بکەینەوە، ئیدی دوای ئەوە دەچینە ناو توێژینەوەیەکی هاوبەشەوە و خاڵە هاوبەشەکانی نێوان ئاینەکان دەدۆزینەوە، چونکە ئێمە هەر هەموومان لە نێو هەمان ئەو سنووورە هاوبەشەدا گیرمان خواردووە.

2–هێڵی دووەم هەمان ئەو هێڵەیە کە من پێشتر لە کتێبەکانی ترمدا نەخشەم بۆ کێشاوە، واتە هێڵی پراکتیزەکردنی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان بەسەر ئایینەکاندا. بە پێی ئەم میتۆدە دەبێ دەست بکەین بە پرۆسیسەکردنی سۆسیۆلۆجیا و ئەنترۆپۆلۆجیا و زانستی زمانەوانیو زانستی مێژوو لەسەر تازەترین ڕێگەی مێژوونووسە هاوچەرخ و نوێیەکان کە روانینێکی دیکەی جیاواز لە بارەی دیاردەی ئایینی دەخەنە ڕوو. باوەڕم وانییە ئەم میتۆدە ببێتە هۆی سوککردنی ئیمان بە مانا قوڵەکەی وشەی ئیمان[1]. بەڵکو ئەم دیدە نوێیە ڕێگە بۆ ئایینەکان خۆشدەکات گوزارشت لە خۆیان بکەن، بە زمانێکی وا گوزارشت لە خۆیان بکەن کە بتوانێت ئێمە لەو مشتومڕە بێ ئەنجامە ڕزگار بکات کە جگە لە جیابوونەوە و لێکترازان هیچی دیکەمان بۆ بەرهەم ناهێنێت. ئێمە دەبێ ئەمڕۆ هێڵی دووەم بگرین و لەسەر ئەم هێڵە گوزەر بکەین.

لەبەرئەوە من وام پێ باشە قسە لەسەر پێویستبوونی "هاوکاری" بکەین، پێویستبوونی هاوکاریی یەکدی، واتە لەوەدا هاوکاریی یەکتر بکەین کە بە شێوەیەکی هاوبەش بەرپرسیاریی سەرجەم کەلەپورە ئایینی و کولتوورییەکان لە ئەستۆ بگرین، لە جیاتی ئەوەی بچینە نێو دیالۆگ‌و مشتومڕێکەوە کە دەمانباتە سەر چەمکی لێکبوردنێکی تەوەزل و بێپەروا و فەرامۆشکردنی ئەو گرەوە تازانەی لە گۆڕین و بەرهەمهێنانی ماناکانەوە دێتە دی. بەڵام لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیاریی کەلەپووره ئایینی و کولتورییەکان بە شێوەیەکی هاوکار و هاوبەش ناچارمان دەکات گرفتەکان لە ئاستێکی ریشەدارتر و قووڵتردا بخەینە ڕوو وەك لەو ئاستە سادە و ساکارەی زانا تەقلیدییەکانی فیقهو لاهوت و میتافیزیکیای کلاسیکی تا سەرهەڵدانی فەلسەفەی گومان[2] لەسەری وەستاون. بۆ نموونە ئەگەر سرووش لە مەسیحیەتدا شتێکی تری غەیری ئەو سروشە بێت کە لە ئیسلامدا هەیە، ئەوا دەبێ گرفتەکە روون بکەینەوە چونکە ئەمە گرنگییەکی ریشەدار و قووڵی هەیە. واتە دەبێ لە چوار چێوەی مەعریفیی

مۆدێرنەدا ئەو گرفتە بخەینەڕوو و ئاشكرای بكەین نەك لە ڕێگەی زمان و زاراوە لاهوتییە تەقلیدییەكانەوە كە هەژموونی خۆیان بەسەر هەموو تایفەیەكدا دەسەپێنن. بەڵام ئەم زمان و زاراوە تەقلیدییە لاهوتیانە ناتوانن هەژموونی خۆیان بەسەر ئیپستیمۆلۆژیای نوێدا بسەپێنن[3].

هێڵی دووەم تەنها ئاستی فیكری ناگرێتەوە، بەڵكو بایەخ بە مەسەلەی ژیانی هاوولاتیانیش دەدات لە كۆمەڵگەدا. لێرەدا بە عەلمانییەت دەگەین بە باشترین و وروژێنەرترین مانای وشەی عەلمانییەت. بەڵام ئەم عەلمانییەتە بەشێوەیەكی پتەو پشت بە جۆری ئەو كولتوورە دەبەستێت كە لە كۆمەڵگەدا هەیە. پاشان ئەمە لە جۆری ئەو كولتورە باوەی لە كۆمەڵگە ئیسلامییەكاندا (عەرەبی بێت یان غەیرە عەرەبی) بڵاوە شتێكی مەحاڵە و بگرە مومكین نییە وێنابكرێت. من كە لێرەدا باسی كولتوور دەكەم، لە راستیدا باسی جۆری كولتووری باو دەكەم نەك باسی ئایین یان ئیسلام و قورئان، چونكە ئەمانە شتێكی ترن. كاتێك وشەی "كولتوور" واژە دەكەم مەبەستم تێكڕای ئەو تەوژمە ئایدیۆلۆژییانەیە كە بە شێوەیەكی توندوتیژ دێنە نێو كۆمەڵگاكانی ئێمەوە بە تایبەتی لەساڵی (1950) بە دواوە. ئەم توندوتیژییە ئایدیۆلۆژییە تەنها بریتی نییە لە بەرهەمی لۆكاڵی و ناوخۆیی ئەو كۆمەڵگایانە، بەڵكو ئەمە لە بنەڕەتدا هێڵی گەڕانەوەی ئەو شۆكە توندوتیژە دەنوێنێت كە هەژموونی داگیركاری (ئیستیعماری) و دوای ئەوەش هەژموونی شارستانیەتی ماتریالی سەپاندوویەتی. لەبەرئەم هۆیە ئەو كۆمەڵگایانە ناچارن لە میانی ئەو زمانە ئاینییەی لەبەردەستیاندایە گوزارشت لە خۆیان بكەن. لەم چەشنە كولتورەشدا ئاشكرایە كە عەلمانییەت بەو شێوەیەی روونمان كردەوە شتێكە مومكین نییە لە كۆمەڵگە ئیسلامی و عەرەبییە هاوچەرخەكاندا وێنا بكرێت یان بیری لێبكرێتەوە. بەڵام بە داخەوە چاودێرانی دەرەوە و هۆیەكانی راگەیاندنی خۆرئاواو ئەوروپا ئەوە رەتدەكەنەوە كە دابەزنە نێو ئەم ئاستە قووڵەی شیكردنەوەوە، بەڵكو هەمان ئەو قسە باوانە لە بارەی موسڵمانان دووپات دەكەنەوە كە تیایاندا فرەژنی باوەو پیاوی موسوڵمان ژنی خۆی تەلاق دەدات و جیهاد دەكات و باسی میرات و توندوتیژی و دەمارگیریی ئایینی دەكەن[4].

ئەمە لەسەرێك، بەڵام لە سەرێكی تر تێبینی ئەوە دەكەین كە ئەو عەلمانییەتەی بەرپرسە سیاسییەكانی فەرەنسە خۆیانی پێ سەرقاڵدەكەن عەلمانییەتێكی ناتەواوە. بۆ نموونە كاتێك دەڵێن مومكین نییە خەڵكی مەغریب (مەبەست لە وڵاتە عەرەبییەكانە) ببنە كەسانی رۆشنبیر و مەدەنی و ئاوێزانی كۆمەڵگەی عەلمانی بن، ئەمە لە راستیدا دەرخستنی جۆرێك لە دەمارگیرییە كەشایستەی كولتووری فەرەنسی نییە[5]. لە راستیدا مەحاڵە مێژوونوسێكی فیكری فەرەنسی لەوە تێبگات چۆن دەشێ سەركردەیەكی سیاسیی فەرەنسی كولتوورە دێرینەكەی خۆی لەبیر بكات هەر تەنها لەبەر چەند هۆیەكی ئایدیۆلۆژی و بۆ پێداویستییەكانی خۆی سەبارەت بە ستراتیژی هەڵبژاردن و بە دەستهێنانی دەنگەكان. ئەم چەشنە هەڵوێستانە لەلای سەركردە سیاسییەكان، خراپ تێگەیشتن و بەدحاڵیبوونی نێوان هەردوو لایەنی ئەوروپی و ئیسلامی بەهێز دەكات و كەشوهەوای باوی كۆمەڵایەتیی فەرەنسی دەشێوێنێت. ئەمە دەبێتە مایەی كاردانەوەی توندو بەهێز لەلایەن جالیەی مەغریبی و عەرەبی كە هەست بەوە دەكەن لەلایەن فەرەنسییەكانەوە دوور دەخرێنەوە و سوكایەتییان پێدەكرێت هەروەكو

چۆن لە قۆناغی داگیرکاریدا لە نیشتمانەکەیان دوورخرابوونەوە. ئێمە لە هەمان هەڵوێستی ڕەتکردنەوەی گرتنەئەستۆی بەرپرسیاریی هاوبەش ڕووبەرووی هەمان دیاردە دەبینەوە، واتە کاتێك ئەورووپییەکان بەرپرسیاریی دیاردە ئاینییەکان بە هاوبەشی لەگەڵ ئێمەدا لە ئەستۆ ناگرن، دوچاری هەمان کاردانەوە دەبینەوە. جاران هەژموون و باڵادەستیی داگیرکەر هەبوو، بەڵام ئەمڕۆ ئەو هەژموونە فۆرمی دیکەی لە خۆ گرتووە.

لە ڕاستیدا ئەم چەشنە ململانێیانە مێژوویەکی دوورودرێژیان هەیە، ئەمە مێژووی دەریای سپی ناوەڕاستە. حەوزی دەریای سپی ناوەڕاست ماڵی پێکەوە ژیانی ئێمە بووە، هەروەکو شوێنی نەفیکردنی یەکدیش بووە. سا ئەگەر قۆناغی بورژوازیی لە دایکبوو لە ئیسلامدا لە سەدەی یانزەهەمی زایینییەوە دەستی بە لاوازی و وەستان کردبێت، ئەوا لەوبەرەوە هێزی خۆرئاوایی و بورژوازیی خۆرئاوا بەرەو هەڵکشان دەچوو، ئیدی لەو ساتەوەختەوە جەنگە سەلیبییەکان دەستی پێکرد بێگومان بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕێگاوبانە بازرگانییەکان هەر لە ئۆقیانوسی هیندییەوە تا خۆرئاوای ئەورووپا. بۆ ئەم بابەتە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ کتێبە گرنگەکەی مامۆستای گەورەمان فیرنان برۆدێل بە ناوی "جیهانی ناوەڕاست لە سەردەمی فیلیپی دووەمدا". ئەو گیروگرفتانەی ئەمڕۆ پێیانەوە دەناڵێنین دەگەڕێنەوە بۆ ئەو مێژووەو تەنانەت بۆ بەر لەو مێژووەش. بەڵام یادەوەریی مێژوویی لەلای خەڵك زۆر کورتە، تەنانەت جەنگی جەزائیریش کە لە ڕابردوویەکی زۆر نزیکدا ڕوویداوە، خەریکە بیر دەچێتەوە یان بیرچۆتەوە وەك بڵێی هیچ شتێ ڕووی نەدابێ. لە کاتێکدا ئەو جەنگە کۆمەڵێ وانە و پەندی زۆر گرنگی تێدایە و تیشك دەخاتە سەر چۆنێتی میکانیزمی ئیشکردنی دامەزراوە فەرەنسییەکان و فیکری فەرەنسی. ئەو کتێبە زۆرانەی لە فەرەنسەدا لە بارەی مەغریبی گەورەوە چاپ کراون و دەکرێن هەرگیز نەگەیشتوونەتە ڕاڤەکردنێکی ڕاستەقینەی دیاردەی ئایینی لەو کۆمەڵگایانەدا. ئەو نووسەرانە یان پێیان وایە ئایین لە مەغریبدا شتێك نییە، یاخود پێیان وایە ئایین لە مەغریبدا هەموو شتێکە و هەموو شتێکیش یەکلا دەکاتەوە و بگرە تەفسیری هەموو شتێك دەکات. ئەم بەراوردکارییە دژبەیەکە بۆ فاکتەری ئایینی لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانەی دۆرکهایم. تا ئەمڕۆش ئەم دید و ئەم بەراوردکارییە لە فەرەنسەدا باڵادەستە کاتێك بەردەوام ئەوە دووپات دەکەنەوە کە مەغریبییەکان و عەرەبەکان بە گشتی، تا هەتایە مەحکومن بەوەی لە ژینگەیەکدا بژین کە هەردوو فاکتەری ئایینی و سیاسی تێکەڵ دەکات، واتە لە کەشوهەوایەکدا دەژین فاکتەری ئایینی و فاکتەری سیاسی ئاوێزانی یەکدی دەبن. لێرەدا ئاماژەیەکی ڕوون دەبینین سەبارەت بە چۆنێتی تێگەیشتن لە عەلمانییەت و میکانیزمی ئیشکردنی عەلمانییەت لە بیری فەرەنسیدا و بگرە لەوانەیە لە بیری خۆرئاواییشدا.

ئیسلام لە خۆیدا، بەرووی عەلمانییەت، داخراو نییە، واتە ئیسلام هەموو دەرگاکانی بەرووی عەلمانییەت دانەخستووە. جا بۆ ئەوەی موسڵمانان بگەنە دەرگاکانی عەلمانییەت، ئەوا دەبێ خۆیان لە بە زۆر سەپاندن و لە کۆت و پێوەندە دەروونی و زمانەوانی و ئایدیۆلۆژییەکان ڕزگار بکەن، واتە خۆیان لەو فشارە زمانەوانی و دەروونی و ئایدیۆلۆژییە دەرباز بکەن کە باری قورس کردوون، نەك تەنها بە هۆی کەڵەکەبوونی

پاشكه‌وتوویی مێژوویی تایبه‌ت به‌ خۆیان، به‌ڵكو به‌ هـۆی فاكتـــه‌ره‌ ده‌ره‌كییــه‌كان و هۆكــاره‌ نێــو ده‌وڵه‌تییه‌كانیشـه‌وه‌. جـا بـۆ ئـه‌وه‌ی بگه‌نـه‌ ئـه‌و مه‌به‌ســته‌، ئـه‌وا ده‌بـێ بگه‌ڕێنـه‌وه‌ بـۆ حه‌قیقـه‌تی مێژوویی فیكری ئیسلامی له‌ چوار سه‌ده‌ی یه‌كه‌می كۆچـیدا. لـه‌ واقیعـدا لـه‌ نێـوان سـه‌ده‌ی دووه‌م و سێیه‌می كۆچیدا له‌ ناو ئیسلامدا بزووتنه‌وه‌یه‌كی رۆشـنبیران هـه‌بووه‌ كـه‌ پێیانـده‌وترا "موعته‌زیلـه‌". دواتر موعته‌زیله‌كان له‌ مێژووی ئیسلامدا دوچاری چه‌وسانه‌وه‌ بوونه‌وه‌. مانای وشه‌ی "موعته‌زیله‌"ش واتـه‌: ئـه‌و كه‌سـانه‌ی خۆیـان جیـا كـرده‌وه‌ و بـه‌ تـه‌واوی ئـیراده‌ی خۆیانـه‌وه‌ خۆیـان بـۆ رامـان و لێوردبوونـه‌وه‌و بیركردنـه‌وه‌ تـه‌رخان كـرد. بـه‌ڵام ئه‌رتۆدۆكســی ئیســلامی ناوه‌كــه‌یان شــێواند و مانایـه‌كی وایـان كـرده‌ بـه‌ر كـه‌ ئه‌مانـه‌ خۆیـان لـه‌ ئوممه‌ی ئیسلامی جیاكردۆته‌وه‌ یان گوایه‌ ئه‌مانه‌ له‌ ئوممه‌تی ئیسلام نین بۆ ئه‌وه‌ی سوكیان بكه‌ن و وه‌ك كه‌سانی بێ عـه‌قڵ نیشـانیان بـده‌ن. لـه‌ راسـتیدا ئـه‌و رووناكبیرانـه‌ (واتـه‌ موعته‌زیلـه‌كان) مه‌سـه‌له‌گه‌لێكی بنچـینه‌ییان لـه‌ گۆڕه‌پـانی فیكریـدا وروژانـدووه‌ كـه‌ جێی بایه‌خی ئێمه‌یه‌، ئه‌مـه‌ش بـه‌هۆی مه‌رجه‌عیـه‌تی دوولایـه‌نیی رۆشـنبیرییان كـه‌ خـۆی لـه‌ دیـارده‌ی سـروش و بـیری گریكـی ده‌نوانـد. موعته‌زیلـه‌كان سـه‌رباری بایه‌خـدان و لێكۆڵینـه‌وه‌یان لـه‌ بـاره‌ی سروشی ئیسلامی، بایه‌خیان به‌ تـه‌وه‌رێكی دیكـه‌ی فیكـر ده‌دا كـه‌ فیكـری گریكـی بـوو، واتـه‌ جگـه‌ لـه‌ ئـه‌قڵی ئیسـلامی لایـان لـه‌ پرۆسـه‌كه‌ی تـری ئـه‌قڵ كــرده‌وه‌ كــه‌ ئــه‌قڵی گریكییــه‌. مه‌به‌ســتم ئــه‌و پرۆسیسـه‌ی لـه‌ یۆنـانی كلاسـیكییه‌وه‌ هاتـه‌ نـاو ئیسلام و هه‌ر له‌ سه‌ده‌ی دووه‌می كۆچییه‌وه‌ به‌هێزو وزه‌یــه‌كی پــه‌لامارده‌ره‌وه‌ هاتــه‌ نــاو كۆمــه‌ڵگای ئیســلامییه‌وه‌. ئه‌مانـه‌ بـه‌ شـێوازێكی تـر سـه‌یری سرووشــی ئیســلامی و بــیری گریكییــان ده‌كــرد كــه‌ جیــاواز بــوو لــه‌ شــێوازی فه‌یله‌ســوفه‌كان (واتــه‌ شـێوازی موعته‌زیلـه‌كان جیـاواز بـوو لـه‌ شـێوازی فه‌یله‌سووفه‌ ئیسلامییه‌كان).

مه‌ســـه‌له‌كه‌ لـــه‌لای ئـــه‌و روناكبیرانـــه‌ (واتـــه‌ موعته‌زیلــه‌كان) گه‌یشــته‌ ئاســتی خســتنه‌ رووی گرفتێك كه‌ به‌ "قورئانی خوڵقێنراو" ناوزه‌دیان كرد، هـه‌ر تـه‌نها داننانیـان بـه‌وه‌ی كـه‌ قورئـان شـتێكی خـوڵقێنراوه‌ ئه‌مـه‌ لـه‌ به‌رامبـه‌ر دیـارده‌ی سروشـدا هه‌ڵوێستێكی ده‌گمه‌ن ده‌نوێنێت. ئه‌مه‌ له‌ راستیدا هه‌ڵوێســـتێكی مـــۆدێرن و تـــازه‌ گه‌رانه‌یـــه‌ لـــه‌ نێوجه‌رگـه‌ی سـه‌ده‌ی دووه‌مـی كۆچـی/ هه‌شـته‌می زاینیدا. ئـه‌م هه‌ڵوێسته‌ تیۆلۆجییه‌ داهێنـه‌ره‌ی كـه‌ موعته‌زیلـه‌كان گرتیانـه‌ بـه‌ر، كایه‌یـه‌كی مـه‌عریفی نــوێی ده‌كــرده‌وه‌ كــه‌ توانــای ئــه‌وه‌ی هــه‌بوو ئه‌قڵانییه‌تێكی ره‌خنه‌گرانه‌ی وا به‌رهه‌م بهێنێت رێك له‌و ئه‌قڵانییه‌ته‌ بچێت كه‌ لـه‌ سـه‌ده‌ی سیانزه‌هه‌می كۆچـی لـه‌ خۆرئـاوای ئـه‌وروپادا سـه‌ریهه‌ڵدا، بـه‌ تایبه‌تی ئه‌گه‌ر رووبه‌ڕووی ئۆرتۆدۆكسـی ئیسلامی بالأده‌ست نه‌بوونایه‌ كه‌ له‌ سه‌ده‌ی پێنجه‌می كۆچی/ یانزه‌هه‌می زایینی و له‌سه‌ر ده‌ستی خه‌لیفه‌ ئه‌لقادر پــه‌لاماردران و چه‌وســێنرانه‌وه‌. مه‌ســه‌له‌ی وتــنی ئــه‌وه‌ی كــه‌ قورئــان شــتێكی خــوڵقێنراوه‌ تــه‌نها ئاخـاوتنێكی رووت نییـه‌ بـه‌ڵكو مانـای ئه‌وه‌یـه‌ كـه‌ ره‌هه‌ندی كولتوور و زمان بخرێتـه‌ ناو خستنه‌ڕووی گرفته‌كـه‌وه‌، ئـه‌م دوو شـته‌ش (كولتـوور و زمـان) دروستكراوی به‌شه‌رن نه‌ك خودا. ئه‌مه‌ واته‌ ئه‌و دوو ره‌هه‌نـده‌ سـه‌باره‌ت بـه‌و كۆششـه‌ی لـه‌ پێنـاوی ته‌ملیككردنی په‌یامی سروشبه‌خشدا سه‌رف كراوه‌، له‌به‌رچاو بگیرێت (واته‌ ره‌هه‌ندی كولتوور و زمان له‌ قورئـان و په‌یامـدا حیسـابی گـه‌وره‌یان بـۆ بكـرێ)، هـه‌روه‌ها مانـای وایـه‌ دان بـه‌ به‌رپرسـیاریی ئـه‌قڵ و

بەشداریکردنیدا بنرێت لە کۆششی ئەو تەملیککردنەدا[6].

ئەم بزاوتە فیکرییە رەسەنە (واتە موعتەزیلە) بەندە بە چوارچێوەی کۆمەڵایەتیی مەعریفەوە نەك بە ئیسلام وەك ئاینێك. واتە پەرەسەندنی ئابووری‌و کۆمەڵایەتیی شارە گەورەکان راستەوخۆ تەحەکومی بە بڵاوبوونەوەی زانستە ئەقڵانییەکان دەکرد، ئەو زانستە ئەقڵانییانەی دەبوونە مایەی عەلمانیبوونی فیکر و بوون، یان بە پێچەوانەوە بەرتەسکی دەکردنەوە و لە نێوی دەبردن[7]. (واتە فیکر دەکەوێتە ژێر کاریگەریی بارودۆخ و فاکتەرە ماددییەکانەوە)، ئیدی لەوێوە قرتاندنی پلە بە پلە و شێواندن و داپچڕان دوچاری فیکری ئیسلامی بوون بە تایبەتی لە سەدەی یانزەهەمی زایینی بە دواوە نەك لە سەدەی نۆزدەهەمەوە کە ئایدیۆلۆژیای خەباتگێڕیی بزوتنەوە رزگاریخوازییە نیشتمانییەکان ئەو وەهمەیان پێدەفرۆشتین[8]. ئەوەی کە بە ئیسلامی "ئەرتۆدۆکسی" ناودەبرێت لە راستیدا ئیسلامێکی قرتێنراو و بێ وزە و هیلاکە بە هۆی ئەو بڕیارە سیاسییە دیاریکراوانەی لە رابردوودا دەدران. سا ئەگەر رێگە بە هەڵوێستی موعتەزیلەکان بدرایە سەبارەت بە قورئانی خوڵقێنراو کە بەردەوام بن لەسەر کارو هەڵوێستەکانی خۆیان وەك یەکێ لە هێڵە تیۆلۆجییەکانی ناو ئیسلام، ئەوا ئیسلام تەنها نەدەبوو بە "ئاینی کتێب". بەڵام یەکلاکردنەوەی کێشە و مەسەلەکان بە هۆی چەند هۆکارێکی مێژوویی و ئایدیۆلۆژی و سیاسییەوە ئەنجام دراوە نەك بەهۆی ململانێی سروشتیی بیروباوەڕ و فیکرە جیاوازەکان وەك چۆن ئەمە (واتە ململانێی سروشتیی بیروباوەڕە جیاوازەکان) بە درێژایی چوار سەدەی یەکەمی کۆچیدا روویدا. هەر بە هۆی ئەم هۆکارە مێژوویی و ئایدیۆلۆژی و سیاسییانەوە بوو کە خەتی تیۆلۆجیی (ئەشعەری) دەبێت بە تەنها خەتێکی تیۆلۆجیی رەسمی لە ناو ئیسلامدا (ئەشعەری لە سەدەی دەیەمی زایینییدا ژیاوە)، ئەمە رێك لە سەدەی یانزەهەم روویدا کاتێك خەلیفە ئەلقادر بڕیارێکی خەلیفانەی دەرکرد[9] و تیایدا ئەوەی قەدەغەکرد کە باسی هەڵوێستی تیۆلۆجیی موعتەزیلەکان سەبارەت بە قورئانی خوڵقێنراو بکرێت، هەر کەسێك ئاماژە بۆ ئەوان بکات یان هەڵوێستی ئەوان دووپات بکاتەوە خوێنی حەڵاڵ دەکرێت. هەموو ئەم شتانە ئێمە لە تیۆلۆجیا (یان زانستی لاهوت = کەلامناسی) دوور دەخاتەوە. ئەم چەشنە ئیسلامە ئۆرتۆدۆکسییە بۆ ماوەی نۆ سەدە بەشێوەیەکی عەمەلی سەرکەوتنی بەدەست هێناو بنجی داکوتاو بەردەوام بوو و ئەو دەرەنجامانەی لێکەوتەوە کە ئەمڕۆ دەیزانین (واتە ئیسلامێکی وشك و بێجوڵە و سکولاستیکی لێکەوتەوە). بەمجۆرە دەبینین ئەمڕۆ چەندین کۆنگرەی ئیسلامیی گەورە سازدەکرێ و ژمارەیەك زانای موسوڵمانان کۆدەبنەوە و کەچی ناوی گەورەی وەکو ئیبن روشد و ئیبن عەرەبی لادەبرێ و کەس باسیان ناکات، دیسان ئەمڕۆ بە ئاشکرا هەڵکشانی ئیسلامێکی سکولاستیکی تاریکگەرا دەبینین.

بەڵام دەبێ خۆرئاوا و ئەورووپاش بارستایی ئەو رووداوانە بپێون کە لە لای خۆیاندا رووی داوە، بۆ نموونە کاتێك لە خۆرئاوا باسی ئەو لێکدی جودا کردنەوەیەی نێوان کەنیسە و دەوڵەت دەکەن، یان کاتێك باسی لێکترازانی لوتکەی ئایینی و لوتکەی سیاسی دەکەن، ئەوا لەو ئەزموونەوە دەست پێدەکەن کە لە شۆڕشی فەرەنسەوە دەستی پێکردووە و تا ئەمڕۆش بەردەوامە. بەڵام لێرەدا دەبێ وریا بین نەکەوینە ناو گرفتی هەڵەکاریی

مێژووییەوە. راستە لە جیهانی مەسیحیدا دوو دامەزراو هەبووە: دامەزراوی کەهنوتی کە پاپا لە لوتکەیدا بوو، پاشان دامەزراوی سیاسی کە پاشا و ئورستوکراتەکان رابەرایەتییان دەکرد. بەلام دەبێ ئەوەش ببینین چۆن ئەم دوو دەسەڵاتە بە درێژایی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست تا ساتەوەختی جیابوونەوەیان پرۆسەی کارەکانی خۆیان کردووە. ئێمە دەزانین رەوایی دەسەڵاتی سیاسی دانی پێدا نەدەنرا ئەگەر لەلایەن قەداسی گەورەوە مەشروعیەتی دەسەڵاتی رۆحیی بەبەردا نەکرایە، واتە دەبوایە دەسەڵاتی رۆحی و ئایینی رەوایی بە دەسەڵاتی سیاسی ببەخشیایە، کە لە کاتی دانانی پادشای فەرەنسە یان ئیمپراتۆرێکدا ئەم کارەیان لە کاتیدرائیەی شاری رانسی فەرەنسیدا ئەنجام دەدا. کاتێکیش ئەمڕۆ باسی پەیوەندیی نێوان کەنیسە و دەوڵەت دەکەین، مومکین نییە ئەم مێژووە دوور و درێژە فەرامۆش بکەین و بیسڕینەوە و وەك بڵێی هیچ شتێ رووی نەدا بێ. هەمیشە لوتکەی دەسەڵاتی سیاسی هەبووە بەلام لە تەکیدا هەمیشە لوتکەی سەروەریی باڵاش هەبووە کە دەسەڵاتێکی ئایینی بووە و رەوایی بەخشیوە بە دەسەڵاتی سیاسی[10]. ئەم قسەیە بە جۆرێکی تر بەسەر مۆدێلی دیموکراتیانەی حوکمیشدا دەگونجێت، ئەو مۆدێلەی دواتر لە سەدەی نۆزدەهەمدا لەگەڵ سەپاندنی مافی دەنگدانی گشتیدا خۆی دەچەسپێنێت. بۆ نموونە دەبینین لەگەڵ هاتنی سەردەمی کۆماریدا لە فەرەنسە، رژێمی کۆماری جۆرە سرووتێك بۆ پیرۆزکردن بە خۆوە دەبینێ، بەلام ئێمە ئەمڕۆ ئەو ناوەی لێ نانێین چونکە ئەمڕۆ ئێمە زمانێکی عەلمانیانە بەکاردەهێنین، بەلام ئەنترۆپۆلۆژیستی فەرەنسی جۆرج بالاندێ بۆی دەرخستووین کە هیچ دەسەڵاتێکی سیاسی لە هیچ کۆمەڵگەیەکدا نییە بەبێ دەرهێنانێکی شانۆیی کە جۆرێك لە ئاهەنگسازی و چەشنێك لە تەقالیدی ئایینی لە خۆدەگرێت.

سا ئەو ژینگەیەی دەسەڵاتی تیادا پرۆسیس دەکرێت، دەسەڵاتێکی ئایینی بێت یان عەلمانی، پێویستیی بە رەوایی و بە لوتکەی سەروەریی باڵا هەیە و مومکین نییە مەشروعیەت لە دەسەڵات جیا بکرێتەوە. پەیوەندیی دیالێکتیکیی نێوان سەروەریی باڵا و دەسەڵاتی سیاسی بەپێی ناوەندە کولتووری و مێژووییەکان گۆڕانکاریی بەسەردا دێت (واتە ئەو پەیوەندییە بە گوێرەی کۆمەڵگاکان و بەپێی پەرەسەندنی مێژووش دەگۆڕدرێت). بەلام ئەم پەیوەندییە بەردەوام پێمان دەڵێت: مەحاڵە کارکردنی ئایینی بە مانای فراوانی وشەکە (واتە لوتکەی سەروەریی باڵا) بە شێوەیەکی ریشەیی لە کارکردنی سیاسی (واتە لوتکەی دەسەڵاتی سیاسی) جیا بکرێتەوە. مەسەلەی سەروەریی باڵا بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست هەژمونێکی بێ ئەملاو ئەولای هەبوو کە پێدراوی سرووش بە تەواوی زاڵ بوو و وەك سەرچاوەی هەموو حەقیقەتێکی باڵا کاری دەکرد، بەلام هەر لەو چرکە ساتەی کە دەنگدانی گشتی شوێنی سرووشی وەکو تەنها سەرچاوەی حەقیقەت گرتەوە، ئەوسا دەسەڵاتی دەوڵەت دەستی کرد بە سەپاندنی سەرچاوە و رێگە تایبەتییەکانی شەرعیەتی خۆی و بە شێوازی تایبەتی خۆی رەوایی خۆی سەلماند.

ئەو پرسیارەی دەمانەوێ لێرەدا بیخەینە ڕوو، بەمجۆرەیە: بە ناوی چی و بە ناوی کێوە ئینسانێك قایل دەبێت تاعەت پێشکەش بە ئینسانێکی تر بکات کە خاوەنی دەسەڵاتە؟ توێژەری فەرەنسی مارسیل گوشێ وەلامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ بنەمای ئەم پەیوەندییە (واتە پەیوەندی

تاعـەت) بریتییـە لـە: "قـەرزداریێتی مانـا" (مدیونیـة المعنی). ئایا قەرزداریێتی مانا یانی چی؟ ئەمە یانی مـن رازیـم تاعـەتی كەسێك بكـەم كـە ئارەزووم تێـر دەكات لە گەیشتن بە مانایەكی چڕو پڕ، پاشـان مـن بە هـۆی پێداویستییەكی ناوەكی و خودی تاعـەتی دەكەم نەك یەكێ لـە دەرەوە بـە زۆر ئـەوەی بەسـەردا سەپاندبم. لێرەدا و لەم كاتـەدا دەسـەڵات دەبێت بە سـەروەریی بـاڵا و رەواییـەكی تـەواوی دەبێـت و پێویستیی بـەوە نابێت ناچاربێت پـەنا بەرێتـە بـەر هێز لە پێناوی ئەوەی خەڵكی تاعەتی بكەن. ئەمە لە مێژوودا روویداوە. حاكمەكان بـە درێـژایی چـەندین سـەدە "قـەرزداریێتی مانـا" یـان لـە سرووشـەوە وەرگرتووە، ئەمە لـە جیهـانی مەسیحیدا رووی داوە هـەروەكو لـە جیهـانی ئیسلامیشـدا رووی داوە[11].

ئـەمڕۆش دەسـەڵاتداران بـە هـەموو هێـزی خۆیانـەوە هەوڵدەدەن لـە ڕێگـەی مـافی دەنگدانی گشتییەوە بـە دەستی بهێنن. بەڵام ئەم مافە بـەردەوام رووبـەڕووی زەبر و شۆك دەبێت كە لە بەهاكـەی كـەم دەكاتـەوە – بێگومـان ئەمـەش لـە میـانی پرۆسـەی فیعلیـی دەسەڵاتەوە–. ئەم "قـەرزداریێتیی مانا"یـە ئـەمڕۆ لـە سیسـتمی دیموكراتیـدا لـە قۆنـاغی توانـەوەو لـە نێوچووندایە، لە راستیدا بەبێ ئـەوەی پشـكنینێكی قووڵ لە قەرزداریێتی مانا ئەنجام بـدەن، فەرامۆشـیان كـردووە و لـە پڕێكـدا بڕیـاری ئـەوەیان دا كـە ئـەم قەرزداریێتییە تەنها بە كەڵكی میللەتە سەرەتاییەكان دێـت و شایسـتەی میللـەتانی پێشـكەوتوو و شارستانی نییە[12].

بـا ئـەم خاڵـە زیـاتر روون بكەینـەوە. كاتێـك سـەری لویسـی شـازدەهەمیان پەڕانـد، لـە ڕاسـتیدا سـنوورێكیان بـۆ "لوتكـەی سـەروەریی بـاڵا" (ذروة السـیادة العلیـا) دانـا كـە تەقدیسـكردنی پاشـای فەرەنسـی لـە كاتیدرائیـەی شـاری رانـس هێمـای بـۆ دەكرد (واتـە پیرۆزكردنـی پاشـا هێمـای بـۆ لوتكـەی سـەروەریی بـاڵا دەكـرد). بـەڵام پێناچـێت فەیلەسـوفانی ئـەو كاتـە، بـەم پرۆسـەیە، گـرفتی قـەرزداریێتی مانایـان چارەسـەر كردبێـت. ئـەوان بـە تـەنها سـەری پاشـایان نەپەڕانـد، بـەڵكو زۆر بـە خێرایـی مەسەلەكەشیان یەكلاكردەوە. بەمجۆرە لـە "سـەروەریی باڵا"یێكـەوە گواسـتیانەوە بـۆ "سـەروەریی بـاڵا"یێكی تر. واتـە لـە ڕێگـەی چـەندین زەبـری كوشـندەی یـەك لـە دوای یەكـەوە سیستمێكیان لە مەشروعیەت گۆڕی بە سیستمێكی تـری مەشـروعیەت. لـە واقیعـدا مێـژوو لـە ڕێگـەی هێزەوە دروست دەكرێ و دواتریش رەوایی دەكرێ بەبـەر دەسـەڵاتی سـەركەوتوودا ئەمـەش لـە ڕێگـەی هەوڵـدانی فـەرمانڕەواكان بـۆ دۆزینـەوەی قەرزداریێتیی مانا لە شوێنێكی تر (واتە دۆزینـەوەی رەوایـی لـە شـوێنێكی تـر). هـەر لـە ئێسـتاوە و هـەر لێرەشەوە ئەم هەوڵدانە بۆ دۆزینەوەی رەوایـی (یـان با بڵێین هەر لـە چركەسـاتی شـۆڕشـی فەرەنسییەوە) هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی رەوایی كەوتۆتە سەر شـانی مرۆڤێكـی تایبـەتی كـە دابـڕاوە لـە بڵندگـەرایی و لـە هێماكاریی ئایینی. بەمجۆرە مرۆڤ بۆ رەهەنـدەكانی خـۆی كـورت كرایـەوە. هـەر بـەم مانایـەش دەبـێ لـە گـرفتی خەلافـەت و سـەڵتەنەت سـەبارەت بـە ئیسـلام بكۆڵینەوە. چونكە لە ئیسلامیشدا بە هـۆی لوتكـەی سـەروەریی بـاڵا، كـە لـە پیـاوانی ئایینیـدا خـۆی دەنواند، جۆرێك لە پیرۆزكردنـی دەسـەڵاتی سیاسـی هـەبوو. بـەمجۆرە خەلیفـە نوێنەرایـەتیی موقەدەسـی دەكـرد (یـان نوێنەرایـەتیی ئامـادەبوونێكی پیرۆزگـەرایی دەكـرد)[13]. ئەمـە بـە چەشـنێك بـوو كاتێك كەمال ئەتاتورك لە ساڵی 1924دا سیسـتمی سـەڵتەنەتی عوسمـانیی هەڵوەشـاندەوە، نـارەزایی و خـەمێكی گـەورەی لەسەرانسـەری دنیـای ئیسـلامیدا

ورووژاند. ئێمە ئەمڕۆ ئەوەش دەزانین كە لەم بارەیەوە و لە كاتی سەركەوتنی ئیمام خومەینی بۆ لوتكەی دەسەڵات، چ شتێك روویدا.

سا ئەگەر كۆمەڵگە ئیسلامییەكانی ئەمڕۆ دوورن لە كاتیگۆرییە عەقڵییەكان (واتە بیركردنەوەی ئەقلانی) و هەروەها دوورن لە مەرجەعیاتە رۆشنبیرییەكانی دی بۆ خستنەڕووی مەسەلەی سەروەریی باڵا و دەسەڵاتی سیاسی بە هەموو رەهەندەكانیەوە، ئەوەی كە لە سەردەمی خەلافەتدا بە درێژی گفتوگۆیان لەسەر كردووە، ئەوا ئەو شتە لە یەك كاتدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە ئەم كۆمەڵگایانە هەم لە كەلەپووری تایبەتیی خۆیان دابڕاون و هەم لە مۆدێرنەیەكی رەخنەگرانە دابڕاون[14]. بەڵام سەرباری هەموو شتێك، ئەمڕۆ مەسەلەكان چارەسەر بوون و گۆڕاون.

لە دوای ئەزموونی شۆڕشی "عەرەبی" لە تەك جەمال عەبدولناسر و شۆڕشی "ئیسلامیی"ی حاڵی حازر، هەست بە دەركەوتنی جۆرێك لە پێشكەوتن دەكەین، بەڵام پێشكەوتنێكی خاو و لەسەرخۆ كە بەر چەندین لەمپەرو رێگر دەكەوێت، دەبێ لەم مەسەلەیەدا ئەو توێژە بەرفراوانەی ناو جیهانی ئیسلامیمان لە بیر نەچێت كە تا ئەمڕۆش نەخوێندەوارن، توێژگەلێكی فراوان هەر لە بەنگلادیشەوە بۆ پاكستان و تا دەگاتە ئەفریقیای رەش نەخوێندەوارن. تا ئێستاش دانیشتوانی ئەو ناوچانە خاوەنی كەلەپورێكی زارەكین، بەڵام ئەو كەلەپورە زارەكییەش ئەمڕۆ لەلایەن هۆیە نوێیەكانی راگەیاندنەوە تێكدراون و چوارچێوە تەقلیدییەكانی كولتوری زارەكی تێكشكێنراوە، بەو پێیە لەسەدا حەفتا تا لە سەدا هەشتای دانیشتوان هاوسەنگیی خۆیان لە دەستداوە، ئەوان لە ئاژاوەیەكی مەعنەویی گەورەدا دەژین، چونكە كەشوهەوای مەعنەویی تەقلیدییان بە توندی سوكایەتی پێكراوە و لەلایەن كولتورێكەوە رووخێنراوە كە بەمۆدێرن ناودەبرێت و ئەوەی لە رێگەی ئامێری رادیۆ و تەلەفیزیۆنەوە هێنراوە. گوتاری فیكریی من مومكین نییە بچێتە نێو ئەو خەڵكە بەش مەینەتەی بوون بە ئامرازی مانۆری سیاسی و گەمەی سیاسی رژێمە حوكمڕانەكان. كاتێكیش لە وڵاتێكی ئیسلامی یان عەرەبیدا قسە دەكەم، ئەوا قسەكانم تەنها دەگەنە كەمێكی زۆر كەمی هاووڵاتییان، بە تایبەتی ئەو گەنجانەی لە زانكۆدا دەخوێنن یان ئەو كەسانەی بۆیان رەخساوە ئاستێكی دیاریكراو لە خوێندن بە دەست بێنن. كەچی بزاوتە ئیسلامییەكانی ئەمڕۆ كاریگەرییەكی گەورەیان هەیە تەنانەت لە نێوەندی ئەو گەنجانەشدا كە بەر لە هەرچی ئارەزوو دەكەن لە رووی سیاسییەوە خۆیان بسەلمێنن، (بێگومان گوتاری بزوتنەوە ئیسلامییەكان زۆر بە ئاسانی دەچێتە نێوەندی جەماوەری بەرفراوانەوە).

بە كورتی، هەموو ئەو شتانەی پێشتر وتم واتە دەبێ توانای كۆمەڵگایەك بۆ وەرگرتن و پێشوازی لە بەرچاو بگیرێت. بەڵام دەشێت زۆر شتی دیكەش لە بارەی ئەو رێگرو بەربەستانە بوترێن كە ناهێڵن لە كۆمەڵگە ئیسلامی و عەرەبییەكاندا رزگاریی كولتووری بێتەدی. من لێرەدا لەسەر یەكێك لەو بەربەستانە دەوەستم:

لە واقیعدا وڵاتانی خۆرئاوا لە بابەتی فەرەنسە، لە مەسەلەی ئیسلامدا شتەكان ئاڵۆز دەكەن و هیچ نموونەیەكی مێژوویی باوەڕپێكراو ناخەنە ڕوو. من ئەمە دەڵێم و بیر لە بارودۆخی كرێكارە كۆچبەرەكان و ئەو گوتارە باوە دەكەمەوە كە لە خۆرئاوادا لە بارەی ئیسلام هەیە. بۆ نموونە لێرەدا ئیسلامێكی ریفۆرمخواز و رەخنەگرانە هەیە

کە لە بەرامبەر مۆدێرنەدا کراوەیە، بەڵام بایەخی پێنادریّ و فەراموّش دەکریّ، چونکە لە رووی سۆسیۆلۆجییەوە کەمینە پێکدەهێنن[15]. ئێمە دەزانین لە وڵاتە دیموکراتییەکاندا تا چ ئاستێك حەقیقەتی سۆسیۆلۆجی گرەو لە مافی راستەقینەی مرۆڤ دەباتەوە.

لەم ئاستەشدا عەلمانییەتی فەرەنسی کورت دەکەینەوە بۆ هێڵی بەیەکگەیشتنی موسوڵمانان و مەسیحییەکان. ناکۆکیی ئایینی تەنها لە نێوان ئایینەکاندا نییە، بەڵکو لە نێوان عەلمانییەت و ئاینیشدا هەیە بەو شێوەیەی بە درێژایی ماوەی رابردوو لە فەرەنساو وڵاتانی تری خۆرئاوادا پرۆسە کراوە. دیسان ئەو گیروگرفتانەی لێرەدا باسیان دەکەین، هەڵوێستی ئاتەئیستەکانیش دەگرێتەوە. چونکە دەبیّ هەردوو لایەنی رۆحی و رەوتە فیکرییەکان کۆك بن لەسەر پێداچوونەوە و پشکنینی شوێنگەی فاکتەری ئایینی لەم قۆناغەی ئێستای مۆدێرنەدا. بەلاّم بەداخەوە رای گشتیی خۆرئاوایی تا ئەمڕۆش وای پیّ باشە موسوڵمانەکان تەریك بکات و سەبارەت بە دیاردەی ئایینی لە ناو روانینێکی خەیاڵی و بەسەرچوودا دیلیان بکات، ئەمە سەرباری ئەوەی موسوڵمانان، بە تایبەتی لە فەرەنسەدا، ئامادەی ئەوەن بەشداری لە دروستکردنی ئەزموونێکی نوێی عەلمانییەت بکەن[16].

## پەراوێزەکان

1-واتە نابێت باوەڕدارە تەقلیدییەکان لە ئاستی ئەم مەسەلەیەدا لە باوەڕی خۆیان بترسن. لە راستیدا ئەم زانستانە نابنە مایەی ونبوونی باوەڕ، بەڵکو دواجار دەمانگەیەننە باوەڕێکی نویّ کە زۆر لە باوەڕی کۆن کراوەتە تر و فراوانترە، واتە ئیمانی تازە لە ئیمانی بەرتەسکی کۆن کراوەترە. ئیمانیش مێژووی خۆی هەیە. لێرەدا چەندین جۆر ئیمانی ئایینی هەیە: ئیمانی سەرەتایی، ئیمانی سەدەکانی ناوەڕاست، ئیمانی سەردەمی مۆدێرنە..

2-فەلسەفەی گومان لەسەر دەستی مارکس و نیچە و فرۆید سەریهەڵداوە، هەریەکە لەم بیریارانە لە بواری تایبەتی خۆیدا و بەشێوەیەکی تا ئەندازەیەك جیاواز، قووڵایی حەقیقەتی مرۆڤایەتییان دەرخستووە. بیریاری یەکەم رەخنەی لە ئایدیالیزم گرتووە لەبەرئەوەی رۆڵی فاکتەری ئابووریی لە مێژوودا فەراموّش کردووە. بیریاری دووەم لە میانی تێگەیشتنی خۆی بۆ ئەخلاق و بەها رەخنەی لە ئایدیالیزم گرتووە. بیریاری سێهەمیش لەو تێڕوانینەوە رەخنەی لە ئایدیالیزم گرتووە کە هیچ بایەخێکی بە هەرێمی (نائاگایی) نەداوەو بگرە هەر بە تەواوی بێئاگا بووە لە کاریگەریی گەورەی نائاگایی.

3-لێرەدا هەڵوێستی ئارکۆن زۆر بە روونی دەردەکەویّ لە داکۆکیکردنی لە مۆدێرنەی عەقڵی و ئیپستمۆلۆژی.

4-ئەمانە شتگەلێکن بوونیان هەیە و ئارکۆنیش نکوڵییان لێناکات، بەڵام ئەمانە سیفەتێکی هەتا هەتایی و جەوهەری و نەگۆڕ نین کە بەردەوام بە عەرەب و موسوڵمانەکانەوە نووسابن وەك هەندیّ لە ئەورووپییەکان و هەندیّ لە راگەیاندنە ئەورووپییەکان لەو باوەڕەدان. بەڵکو ئەمانە نیشانەگەلێکی رووکارین بۆ چەندین شتی زۆر قووڵ. ئەو کۆمەڵگایانەی لە دەرەوە و لە ناوەوەش هەڕەشە لێکراون و دوچاری هەموو رواڵەتێکی خراپیی پەرەپێدان بوون و بگرە هەندێجار هەڕەشەی هەژاری و برسێتییان لەسەرە، مومکین نییە ئەو چەشنە کۆمەڵگایە لە عەلمانییەت تێبگات و بایەخی پێبدات. لەم سیاقە تراژیدییەدا ئەو مەسەلە گرنگانە بیر دەچنەوە کە ئەمرۆکە دووچاری کۆمەڵگە عەرەبی و ئیسلامییەکان بووە. سا ئەگەر کۆمەڵگە ئەورووپییەکانیش دوچاری

هــەمان بــارودۆخ ببنــەوە ئــەوا بــەهاکانی عەلمانیــەت و دیموکراسیەت و مافەکانی مرۆڤیش لەق دەبن.

5–واتــە لــە ساتەوەختی هەڵبژاردندا هەلپەرستیی سیاســی وا لــە ســەرکردەکان دەکــات پرەنســیپەکانی رۆشنگەری و شۆڕشی فەرەنسییان بیر بچێتەوە و ئیدی وتاری وا بلاو دەکەنەوە کە بۆنی رەگەزپەرستی لێدێت بــۆ رازیکردنــی هەســتیاریی رای گشــتیی فەرەنســی و بەدەستهێنانی ژمارەیەکی زۆری دەنگەکان.

6–ئەمە لە کاتێکدا هەڵوێستی دژ بە موعتەزیلەکان بــە تــەواوی مێژووگــەرایی دەق رەتدەکاتــەوە و تەنانــەت نکــوڵی لــە ماتریــاڵیبوونی زمــان و پیتــەکانیش دەکــات. ئەمە هەڵوێستی کەلەپور و ئەرسەدۆکسی ئیسلامییە کە دواتــر لــە مێــژووی ئیســلامیدا ســەرکەوتنی بەدەســت هێناوە و تا ئەمڕۆش هەیە.

7–لێــرەدا، بــە بــەراورد بــە شــتەکانر تــر، مەرجــە قورسەکانی فیکر دەردەکەوێ، واتــە فیکــر دەکەوێتــە ژێــر کاریگەریی دۆخ و فاکتــەرە مادییــەکانی دەوروبــەر. فیکــر شتێك نییــە لــە دەرەوەی هــەموو مەرجەکانــەوە لــە هــەوادا مەلــە بکــات وەك ئایدیالیســتەکان و تەقلیدییــەکان لــەو باوەڕەدان، بەڵکو فیکریش مەحکومە بە کۆمەڵێ شت کە بە توندی بە سەریدا دەسەپێنرێت.

8–واتــە پاشــکەوتن و داکــەوتن نــا گــەڕێتــەوە بــۆ ســەردەمی قۆنــاغی داگیرکــاری، بــەڵکو دەگەڕێتــەوە بــۆ زەمــەنێکی دوورودرێــژی بــەر لــە قۆنــاغی داگیرکــاریش. بێگومــان داگیرکــار هــات و کێشــەکانی قــووڵتر کــردەوە و بارودۆخەکــەی خــراپتر کــرد. بــەڵام ئایــدیۆلۆجیای هاوچەرخی عەرەبی نایەوێت بە دوای هۆکارە قووڵەکانی دواکــەوتوویی عەرەبیــدا بگــەڕێت، بۆیــە هــەموو بەرپرسیارێتییەکە فڕێ دەداتــە ســەر شانی داگیرکــار و ئەو دەکات بە هۆکاری پاشکەوتوویی.

9–ئــەو بڕیــارەی ئەرسەدۆکسیەتی جــێگیر کــرد و ســەرجەمی رەوتــەکانی تــری نــاو ئیســلامی ســڕییەوە، پێیدەوترێ "عەقیدەی قادری" وەك ئاماژەیەك بۆ خەلیفە ئەلقادر.

10–ئــارکۆن دەیــەوێت بــە خۆرئاواییــەکان و بــە تایبەتیش بە فەرەنسییەکان بڵێت: بەســەو چیتر ئیسلام بەوە تاوانبار مەکەن کە لایــەنی رۆحی و لایــەنی زەمــەنی لە یەکتر جودا ناکاتەوە وەك چۆن مەسیحییەت رۆحی و زەمــەنیی لــە یەکــدی جــودا کــردەوە ئــەو کاتــەی کــە رایگەیاند "ئەوەی هی قەیسەرە بۆ قەیسەر و ئەوەیش هــی خودایــە بــۆ خــودا". لــە راســتیدا مەســەلەکان بەشێوەیەکی لەیەکچوو لە واقیعدا روویانداوە. پاشای فەرەنسیش هەروەکو حاکمی موسوڵمانان پێویستیی بە برەوپێــدانی ئــاینیی کڵێســەیی هــەبووە. سەرانســەری ئــەوروپا لــە ژێــر ســایەی سیســتمی کــۆنی رەوایــی کەهنوتیدا ژیــاوە (واتــە دەبــوو پیــاوانی ئــاینیی کڵێســە رەوایی بە سیستمی حوکم ببەخشن) ئەمە بەردەوام بوو تــا ســاتەوەختی هــاتنی شۆڕشــی فەرەنســی لــە ســاڵی 1789 داو دامەزرانــدنی رەوایەتییــەکی نــوێ کــە رەوایــی عەلمانییەتە و لەسەر بانگەوازی نێوداری مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتی دامەزراوە. کەواتە بۆچی هەمیشە جیاوازی لــە نێــوان مەسیحییەت و ئیسلامدا دەکرێت و ئیسلام فڕێ دەدرێتــە نێــو خانــەی ئــاینێکی داخراو و لــە ئایینــە کتێبدارەکانی دیکە جیا دەکرێتەوە؟ بۆچی دان بە مێژوو و بــە رووداوەکــانی مێــژوودا نــانێن بەوشــێوەیەی لــە مێژوودا روویانداوە؟

11–واتــە ســروش ســەبارەت بــە ئەوروپییــەکان بریتی بوو لە مەشروعیەتی باڵا کە سەرانسەری خەڵك بــەبێ چــەند و چــون باوەڕیــان پێــی هــەبوو. پاشــا یــان ئیمپراتــۆریش رەوایــی سروشــی بەبــەردا دەکرا و ئیدی رەعیەتــەکانیش بــەبێ هــیچ قســەیەك و بــە شــێوەیەکی خێراو خۆڕسکانە تاعەتیان پێشکەش دەکرد. پاشا یان ئیمپراتــۆر لــە پــاش وەرگــرتنی رەوایــی ســروش ئیــدی دەبوو بــە خەلیفــەی خودا لەسەر زەوی و هاووڵاتیانیش

قــەرزی تاعــەتکردنیان لەســەر دەبــوو و هــیچ کــەس نەیدەتوانی لەو مەسەلەیەدا گفتوگۆ بکات، ئەمە بریتی بـوو لـە "قـەرزداریتیی مانـا" (مدیونیـة المعنـی)، ئـەم قـەرزداریتیی مانایـە کـە بـە درێــژایی چـەندین سـەدە هـەژموونی هـەبووە، لەگـەڵ هـاتنی شۆڕشـی فەرەنسـیدا، تێکشـکاوە و بـەرەو کاڵبوونـەوە رۆیشتووە. لـە راسـتیدا شکست پێهێنانی "قەرزداریتیی مانا" لەو کاتەدا رووی داوە کــە جــەنگێکی بێئامــان لــە نێــوان ئاینــەکان و مەزهەبەکانـدا هەڵگیرساوە، بـە تایبـەتی لـەو دەمـەدا کـە بیروبــاوەڕی چــەرخی رۆشــنگەری بڵاوبۆتــەوە وەك کاردانەوەیەك بۆ ئـەو قەسابخانەیەی جەنگە ئاینییەکان نایانەوە و هەروەها لە بەرامبەر دەمارگیریی ئاینیشدا. لە پـاش ئـەو قـەرزداریتی مانایـە، قەرزداریتییـەکی نـوێ لـەدایکبووە کـە خـۆی لـە "مـافی دەنگـدانی گشـتی"دا دەنوانـد. ئەوسـا سـەرۆکی هەڵبـژێردراو بـە دەنگـدانی گشتی، خۆی بەسەر ئەو هاووڵاتییانەشدا دەسەپاند کە دەنگیان بە دژەکەی داوە و لە هەڵبژاردندا دەرنەچووە، بــەم پێیــە هــەمووان قــەرزاری تاعــەتی ســەرۆکی هەڵبژێردراون. ئەمە چونکە سەرۆکە تازەکە بەشێوەیەکی دیمـوکراتی زۆرینـەی دەنگـی بەدەست هێنـاوە تەنانـەت ئەگەر یەك تاکە دەنگیشی لـە نەیارەکـەی زیـاتر بووبێت. ئـەو سـەرکردەیەی خـۆی بـۆ پـاڵاوتن هەڵبـژاردووە و لـە دەنگدانی گشتیدا دەرنەچووە، ناچارە بـە ئەنجامـەکانی دەنگدانی گشتی رازی بێت و رێزی ئیرادەی گەل بگرێت.

12-بێگومـان لێـرەدا ئـارکۆن بـە هـیچ شـێوەیەك نـارازی نییـە لـە گەمـەی دیمـوکراتی و لـە پلـورالیزمی سیاسـی، ئـەو پێیوایـە دیموکراسـییەت دەسـتکەوتێکی گەورەیە و مومکین نییە پاشەکشەی لێبکرێت و ئەمڕۆکە کۆمەڵگـەکانی ئێمـە پێویسـتییەکی ئێجگـار زۆریـان بـەم چەشنە سیستمە هەیە. ئارکۆن تەنها ئاماژە بۆ ئەو فێڵو گەمانە دەکات کە تەنانەت لە رژێمە دیموکراتییەکانیشدا لەلایــەن هەنــدێ لــە کــۆمپرادۆر و خــاوەن پــارەو دەسـەڵاتەکاندا ئـەنجام دەدرێت. دەنا مـرۆڤ لـە کۆمەڵگـە ئەورووپییەکانـدا و لـە پـاش شۆڕشـی فەرەنسـییە وە لـە گشـت بڵندگەراییـەك (ترانسـندێنتال) دابـڕاوە و مـرۆڤ خۆی بووە بە موتەعالی (ترانسندێنتال).

بەڵام ئەمڕۆ ئـەم دۆخـە کۆمـەڵێ ئیشـکالات دەخاتـە روو، ئەمڕۆ بیریارە فەرەنسییەکان باسـی پێویسـتبوونی گەڵاڵـەبوونی "عەلمانییـەتێکی نـوێ" دەکـەن کـە دەبـێ رەهەندی رۆحی لە ژیانی مرۆڤدا لەبەرچاو بگیرێت.

13-خەلیفــە کەســایەتییەکی "خوداوەنــدی" دەنوێنێت نەك بەشەری، بە تایبەتی لە چاوی جەماوەر و خەڵکی رەش و رووت. لـە چاوی ئیماندارەکانـدا خەلیفە مەشروعیەتێکی خوداوەندیی هەیە نەك مەشروعیەتێکی بەشەری.

14-ئارکۆن باوەڕی وایە عـەرەب و موسوڵمانەکان بە گشتی لە دۆخێکدا دەژین دوچاری دوو دابڕان بوونە نــەك یــەك دابــڕان: دابڕانــی یەکــەم دابڕانێکــە لەگــەڵ کەلــەپووری داهێنەرانــەیان لــە چــەرخی کلاسـیکیدا، دابڕانــی دووەمــیش دابڕانــە لەگــەڵ دۆزینــەوە و دەسـتکەوتە گـەورەکانی مۆدێرنـەی ئـەورووپی کـە دوو سـەدە زیـاترە هاتۆتـە ئـاراوە. ئەمـە وایکـردووە دۆخـی کولتووریی ئەمڕۆی موسڵمانان دۆخێکی زۆر زەحمەت و زۆر هەژار بێت. جا بـە هـۆی ئـەم دابڕانـە دوو لایەنییـەوە لەگـەڵ چرکەسـاتەکانی مۆدێرنـەدا، بەشـی هـەرە زۆری دۆسییەکان داخراون و تا ئەندازەیەکی گـەورەش گرفتی خستنە رووی عەلمانییەت ئەستەمە.

15-مەبەستی ئارکۆن ئەوەیە کە رەوتی تازەگەرا و رەخنەگرانــەی نــاو فیکــری ئیســلامی، نــەك تــەنها لــە کۆمەڵگـە ئیسـلامی و عەرەبییەکانـدا فـەرامۆش کـراوە، بــەڵکو لــە وڵاتێکــی وەکــو فەرەنسەشــدا بایــەخی پــێ نەدراوە. هۆیەکەیشی ئەوەیە فەرەنسییەکان پێیان وایە موسـوڵمانان بـە سروشـتی خۆیـان کەسـانی کۆنـەپارێز و تەقلیدین، پاشان مەسەلەی پێشکەوتن یان پاشکەوتنی

موسـڵمانەکان هـیچ گرنگییـەکی لـەلای ئەوانـدا نییـە. ئەوەی بە پلەی یەکەم بەلای ئەوانەوە گرنگە بریتییە لە بەدەســـتهێنانی دەنگـــی موســـوڵمانە فەرەنســـییەکان هەرچـەند کۆنـەپارێز و دژ بـە مۆدێرنـەی فیکـریش بـن. بگرە رۆشنبیرە موسوڵمانەکانی نیشتەجێی فەرەنسـەش لەلایـەن دەســـەڵاتدارانەوە بایـەخیان پێنادرێـت چـونکە ئەمانــە - بــە تێــڕوانینی هەنــدێ توێــژی دەســـەڵاتی فەرەنسی - کەمایەتییەکی سۆسیۆلۆجین.

16-ئەمانە لە میانی ئەزموونی مێژوویی خۆیاندا خزمـــەتی خۆیـــان پێشـــکەش دەکـــەن و عەلمانییـــەت دەوڵەمەند تر دەکەن و لە ناوی نابەن وەك هەندێ کەس لەو باوەڕەدایە.

## سەرچاوە

ئەم لێکۆڵینەوەیە بەشێکە لە پاژی دووەمی کتێبی (د. محمد ارکون، العلمنة و الدين: الاسلام - المسيحية - الغـرب، ترجمـة: هاشـم صـالح، دار السـاقي - ط 3 - 1996) ئێمە تەواوی ئەم کتێبەمان کردووە بە کوردی و لە دەرفەتێکی نزیکدا چاپی دەکەین.

# رۆژێك لە ئەسینای دێرین

ولیەم داڤیس

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

## 1

### پێشەکی

ئەگەر بەهۆی ئەفسونێکەوە بگەڕێنەوە بۆ سەدەی چوارەمی پێش زایین و لەگەڵ رێبەرێکدا گەشتێك بەناو شاری ئەسینای دێریندا بکەین، چی دەبینین و چی دەبیستین. لەم گەشتە ئەندێشەییەماندا زیاتر ئەو شتانەمان وەرگرتووە کە بە دەگمەن سەرنجیان لێدراوە، یان پشتگوێ خراون. هەندێجاریش خۆمان لە لێکدانەوەی درێژ پاراستووە، نمونەی وەهامان هەڵبژاردووە کە بایەخێکی ئەوتۆیان پێ نەدراوە. بە هیوای ئەوەی خوێنەر رێکەوتی هیچ هەڵەیەکی زەق نەکات.

ساڵی 360 ی پێش زایین ساڵێکی لەبارە بۆ سەردانەکەمان، نەك لەبەرئەوەی شتێکی تایبەتی لەو ساڵەدا روویدابێت، بەڵکو چونکە لەو ساڵەدا ئەسینا لە رووی بیناسازییەوە تەواو بووەو شتێکی ئەوتۆی بە ناتەواویی نەماوەتەوە، ژیانی کۆمەڵایەتی و مەدەنی تێیدا لە باشترین حاڵیدا بووە، دەستوری دیموکراسی لە هەرەتی تین و تاودا بووە، چەند نیشانەیەکی دەرەکیش لەمەڕ ئەو وێرانکارییەی مەکەدۆنییەکان لە دوای خۆیان جێیان هێشتووە، هێشتا هەر بەرچاون.

هەوڵم نەداوە خۆم بدەم لە راستییەك یان گریمانەیەك کە تا رادەیەکی باش لای ئەو خوێنەرەی زانیارییەکی سەرەتایی دەربارەی یۆنان هەیە، باش روون نەبێت. واتە ئەو جۆرە زانیارییانەی دەشێت لە قوتابخانەیەکی ناوەندی باشدا بخوێندرێت، لەو قوتابخانانەی مێژووی یۆنان دەخوێنن. ئەمەش بە شێوەیەکی سروشتی وای کردووە کۆمێنت بدەین و وەسفی شتی وەها بکەین، کە لای خوێنەری پێشکەوتووتر، ئاساییە.

نوسەر قەرزاری چەندان کاری گرنگە دەربارەی یۆنان کە بە زمانی ئینگلیزی، فەرەنسی، یان ئەڵمانی نوسراون، دەربارەی "کەلوپەلی تایبەتی" و "ژیانی گشتی"، هەروەها چەندەها ئینسایکلۆپیدیاو فەرهەنگی کلاسیکی و گەلێك تێزو لێکۆڵینەوە دەربارەی تۆپۆگرافیای ئەسینا لە ماوە جیاجیاکانی کەلتوری ئاتیکادا. دەشێت بڵێین

ئەو مادانەی لەو سەرچاوانەوە دەستمان کەوتوون بە کەڵکی ئەوە هاتوون کە بە وردی لە نوسینەکانی نوسەرە یۆنانییە دێرینەکاندا تاقییان بکەینەوەو مشتومالّیان بکەین.

بەسەربردنی پشوویەکی خۆم لە ئەسینا هۆیەکی ترە بۆ ئەو نەزکەی *impression* لەمەڕ کاریگەریی دیمەنی ئاتیکا لەسەر هەلومەرجەکانی ژیانی ئەسینا وەرمگرتووە، نەزکێك کە هەوڵمداوە لە سەرانسەری ئەم کتێبە بچووکەدا لەگەڵمدا بمێنێتەوە.

بە قووڵی سوپاسی خاتوو فانی دەیڤید گیفۆردی خوشکم دەکەم بۆ ئەو رەخنە سودمەندانەی لە رەشنوسی کتێبەکەمی گرت، هاوسەرەکەم بۆ ئامادەکردنی وێنەکانی سەر گوڵدان و گۆزە یۆنانییەکان کە زیاتر روونکردنەوە دەبەخشن، هەروەها هاوڕێ و هاوکارم پرۆفیسۆر چارلس ئەی ساڤاگێ، کە بە وردی و سنگفراوانی نوسینەکەی خوێندەوە. سوپاسیش بۆ هینری هۆڵت و کۆمپانیاکەی کە دەرفەتیان دام هەندێك شت لە "یۆنان و رۆمان"ەکەی ڤۆن فالکێس بخوازمەوە.

### بایەخی ئەسینا لە مێژووی یۆناندا

ئێمە لە نزیکەی هەموو ئایدیا بنەڕەتییەکانماندا دەربارەی هونەر، ئەدەب، فەلسەفە، بگرە لە راستیدا لە بەشی زۆری ژیانی هزریماندا، قەرزاری یۆنانییەکانین. مێژوونوسەکانمان فێرمان دەکەن کە ئەو یۆنانییانە، یەك نەتەوەی یەکگرتوو نەبوون. ئەوانە لە چەندان دەوڵەتشاردا ژیاون کە کەم تا زۆر هەریەکەی بایەخی خۆی هەیە، هەندێك لەو دەوڵەتشارانە کەم تا زۆر بەشدارییان لە شارستانێتییەکەماندا کردووە. بۆ نمونە سپارتە چەند وانەیەکی بەنرخی بۆ جێهێشتووین دەربارەی ژیانی سادەو دڵسۆزیی و نیشتمانپەروەریی، بەڵام بە زەحمەت تاقە شاعیرێکی مەزنی تێدا هەڵکەوتووەو هەرگیز فەیلەسوفێك یان پەیکەرتاشێکی تێدا هەڵنەکەوتووە. کاتێك بە وردیی و لە نزیکەوە رادەمێنین، دەبینین ژیانی شارستان لە یۆنان، لە ماوەی ئەو سەدانەدا کە بەشی زۆری ژیارەکە بەرهەم هاتووە، چەقەکەی لە ئەسینادایە. بەبێ ئەسینا مێژووی یۆنان سێ لەسەر چواری رەونەق و بەهای خۆی لە دەست دەدات و ژیان و هزری مۆدێرنیش هەتا بڵێی هەژارتر دەبێت.

### بۆچی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەسینا ئەوەندە پرشنگدارە؟

چونکە، بەشداریکردنی ئەسینا لە ژیانی ئێمەدا هەر زۆر گرنگە، چونکە ئەوان دەستیان گەیشتووە (وەك یۆنانییەکان دەڵێن) بە نزیکەی هەموو سنورەکانی "راستی، جوانی، چاکە"، گومانی تیا نیە کە ئەو هەلومەرجانەی بلیمەتیی ئەسینا تێیاندا گەشەی کردووە شایستەی رێز و بایەخپێدانی ئێمەیە. چونکە بە دڵنیایی کەسانی وەك سۆفۆکلێس، ئەفلاتون، فیدیاس بونەوەری تاك و تەراو گۆشەگیر نەبوون، کە بلیمەتی خۆیان بەجیا لە کاریگەریی ژیانی چواردەوری خۆیان، یاخود بە پێچەوانەی ئەو ژیانەوە بەدیهێنابێت، بەڵکو ئەوانە بەرهەمی پێگەیشتوی کۆمەڵگایەك بوون، کە لە بالادەستی و لاوازبوونیشیدا، هەندێك لە سیماو نمونە زۆر بەنرخەکانی ناو جیهان دەخاتە روو. بۆ تێگەیشتن لە شارستانێتی ئەسینایی و بلیمەتییەکەشی، هێندە بەس نییە هێڵە درشتەکانی مێژووی سەردەمەکان، جەنگەکان، یاساکان،

یاسادانەرەکان بزانین. پێویستە ئەسینا ببینین، وەك چۆن کەسێکی ئاسایی بینیویەتی و ژیانی رۆژانەی تێدا بەسەر بردووە, رەنگە ئەوکاتە بتوانین بە راستی تێبگەین کە لە سەردەمی کورتخایەن و قەشەنگی ئازادی و خۆشگوزەرانیی[1] ئەسیناییەکان چۆن بووە. چونکە ئەسینا توانیویەتی گەلێك لەو پیاوانە بهێنێتە بەرهەم کە لە مێژووی شارستانێتیدا جێگایەکی وەهایان بۆ خۆیان گرتووە کە هەرگیز لە دەستی نادەن.

## بچوکی و بێفەڕیی ئاتیکا

ئاتیکا لەچاو وڵاتانی مۆدێرندا, وڵاتێکی بچووك بووە, تاکە شاری گەورە تێیدا ئەسینا بووە. رووبەری خاکی ئاتیکا بە زەحمەت دەگاتە 700 میلی چوارگۆشە, ئەگەر دورگەی سەربەخۆی سالامیسیشی بخەینە سەر, ئینجا 40 میلی چوارگۆشەی تریشی دەچێتە سەر. ئاتیکا لە بچوکترین ویلایەتی ئەمریکا بچووکتر بووە (دورگەی رۆد = 1250 میلی چوارگۆشە). زۆربەی هەرێمەکانی ناو ویلایەتەکان لە ئاتیکا گەورەترن. لە راستیدا ناوچەیەکی سێگۆشەیی پڕ لە گردۆڵکەی بەردین و رەقەڵان کە خاکە پەرت و بڵاوەکەی نێوانی گردەکانی بەرەو دەریای ئاگینیا درێژ دەبێتەوە, وەك ئەوەی بەردەوامبونی هەرێمێکی تەخت و پانتری بۆیۆتیا بێت. بەو بچووکییەی خۆیەوە گردۆڵکەکان لە خۆراوە دای دەخەن و دەریاکانیش لە باکور و باشورەوە تەسکی دەکەنەوەو یەکێتی و دابڕاوییەکی پێدەدەن. ئاتیکا دورگە نییە، بەڵام تەنها لە دەریاوە دەتوانرێت داگیر بکرێت، یاخود بە بەرەنگاربوونەوەی هێز کە لە چیاکانەوە بەرەو بۆیۆتیا یان میگارا درێژ ببێتەوە. بەمجۆرە بۆیۆتیا لە باقی یۆنان جیابۆوە.

ئەفسانەکان دەگێڕنەوە چۆن کاتێك دۆرییە نیمچە کێوییەکان بەهێز خۆیان بەرەو باشور کوتاوەو باڵیان کێشاوە بەسەر زۆربەی خاکەکەدا، بەڵام هەرگیز نەیانتوانیوە بگەنە ئاتیکا، دواتریش ئەسیناییەکان شانازییان بەوەوە دەکرد کە خۆیان لەوکاتە بەدواوە داگیر نەکراون, بەڵکو بە زەویدا رەگیان داکوتاوەو باپیرانیان تا بیست نەوە هەر هەمان خاکیان بەدەستەوە بووە.

ئەم ئاتیکا سێگۆشەییە خەسڵەتی چاك و خراپی خۆی هەبووە. بەشی زۆری رەقەڵان و بەردەڵان بووە. تەنها دامێنی خوارەوەی بەردەڵانەکان خاکی کشتوکاڵی هەبووەو کە زۆرجار ناوچەی بەیار و چۆڵ بووە. وەرزێرەکانی ئەسینا رەنجێکی زۆریان دەدا تا خەلەیەکی کەمیان بۆ بێتە بەرهەم. تاکە بەرهەمێك کە توانیبێتیان بینێرنە دەرەوە زەیتون بووە (چونکە زەیتون دەتوانێت لەسەر خاکی بێپێز و لەبەر بارانی کەمدا گەشە بکات) هەنگوینی شەمەتلێنکەشیان هەبووە.

## سروشتی قەشەنگی ئاتیکا

لەگەڵ ئەوەشدا ئاتیکا لە بەرامبەری بێفەڕییە کشتوکاڵییەکەیدا، خەسڵەتی دیکەی دڵگیری زۆر بووە. یۆنانییەکان سەراسیمەی کەش و هەوای خۆش و جوانی سروشتەکەی بوون، دەریاکانی، چیا بەردینەکانی، رەنگە لە هەموو ناوچەکانی دیکە دڵگیرتر بووبێت، لە دەوری کەنارە بەردینەکانی کە گابەردەکانی ورد بوون و چەو و لم و تلەبەرد رژاونەتە سەریان، لەگەڵ دورگە بچووك و پەرت و بڵاوەکانی بەناو دەریای ئیجەی شیندا، شکۆدارترین ناوچەی ناو زەریا بوو لە جیهاندا. لە دوورەوە ئاوە ئازورییەکە[2] کە هەندێجار کەف دەچرێنێت و هەندێجاریش پڕێتی لە دۆلفین و

سەرقاڵی گەمەو بازبازێنن، لە ئاسۆدا پانتایی ئاوەكە لەگەڵ ئاسمانی رۆشندا لێكدەدەن و لەوێوە لە دورگەكانەوە چرستانی درەختە سەوزەكان دیارن و "دەڵێی كۆمەڵێك دەمامكن بە سیمای قولایی بریسكەدارەوە".

لە ژووروی دەریاوە كەوانەی رەنگینی ئاسمان كشاوە .. كەشوهەوای بریسكەی رەنگاورەنگ، ورشەو پرشە دڵی مرۆڤ مەست دەكەن. ئەسینایيەكان شانازییان بە كەشوهەوای خاكەكەیانەوە دەكرد. شاعیرەكانیان بە شادمانی ستایشیان دەكرد، هەر بۆ نمونە یۆرپیدێس[3] كە باسی ئەوە دەكات چۆن هاوەڵە هاوشارییەكانی چێژ لە بوون وەردەگرن، دەڵێت:

هەردەم بریسكەی خاوێن و زۆری ناو ئاسمان
دەڵێی بە هێواشی دەدات لە شەقەی باڵ

## چیاكانی ئاتیكا

سێهەمین رەگەزی مەزن لە پاڵ دەریاو كەشوهەوای ئەسینادا, چیاكانی بوو. یەك لە دوای یەك گردۆڵكە كەچەڵ و گرویكان پاڵیان داوە بە یەكترییەوە، خاكەكە لەت دەكەن بۆ كیڵگەی بچووك بچووك لە قەدپاڵ و دامێنی خۆیاندا. ئەو كێوانە بەرامبەری ئاسمانی ورشەدار رەق راوەستاون و دەڵێی لە رۆژانی دێرینەوە جێماون، ئەو رۆژانەی لە هەناوی زەوییەوە هەڵتۆقین. هیچكام لەو كێوانە زۆر بەرز هەڵنەچوون: هیمیتۆس بەرزترینیانەو نزیكەی 3500 پێ بەرزە، وەلێ بەهۆی نزیكییانەوە لە دەریا زۆر بڵند دیارن، نەك وەك ئەو قنچكە گردانەی لە خاكێكی تەختدا دەروێن، تەنانەت نەویترین گردی ئەوێ بە سەربەرزی و شانازییەوە راوەستاوە.

رەنگاورەنگیی ئەو گردانە بێسنورە، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ رەنگی بەردەكانیان، بۆ روانینیان بەسەر دەریادا، بۆ سەعاتە جیاجیاكانی رۆژ. بەهاران سەوزە گیای تۆخ دایان دەپۆشێت و پێش گەرمای هاوین دەپوكێتەوەو رەنگێكی قاوەیی كاڵ یان خۆڵەمێشی جێدەهێڵێت. بەڵام هەر تۆن و هەر رەنگێك بن، هەمیشە بریسكەو چریسكەیان دێت. لای ئەسینایيەكانی ئەوێ ئاسمانی شین و دەریای شین و شینە بەردی زەبەلاح پێكەوە كاكێشانی رەنگە گۆڕاوەكان بوون، بە بەراورد لەگەڵ بریسكەی دینەنی باكور یان خۆراوایدا كاڵ و روون دێتە بەر دیدە. ئەسینایيەكان جوانی سروشتییان لەگەڵ هەوای خاوێندا هەڵمژیوە.

## كازیوەی ئەسینا

ئەسینایيەكان ئالودەی هەتاوكەوتن بوون، هیلیۆسی خواوەندی خۆر لای نیایشكەرانی رێزدار بوو. لە ئەسینای ئەمرۆدا، ساڵانە 179 رۆژ، خۆر ئازادەو هەور بەری نەگرتووە، 159 رۆژی تریش لە نیو سەعات زیاتر هەتاو لە پشتی هەورەوە بزر نابێت[4]. بێشك ئەوساش ئاسمان لەمە زیاتر هەوراویی نەبووە. كەچی سەرباری ئەم هەموو هەتاوەو ئەم كەشە باشورییەش، بە دەگمەن گەرما هەراسانی كردوون. دەریا هاورێیەكی باشیان بووە، شەماڵی شێداری بۆ دەهێنان. رەنگە لە زستانی كورتخایەندا كەمێك بەستەڵەك، پروشەی بەفر و بارانی بەخورەمیش هەبووبێت. بەڵام باقی رۆژەكانی ساڵ، رۆژی زێرین یەك لە دوای یەك ریزیان دەبەست، خۆر و شنەی دەریا هاورێی یەكتریی بوون.

كەش و هەوای مامناوەندی ئەسینایيەكانی لەوە پاراستووە كە خەریكی جەنگێكی سەخت بن دژی سروشت، وەك خەڵكانی باكور پێوەی سەرقاڵ بوون. ژیان و شارستانێتی ئەوان لە هەوای كراوەدا

پەرەی سەندووە. لە لایەکی تریشەوە، شەماڵی دەریای گورجکەرەوەی چالاککەر رزگاری کردوون لەو سستی و تەمەڵییەی زۆرێك لە گەلانی باشوری لەناو بردووە. کەم و کورتی خاك وای لێکردوون ئەوپەڕی رەنج و تەقەللا بدەن بۆ گوزەران کردن، بۆیە پەلاماری دەریایان دا بۆ خۆراك و ریسك و سەرکەشی و سامان. لە دەریادا ئیمپراتۆرییەتە مەزنەکەیان دامەزراند.

### تۆپۆگرافیای شاری ئەسینا

بە شێوەیەکی گشتی خاکی ئاتیکا بەرزی نزمی زۆرە، بەڵام ئەی شاری ئەسینا؟ ئەسینا لە دەشتێکدا لەسەر پشت لێی راکشاوە، تا رادەیەك لە بەشی باشوری ناوەڕاستی ئاتیکادایەو نزیکەی چوار میل لە دەریا کشاوەتە دواوە. ژمارەیەك شاخ و داخ پێکەوە لە گۆشەیەکی ناڕێکەوە لەگەڵ کەنداوی سارۆنیکدا لە باشورەوە دێن. لە خۆرەڵاتی ئەسیناوە لێواری بەردینی تیژو زبری هیمێتۆس درێژ دەبێتەوە کە چۆڵ و هۆڵترین و رەقەنترین چیایە لە ئاتیکایە، جێگای پوورە هەنگ و رانە مەڕو بزنە، هەروەها (بە پێی ئەفسانە ئاینییەکان) پڕێتی لە پەری و حۆریی بێشومارو سەتایەرەکان. بەرەو خۆراوا چیای نزمتری قاوەیی درێژ دەبنەوە، ئێگالۆس کە "رێگای پیرۆز" ی لێیە بە دەرچەیەکی ئاساندا بەرەو ئیلیۆسێس درێژ دەبێتەوە کە تاقە شاری گەورەی ئاتیکایە لە دەرەوەی ئەسیناو بەندەرەکانی لە پشتەوەی دەشتاییەکەدا هەڕەمێکی بەشان و شەوکەتی لێیە، کە لە هیمیتۆس نزمترەو لە ئیگالیۆس بەسامترە، لوتکەکانی پەڵەپەڵەی سپییان تێدایە و لە خۆراوادا پەمەیی دەنوێنن. لە کەلێن و درزەکانییەوە مەڕمەڕ هەیە و ئاسان دەستی پەیکەرتاش دەکەوێت. نزیکتر لە سێنتەری دەشتەکەوە گردۆڵکەیەکی بچووك و دابڕاو هەیە، پێی دەوترێت گردی لیکابێتۆس، لوتکەی ئەم گردە بە فیزێکەوە دەڕوانێتە سەربانەکانی ئەسینا. نزیکەی یەك میل بەرەو باشوری خۆراوای لیکابێتۆس بانێکی بەردین هەیە، ئەمەیان گردۆڵکە نییە، بەڵکو زیاتر لە گابەردێکی زەلامی خواروخێچ دەچێت. پێچاوپێچێکی ناڕێکە و نزیکەی هەزار پێ درێژ و پێنجسەد پێش پانە، لوتکە تەختەکەشی سێسەدو پەنجا پێ لەسەرووی دەشتەکەوەیە. دەشێت ئەندێشە بکەین ئەم بیابانە بەردینە کاتی خۆی لە لایەنی تیتانەکانەوە هاوێژرابێت بۆ ناوەڕاستی دەشتی ئاتیکا، تا ببێت بە یەکێك لە جێگا هەرە نێودارەکانی جیهان، چونکە ئەوە شوێنی ئەکرۆپۆلیسی ئەسینایە. رەنگە دواتر بایەخی ئەمەمان بۆ روون ببێتەوە. لە ئەکرۆپۆلیس و چەند گردۆڵکەیەکی بچووکتری ئەو نزیکانەوە، خاکەکە بە نەرمی بەرەوخوار لێژ دەبێتەوە تا دەگاتە کەنداوی سارۆنیك.

ئەمانە سیما درشتەکانی دەرەوەی ئەسینا بوون. دەشێت پشتێنە سەوزە تێرەکەی باخەکانی زەیتونیشی بۆ زیاد بکرێت کە لە دامێنی خۆراوای دەشتەکەوە دیارن، لەوێ کیفیسۆس (لەناو کانی و سەرچاوەکانی ئەسینادا تەنها ئەم لە هاویندا وشکی نەدەکرد) بەرەو خوار دەڕوات بۆ ئەوەی بڕژێتە دەریاوە. هەروەها لە خۆراوای‌شارەکەدا پشتێنەیەکی تەسکتری زەیتون هەیە و ئیلسیۆسی تەنکاوتر بەوێدا دەکشێت و لەناو کێڵگە تینووەکاندا بزر دەبێت. کەواتە دەریا، بەرد، ئاسمان، پێکەوە بە جۆرێك دەوری ئەسینایان گرتووە کە رەنگە هیچ شارێکی تری جیهان وا نەبێت. دیمەنە سروشتییەکە خۆی لە پێش دیدە هارمۆنیایەکی قەشەنگی تێدایە. رەنگەکان و هێڵ و

خەتەکان مۆدێلێکی شکۆدارن بۆ پەیکەرتاش و نیگارکێش، مایەی سروشی شاعیرە. گەر ئەسینا پێگەی رەچەڵەکێکی نێوداریش نەبوایە، ئەوا هێشتا هەر یەکێك دەبوو لە دڵگیرترین شوێنەکانی جیهان. هەر بۆیەشە نیشتەجێکانی شار شانازییان بە شارەکەیانەوە دەکرد و بە تاجەگوڵینەی سەری ئیستیفانۆسیان دا دەنا.

### ساڵی 360 ی پێش زایین، ساڵی سەردانەکەمان

ئەو رۆژانە شارەکە لەوپەڕی شکۆدارییدا بوو. لە ساڵی 360 دا، ئەسینا لە جەنگی پیلۆپۆنیش ساڕێژ ببوو، بە خۆیدا هاتبووەوە، هێشتاش چەتە دەریاییە مەکەدۆنییەکان سەریان هەڵنەدابوو. زۆربەی زۆری بینا مەزنە گشتییەکان تەواو ببوون، هیچ نیشانەیەکی رمان و پشێویی نەدەبینرا، ئەو کەشتیگەلە گەورەیەشی نەمابوو کە لە سەردەمی پێریکلێسدا هەیبوو، بەڵام هێشتاش کەشتیگەل و سوپاکانی بەرچاو بوون. بەندەرەکان پڕ بوون لە بازرگانی، فەیلەسوفەکان لە بێستان و داڵانەکاندا وانەیان بە قوتابییەکانیان دەووتەوە، دەستورە دیموکراسی زۆر کاراو چالاك بوو. بە تێڕوانینێکی سرك و پشکنەرانەوە دەچینە ناو شارو سەیری دەوروپشتی خۆمان دەکەین.

## سەرەتای دەرکەوتنی ئەسینا

### ئاپۆرای بەیانیان بەرەو ئەسینا

بەیانییەکی زۆر زووە. تازە هەتاو گەیشتۆتە سەر لوتکە درێژەکانی هیمیتۆس، چەپکێك تیشکی شکاوەی سوور بەسەر دەشتی ئاتیکادا پەخش دەکات و بە ئاگرێکی زیندوو دەست دەدات لە لێژکانییەکانی بەرامبەری ئێگالیۆس. ژیان لە دەرەوەی شار دەستی کەوتۆتە جووڵە. زۆر پێش ئەوەش بەلەمە بچووکەکانی بازاڕ لە بوارە تەك و رێکەکەی سالامیسەوە گەیشتوون و بەرهەمی جوتیارانی سالامیسیان هێناوە، جوتیاران و وەرزێرانی شوێنەکانی تری دەشت و دامێنی چیاکان بەڕێوەن بەرەو بازاڕ . لەبەر تیشکی هەتاودا، مەڕمەڕی پەرستگاکانی ئەکرۆپۆلیسی سەرکەش لەبەردەمی ئەو جوتیارە بەپەلانەدا دەبرسیکێتەوەو لە دوورەوە رم و خودە مسینەکەی پەیکەری پرۆماخۆسی ئەسینا دەبینرێت لە پێشیانەوە پرشنگ دەدات و وەك جۆرە مەشخەڵێکی بەیانیان ئاماژە دەکات بەرەو شارەکە. لە پیریاوسەوە کە بەندەرە شارۆچکەیەکە دەنگی هەراو زەنای بارکردن و داگرتنی کەلوپەل دێت، وەلێ ناتوانین بگەینە ئەوێ. دوای ئاپۆرای وەرزێرەکان دەکەوین بەرەو بازاڕ.

لە راستیدا، رێگای راستەوخۆ لە پیراوسەوە بەرەو ئەسینا نایەتە بەرچاو، چونکە بە نێوانی "شورا درێژەکان" دا تێدەپەڕێت کە دوو دیواری تەریب و بڵندن و نزیکەی چوار میل لە ناو شارەوە دەگاتە بەندەرەکە. لە کاتی جەنگدا، ئەم رێگایە دەرچەیەکی پارێزراوە بۆ خەڵکی ئەسینا، بۆ ئەوەی تووشی گەمارۆدان نەبن و زەخیرەو پیتاکیان لێ نەبڕێت. رێگایەکی دەرەکییش هەیە لە کێڵگەکانی خۆراواوە دەگاتەوە ناو شار، دەتوانین ملی ئەم رێگایەیان بگرینە بەر. ئەوانەی ئەم رێگایە دەگرنە بەر خەڵکانێکی ئەریستۆکرات نین، وەلێ هەرچۆنێك بێت ئەسینایین. لێرەوە شوانێك رێ دەکات، پێستەی پۆشیوەو لە بری پووزەوانە پارچە خوری لە پووزەکانی هەڵپێچاوە، لەبەردەمییەوە سەگەکەی کە لەگورگ دەچێت بەڕێوەیەو مێگەلێك لە مەڕی رەش یان بزنی سەرکێشیان بەرەو بازاڕ داوەتە پێش، بارەو باعەیان بەرز بۆتەوە. لە دوایەوە

جوتیارێکی پەرپووتی ردێن هاتوو کە زۆر دەمێکە هێشـــتوویەتییەوە، بـــە ســـواری کـــەرێك یـــان ئێســـترێکەوە کـــە عەرەبانەیـــەکی لـــێ بەســـتراوەو تایەکانی رەق و تەقن، بەرهەمی جۆراوجۆری خۆی بـەرەو بـازاڕ دەهێنێت. دەبێت بڵێین رێگاکـە لـەبار نەبوو، هەموو خاوەن عەرەبانەکان گرفتی خۆیانیان هەیە، بۆیە دەبیستین جارجارە قسەی بە توێکڵ و بێپـەردەو تـوانج و تەشـەری ئابڕووبەرانـە دەگێرێتـە هێرمێس و خوداوەندەکانی تری رێگاوبان. بەیانیان زوو بازاڕ سیخناخ دەبێت و هـەر دواکـەتنێك مانـای زیانلێکەوتنـە. خـەڵکی تـریش هـەن بـەرێوەن بـەرەو شـــار: گوندنشـــینێك بـــە خـــۆی و قەفـــەزی پەلەوەرەکانییـەوە، هـات و هـاواری شـوانی بـەراز، دەریاوانـە ئەسمـەرەکانی خـۆرەلات، بـە خۆیـان و ئەڵقەی گوێیانەوە، فرۆشیارە فینیقییەکان بەخۆیان و کەلوپەلەکانیانەوە لە پیراوسەوە هاتووە، پیاوانی بـەرێزی شارنشـین بـە عـەباو جبـە سـپییەکانیانەوە دەڕۆن و تێدەکۆشن بۆ ئەوەی قوڕاویی نەبن، رەنگـە گروپـی بچـووکی سەربازیشـیان تێـدا بێـت، کـە لـە جێگایـەکی بـەیانی گەڕاونەتـەوەو خزمـەتی خۆیـان تـــەواو کـــردووەو بـــە تەقـــەو رەقـــەی رم و قەڵغانەکانیانەوە رێ دەکەن.

### دەروازەی شارو دیمەنی شەقامەکان

لەبـەردەمی دەروازەکـەی پیراوسـدا ئاپۆراکـە زیاتر دەبێت، چونکە نزیکەی هەموو ئەو ناوچانەی کە دەستیان دەگاتە ئاتیکا، رۆژانە هەموو بەیانییەك لـە بـازاڕی ئەسـینا ئـیش دەکـەن. دوای تێپـەڕین لـە دەروازەکـە رێگایـەی خـۆش و رێـك بـەرەو بـازاڕ دەیانبـات، بـەلام بەرەوپێشچـوونی قەرەباڵەغییەکـە خاو دەبێتەوە. ئەمە یەکێکە لە رێگا سـەرەکییەکانی شار، لەم ساتەدا لێوانلێو و سیخناخە لـە خـەڵك. لـە ئەسـینــاش وردە وردە خــەڵك بێداربوونەتــەوە و جمـاون، پێویستـە ئەنجومـەنی پێنجسـەد کەسـی[5]، دەسـتەی سـوێندخۆرانی دادگـا، ئەنجومـەنی گشـتی (ئەگـەر ئـەمڕۆ کۆبوونـەوەیان هـەبێت)[6] هـەموویان لەگـــەڵ هەتاوکەوتنـــدا کۆدەبنـــەوە. نمایشـــە شـانۆییەکانی نـاو تیـاترۆ، کـە تـەنها لـەکاتی فێسـتیڤاڵەکاندا نمـایش دەکـرێن، ئـەوانیش لـە خۆرەتاوەوە دەکەونە خۆیـان. فەیلەسوفەکان دەڵێن "ئـەو پیـاوەی شـتی گـەورە ئـەنجام دەدات، دەبێـت هێشتا تاریکی ماوە کە لە خەو هەڵبستێت". بۆیـە هـەردەم هـەموو ئەسـینییەکان لـە یـەك کاتـدا بێـدار دەبنەوەو دەکەونە جووڵە، وەلـێ پیاوانی بە تەمەن بۆیـان هەیـە کـەمێك درەنگـتر لـە نێـو جێگـا بێنـە دەرەوەو رۆژانـــی تـــەم و زوقمـــیش زۆربـــەی ئەسیناییەکان ماوەیـەکی زیـاتر لـەناو جێگاکانیانـدا دەمێننەوە.

بازاڕ خەڵکێکی زۆر کێش دەکات، لێرەو لـەوێ ئافرەتی کۆیلـەی بـەهێز و بەتاقـەت دەبیـنین، گۆزەو شـــەربەی رەنگینیـــان خســـتۆتە ســـەر ســـەریان و پەلەیانە بـەرەو فوارەکـانی سـەر سووچی کۆڵانـەکان بـۆ هێنـانی ئـاوی خواردنـەوە. ئەمـە ئیشـێکی زۆر گرنگـە، چـونکە مـاڵانێکی کـەم یـان هـیچ ماڵێـك سەرچـاوەی ئـاوی تایبـەتی خۆیانیـان نییـە. لـە دەوری هەر فوارەیەك نیو دەرزەنێك ئافرەتی چالاکی لێیە، لە کاتی چاوەڕوانیدا تا نۆرەیان بگاتـێ شـەڕە ئاو دەکەن و یەکتریی تەڕ دەکەن، بۆ ئـەو جوتیارانـە پێدەکـەنن کـە بەویـدا دەڕۆن و وەڵامـی گاڵتـەکانیان دەدەنـەوە.. لەسـەر شـەقامەکان هەندێك کوڕی گۆنـا ئـاڵ دەبینرێـت بـە باشـی خۆیـان گۆڕیـوەو بـەرەو قوتابخانـــە دەڕۆن، ئەمانـــە منـــداڵی خێزانـــە دەوڵەمەنـدەکانن و بـە شـەرمەوە بـە رێگـادا دەڕۆن و بـە ئەدەبـەوە وەڵامـی سـڵاوی هاوڕێکـانی باوکیـان

دەدەنەوە. لە ڕێگادا خۆیان ناخافڵێنن، هەریەكەی تەختی شت لەسەر نوسینی خۆیانیان بە شانەوەیەو دوای ڕێبەرەكەیان كەوتوون كە خزمەتكارێكە بۆ ئەوە تەرخان كراوە بیانبات بۆ قوتابخانەوە ڕێنماییان بكات و ئەگەر پێویستیش بكات، بە نەرم و نیانی هەڵەكانیان بۆ ڕاست بكاتەوە. لە پاڵ كچانی لای نافورەو منداڵانی بەرەوە قوتابخانەدا، ئێستا چەند ماڵێك دەرگایان ئاوەڵا كردووەو گەورە پیاوان دێنە دەرەوەو هەر یەكەی بە پێی پلەو پایەی خۆیان دەچن بۆ لای ئەو خەڵكەی لە دەرەوەی شارەوە هاتوون. "دیموكراسیەتی ئەسینا هەردەم بە جوانی پیادە دەكرێت و لەو سەر ڕێگا قەرەباڵەغانەدا، خەڵكەكە پاڵەپەستۆ ناكەن و پاڵ بە یەكترییەوە نانێن.

## شەقامەكان و ڕوكاری ماڵەكانی ئەسینا

لە نزیكی بازاڕەوە خۆكوتان بەرەو پێشەوە خاودەبێتەو، چونكە شەقامەكان زۆر تەسك دەبنەوەو دەبن بە ڕاڕەوی پازدە پێ یان و بگرە كەمتریش. ڕاڕەوەكان قوڕو لیتەن و هاوینانیش تۆزو خۆڵیان زۆرە، لەوەش خراپتر زێراب و ئاوەڕۆی ماڵان دەڕژێتە سەریان، شارەكە سیستمی ئاوەڕۆ و زێرابی نییە. لەپڕ دەرگایەك دەكرێتەوەو كۆیلەیەكی ناشرین دێتە دەرەوەو هاوار دەكات خۆتان لادەن، پاشان سەتڵێك ئاوی پیس دەڕێژێتە سەر شەقام. ئەمە یەكێكە لەو شتانەی دەپرژێنە سەر لووت و چاوی مرۆڤ و بێزاری دەكەن. بەڵام خۆشبەختانە ئەسینایییەكان گەلێكی تەندروست و بەهێز بوون و بەرگەی پەتاو نەخۆشییان دەگرت، گەرچی ساڵانی ڕابردوو چەندان درم و پەتای سەخت لە ناویاندا بڵاوبۆتەوە[7].

بە نیسبەتی بیانییەكەوە كە مێشكی پڕە لە شۆرەتی ئەم شارەو بە هیوایە شتی زۆر جوان و قەشەنگ ببینێت، لە سەرەتای چوونەژوورەوەیدا هەست بە نائومێدی دەكات. شەقامەكان تەسك و تروسك و پیس و پۆخڵن، خراپ چەوڕێژكراون، زۆربەشیان زۆر ناڕێكن و نائومێدی دەكەن.

ئەگەر بەحاڵ لە شەقامە سەرەكییەكە لابدەیت، لەوانەیە لەناو لابیرینسێكی پڕ لە هێڵی پێچاوپێچی چڵكن و بۆگەندا بزر ببیت. ئەگەر سەرت هەڵبڕیت، لە ژوور سەرتەوە قەدپاڵی بڵندی بیناكانی ئەكرۆپۆڵیس دەبینیت. پڕە لە بەردی زەردو سورو مەڕمەڕی سپی پەرستگاكان، كە بنمیچەكانیان تەختە. ئەم دیوارانە بەگڵگەچی تاڕادەیەك چڵكن یان خۆڵەمێشی سواخدراون. دەروازەی چوونە ژوورەوەی خانووەكان بریتیە لە كونێكی گەورە لە دیوارەكانەوەو ڕاستەوخۆ لە شەقامەوە دەچنە ناویان. ئەگەر خانووەكە یەك نهۆمی بێت، ئەوا هیچ پەنجەرەیەكی تێدا نیە بەسەر شەقامدا بڕوانێت. بەڵام ئەگەر دوو نهۆم بێت، ڕەنگە چەند درزێكی تەسكیان تێدا هێشتبێتەوە، ئەمە بریتیە لە نهۆمی كۆیلەكان یان ئافرەتەكان. شەقامەكان ژمارەیان لەسەر نییە. زۆربەیان ناویان نییە. دوای ئەوەی بە نەزاكەتەوە چەند پرسیارێك لە دەر و دراوسێ دەكەیت، پێت دەڵێن ئاواو ئاوا بڕۆ.. ماڵەكەیان لە نزیكی پەرستگاكەی هێراكلێسەوەیەو دەتوانیت ئەو ماڵەی مەبەستتە بیدۆزیتەوە. دواجار ئەسینا شارێكی تا ڕادەیەك بچووكە[8] (لە چاو ئەو شارە گەورانەدا كە ناسراون) بۆیە دانیشتوانە ئەسڵییەكەی هەستیان نەدەكرد پێویستیان بە ڕێوەبەر هەبێت.

قەرەباڵغییەكە بەشان بەرەو پێشەوە دەچێت: لێرەو لەوێ لێیان دەڕوات و هی كە

دێتە پاڵیان، وەلێ شەپۆلی سەرەکی ڕەوتەکەیان بەرەو بازاڕە.

### سادەیی ژیانی ئەسینا

ئاشکرایە ئێمە دەچینە ناو شارێکەوە کە نۆ لەسەر دەی ئەوەی سەدەی بیستەم پێی دەڵێت "هۆیەکانی حەوانەوە"ی تێدا نییە، لێرە مرۆڤەکان هەوڵ دەدەن شارستان بن — یان وەك یۆنانەکان دەڵێن، بۆ باوەشکردن بە "ڕاستی، جوانی، چاکە"دا، بێ ئەوەی تەنانەت لانیکەمی ئەو شتانەشیان هەبێت کە خەڵکی سەردەمانی دواتر باوەڕیان وا دەبێت کە بەوانە مرۆڤی شارستان لە "بەربەرییەکان" جیادەکرێتەوە. لە ڕاستیدا بۆشایی نێوانی ئەسیناو شیکاگۆی نوێ بۆ نمونە زۆر لەوە گەورەترە کە گریمانە کراوە[9]. بە ئاسانی ئەوەندە بەسە بڵێین ئەسینایییەکان شتی وەك هێڵی ئاسنین، تەلەفون، گاز، لیمۆی بەهەشت، چۆکلێتیان نەبوو. ئەو شتانەی باسمان کردن باوانمان یان باپیرانیشمان نەیانزانیون، ئێمەش هێشتا ئەوەندە زۆر لێیان دوور نەکەوتووینەتەوە تا نەتوانین بە ئەندێشە خۆمان بگەڕێنینەوە بۆ جیهانی دەوروبەری ساڵی 1820 ی نوێ. وەلێ ئەسینییەکان زۆر لە باپیرانیشمان دێرینترن. کاتێك ورد دەبینەوە، ڕەوشی وەك ئەوەی باوباپیرانی خۆمان لای ئەسینایییەکان دەدۆزینەوە، ماڵ و خانووی بێ هونەرکاریی، تەختی نوستنی بێ چەرچەف، ژووری ساردو گەرم وەکو هەوای دەرەوە، ڕەق و تەق و بێ گیان. دەبێت لەو ڕوبارانە بپەڕینەوە کە پردیان بەسەرەوە نیە، دەبێت پۆشاکەکانمان (کە لە ڕاستیدا هەر دوو پارچەن و زیاتر نا) بە دەرزی سنجاق ببەستین نەك بە قۆپچەو زنجیر و شتی وا. دەبێت سۆل و سەندەلێ بکەینە پێ بێ ئەوەی گۆرەویمان لەپێدا بێت (یان دەبێت بە پێی پەتی بگەڕێین)، دەبێت لە بەر مەقەڵی و ئاگردانی خەڵوز خۆمان گەرم بکەینەوە. سەر لە بەیانیانی زستان دادوەرەکان و کۆبوونەوە یاساییەکان لە شوێنێکی کراوەدا کۆدەبوونەوە، کتێب و نوسراوەکان زۆر دەگمەنن و یاریدەیەکی کەممان دەدەن بۆ فێربوونی شیعر، جوگرافیامان نەخشەی ڕاستەقینەی نییە، سیاسەت ڕۆژنامەی نییە. بە نیسبەتی ئێمەوە "پێویست دەکات فێر ببین چۆن شارستان بین بێ ئەوەی ئیسراحەتمان هەبێت!"[10].

یان با مەسەلەکە پێچەوانە بکەینەوە: پێویستە لەوە تێبگەین کە ئەسینایییەکان پێیان وابووە ئەم ژیانە شارستانەی ئێمە هەمانە، هەمووی دەسکردەو ژیانمان بە تەواوەتی پشتی بەستووە بە کەل و پەل و کاڵاو مادەکان، بە جۆرێکی وەها کە شایستەی ئەوە نییە تێیدا بگەوەرێنیت. مرۆڤی یۆنانی لە ڕەوشێکدا بە خۆی دەڵێت من باش و کامەران دەژیم کە بەلای پیاوێکی ئاسایی ئینگلیز یان ئەمریکییەوە ژیانێکی ساردو سڕو نیمچە برسێتی و بەدبەختییە. وەلێ کابرای یۆنانی پێی وایە کامەرانیو ئاسودەییەکەی لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدایەو لەوە زیاتر دەستی بەسەریدا دەشکێت کە ئێمە دەتوانین جڵەوی کامەرانی خۆمانی پێ بکەین. ئەو پێی وایە ئێمە شایستەی بەزەیی پێداهاتنەوەیەکی لووتبەرزانەین نەك پێسەرسامبوون، چونکە ئێمە شارستانێتییەکەمان گەیاندۆتە ئاقارێك کە بچووکترین ڕوداو، بۆ نمونە ڕاوەستانی هاتووچۆ بۆ چەند ڕۆژێك، دەتوانێت شارە مۆدێرنەکان کورت بکاتەوە بۆ وێرانەیەکی دابڕاو.

ڕەنگە نە سەدەی بیستەم لە شانازییەکەیدا، نە سەدەی چوارەمی پێش زایین لە گاڵتەجاڕییەکەیدا، ڕاستییان بەلاوە نەبێت[11]. چونکە پێویستە جیاوازی گۆشەنیگاکان هەروا دیارو بەرچاو بێت. دەشێت بە شێوەیەکی گشتی بە ئەسینا بوترێت "شاری گوزەرانی ساکار". بە خۆمان و ئەم بیرەوە دوای ئاپۆراکە دەکەوین و خۆمان دەکەین بەناو بازاڕدا، یان با هەمان ئەو ناوە بەکار بهێنین کە گوزارشت لە سەمەرەیی دامودەزگاکانی یۆنان دەکات: ئاگۆرا.

## پەراوێزەکان

1-دەشێت وا گریمانە بکەین کە سەردەمەکە لەگەل جەنگی ماراسۆندا دەستپێدەکات (490) و لە ساڵی (322) دا کۆتایی پێدێت، کاتێك ئەسیناییەکان چوونە ژێر ڕکێفی مەکەدۆنیاوە، لە جەنگی خارۆنیاوە (338) شتێکی لەوە زیاتری نەکردووە لەوەی ئازادییەکەی خۆی بپارێزێت.

2-دەشێت شینایی دڵگیری ئاوەکەی نزیکی ئاتیکا بەهۆی پاکی و ڕوونی بەردەکانی بنی دەریاوە بێت، لەگەڵ کاریگەریی تیشکی هەتاودا.

*3-Medea: 829.*

4-هۆی ئەم هەموو ڕۆژە ساف و بێگەردانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کاتێك با شێدارەکانی خۆراوا و باشوری خۆراوا بەر هەوای وشك و گەرمی دەشتی ئاتیکا دەکەون، دەبن بە هەڵم و ون دەبن، نەك چڕ ببنەوە (وەك لە خاکەکانی باکوردا)، بۆیە ڕۆژگار بە ڕونی و خۆرەتاویی دەمێنێتەوە.

5-بۆوڵ "*boule*" واتە گەورەترین کۆمیتەی خەڵکی ئەسینا بۆ یاریدەدانی فەرمانڕەوایانی ناو حکومەت.

6-بێشك لە حاڵەتی ئاوادا، دادگاو ئەنجومەن بە دەگمەن کۆدەبنەوە.

7-ترسناکترینیان پیلانەکەی ساڵی 430 ی پێش زایین بوو (لە ماوەی جەنگی پیلۆپۆنیشدا) کە ئەسینای نیمچە خاپوور کرد.

8-بیرکردنەوە لە ژمارەی دانیشتوانی ئەسینا لە سنوری خەملاندندا دەمێنێتەوە، بە بەکارهێنانی ئەو داتا کەم و کورتانەی لەبەردەستماندان، پێدەچێت ژمارەی دانیشتوانی هەموو ئاتیکا لەوپەڕی گەشەو بوژانەوەدا 200.000 تاکی ئازاد (بە مێتیکەکانیشەوە – دانیشتوانی بیانی بێ مافی هاوشارێتی)، هەروەها ژمارەیەکی کەمتری 150.000 یی یان کەمتر کۆیلەشی لێ هەبووە. لە سەرجەمی ئەم نزیکەی 350.000 کەسە، دەشێت لە ماوەی ئاشتی و ئاسایشدا نزیکەی نیوەیان لە ئەسینادا ژیابن و باقییەکەشی لەدەرەوەی شارو گوندەکان نیشتەجێ بووبن. دەشێت ئەندێشەی ئەسینا بکەین کە شارێکی نزیکە 150.000 کەسی یان کەمێك زیاتر بووە. لەماوەی شەڕە سەختەکاندا بەگشتی هەمووان دەخزانە ناو شارەکەوە.

9-بنۆڕە ئەو کۆمێنتە بەرچاوەی لە زیمێرن جێماوە دەربارەی سنورداریێتی فیزیکی ژیانی دێرین لە ئەسینا: "*The Greek Commonwealth, p.209*".

10-سەرچاوەی پێشوو.

11-بێگومان مەسەلەیەکی سەرەکی کەش و هەوا فاکتەرێکی سەرەکییە. ژیانی ئەسینایی لە ڕووی مادییەوە زۆر ئاڵۆزتر دەکات بە تایبەتی ئەگەر بیەوێت ژیانێکی خانەدان و خۆش بژی، لە خاکێکدا کە زستانان پلەی گەرمی جارجارە دەگاتە پازدە پلە لە ژێر پێوەری فەهرەنیهایەت و بگرە نزمتریش.

## سەرچاوە

***WILLIAM DAVIS:***

# پییەر بۆردیۆ
# وەك بیریارو تێکۆشەرێك

محەمەد عەلی ئەتاسی
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**بەرایی**

ئـــەم وتـــارە هەوڵـــدەدات کـــاروانی سۆسیۆلۆژیســتی فەرەنســی "پییــەر بۆردیــۆ"و پێگــەی ئــەو لــە کایــەی رۆشــنبیری فەرەنســیدا بخاتەڕوو, هەروەها هەڵدەدات باس لەو رۆڵەشبکات کـە ئـەم پیـاوە لـە مـاوەی پێـنج سـاڵی رابـردوودا گێڕاویـەتی, لـەناو بواری گشـتیو لـەپێناو مەسـەلە گـــەلێکی ســـەرەکیدا کەبەشـــێوەیەکی تایبـــەت پەیوەنـدیان بـە فەرەنسـا و بـە شـێوەیەکی گشـتیو هەمە لایەنەتریش بە ئەوروپا هەبووە.

ئەسـتەمە لێـرەداو بـەم خێراییـە بتـوانین بـە شـێوەیەکی وردو تـەواوەتی جومگـە سـەرەکیەکانی فیکری "بۆردیۆ" بەرچاو بخەین, یاخود باس لـەوە بکەین لێکۆڵینەوەو کتێبەکانی بەدرێـژایی ئەم چل سـاڵە, چ زانینێکیـان بـۆ سۆسـیۆلۆژیاو زانسـتە مرۆڤایەتییەکان زیاد کردووەو چ ئاسۆیەکی نوێیـان لە بەردەما کردونەتەوە.

هەوڵــدەدەین لــەڕێگای چــەمکی رۆشــنبیری دەســتە جەمعیــەوە ئــەو رۆڵــەی "بۆردیــۆ" پێــی هەڵدەســتێت, رۆشــنبیرێك کەتێکــەڵ بــەکاروباری گشتی خەڵك دەبێت, رۆشنای بخەینە سەر فیکری ئــەوو هاوکــات ئــەو پەیوەندییــە دیالەکتیکــەش ئاشــکرا بکــەین کــە هەڵوێســتە عەلەنییــەکانی بـــەتیۆریاو لێکۆڵنـــەوە سۆســـیۆلۆژیەکانیەوە دەبەستێتەوە.

شــتێك کــە بەتــەواوەتی لەگــەڵ هەڵوێســتە سیاسـیەکانی "بۆردیـۆ"دا بگونجێـت, تـەنها تێـزو توێژینـەوە کۆمەڵایەتییەکانیـەتی, بـەڵام ئـەم فیکـرە سۆسـیۆلۆژییە لەناوەنـدە رۆشـنبیریو ئەکادیمیـە عەرەبیەکانـدا کـەمتر ناسـراوە, ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ چـەند هۆکارێـك, لێـرەدا بـاس لـەدوو هۆکاریـان دەکەین.

یەکـەم: سۆسـیۆلۆژیا لـەناو پێکهاتـەی زانسـتە مرۆڤایەتییـەکان, لـە زانکۆکـانی وڵاتـانی عەرەبیـدا

پلەو پایەیەكی نزمی هەیە, ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی مەرجی لێكۆڵینەوەی زانستی ئازاد, بەدوور لەتابۆ سیاسیو كۆمەڵایەتیو كۆسپو تەگەرە ئابوریەكان.

دووەم: بەشێوەیەكی تایبەت پەیوەندی بە سۆسیۆلۆژیای "بۆردیۆ" خۆیەوە هەیە, چونكە سۆسیۆلۆژیای ئەو خەسڵەتێكی رەخنەییانەی هەیەو قەرەی هەموو فۆڕمەكانی دەسەڵات دەكەوێتو شێوازە جۆراوجۆرەكانی توندوتیژی رەمزیش باس دەكات.

سەرەڕای ئەوانە چەند هۆكارێكی دیكەش هەن, وەك پەیوەستی سۆسیۆلۆژیای "بۆردیۆ" بەواقعی كۆمەڵگەی فەرەنسییەوە, هەروەها كێشەی ئەوەی (فیكری سۆسیۆلۆژیای) ئەو كورتناكرێتەوەو پەرت ناكرێت. جگە لەمانەش وەرگێڕانی بەرهەمەكانی ئەركێكی قورسە, لەبەربوونی زاراوە گەلێكی تەكنیكیو میتۆدێكی تایبەتو ناوازە لەتوێژینەوەكانیدا. بەپێچەوانەی بەرهەمی هەندێك لەڕۆشنبیرە فەرەنسیەكانی وەك: "ژان پۆڵ سارتەر, میشال فۆكۆ, تەنانەت ژاك دێریدا"ش, چەند كتێبێكی كەمی "بۆردیۆ" نەبێت, هیچی وای بۆ سەر زمانی عەرەبی وەرنەگێڕدراوە, زۆربەشیان بەهۆی خراپی وەرگێڕانەكانیانەوە بەمردویی كەوتونەتە بەردەستی خوێنەران.

بەمجۆرە فیكری "بۆردیۆ" لەدەرەوەی دیاردەی ئەم مۆدە ئەدەبیانە مایەوە كە لە ژیانی رۆشنبیری عەرەبیدا باوە, لای ئێمە بەفەلسەفەی سیاسیو كۆمەڵایەتی (كەلە سەرەوەڕا دەسەڵاتی خۆی بەسەر تەواوی كایەی رۆشنبیری عەرەبیدا سەپاندووە)و نە ئەو رۆشنبیرانەش پەرۆشی گێڕانی رۆڵی پێغەمبەرو پەیامبەرن یان ئەوانەی لە هەوڵی خزمەتكردنی دەسەڵاتداران, مەبەستیانە گرنگی بەفیكرێك بدەن كەئەولەویەت بداتە لێكۆڵینەوەی مەیدانیو بایەخ بەمەسەلە (لاوەكیەكان) بدات, ئەو مەسەلانەی گەورە بیریارانی ئێمە بەهۆی سەرقاڵیان بەتێڕامان لەچارەنوسی كێشە مەزنەكان, فەرامۆشی دەكەنو رووی خۆیانی لێوەردەگێڕن.

گەر بەم دوایانەش هەندێك رۆژنامەو گۆڤاری عەرەبی ئاوڕیان لە "بۆردیۆ" دابێتەوەو باسیان لێكردبێت, ئەوا بەو مەبەستە بووە فریای ئەو شەڕە بكەون كەبڵاوكراوە فەرەنسییەكان لەدژی "بۆردیۆ"و هەڵوێستی ئەو لەیۆتۆبیای نیو-لیبرالیزمو رەخنەگرتنی لەمیكانیزمی كاركردنی راگیاندنی خۆرئاوا, دەستیان داوەتێ.

### بەرەو رووبەڕووبونەوەی پەیوەندیەكانی هێز

لەسەرەتای پرۆژە فیكریەكەیەوە كە لەشەستەكانەوە دەست پێدەكات, "پییەر بۆردیۆ" ئاگادارە لەوەی مومارەسەكردنی سۆسیۆلۆژیایەكی پێشكەوتوو ئازاد لەو كۆمەڵگایانەی پەیوەندیەكانی هێزو چەوساندنەوە تیایدا گەیشتۆتە ئەوپەڕی, چ دەرئەنجامێكی سیاسیو كۆمەڵایەتی لێدەكەوێتەوە. بەتایبەت كە پەیوەندیەكانی هێزو چەوساندنەوە لەو كۆمەڵگایانەدا, تواناو بەردەوامی خۆیان لەوێوە وەردەگرن كە لەسەر پرانسیپی خۆئاشكرا نەكردنو بۆ شاردنەوە كاردەكەن. واتە ئەوانەی ملكەچی ئەم پەیوەندیانە دەبنو رازین بەوهەلومەرجە, ناتوانن بەشێوەیەكی بابەتی دركی حەقیقەتی ئەو مەسەلەیە بكەن, حەقیقەتی ئەو پەیوەندی هێزو ستەمەی لەبەرامبەریان بەكاردەبرێت. مەبەستی "بۆردیۆ"ش لەتوندوتیژی رەمزی, ئەو توندوتیژییە بۆ ئەوەی بەشێوەیەكی چالاك كاری خۆی بكات, پێویستە ئەوانەی دەكەونە

بەر زەبری، دەستیان لەگەڵ ئەوانەدا تێکەڵ کردبێت کەبەو کارە هەڵدەستن. چەمکی (دەست تێکەڵکردن) لەم سیاقەدا، بەو مانایە دێت کەئەوانەی بەر زەبری ئەو توندوتیژییە دەکەون، هەڵگری دیدوبۆچوون و بونیادێکی وەهان کە لەرووی مێژووی و کۆمەڵایەتییەوە دروست بووەو بەجۆرێکی وەهایە، رێیان پێنادات ئەو توندوتیژییە رەمزییە ببینن کەوەك فۆرمێك لەفۆرمەکانی توندوتیژی لەبەرامبەریان بەکاردەهێنرێت.

تێکڕای ئەم بەنیادو جیهانبینیانەش بەرەنجامی ئەو پەیوەندییە نایەکسانو کۆنترۆڵکردنەیە کە لەجیهانی کۆمەڵایەتیدا بەرقەرارە، واتە وەها حاڵەتێك تایبەت نییە بەو خاوەن دەسەڵاتانەی لەم پاشکۆیایەتییە سودمەندن، بەڵکو ئەم بونیادە جیهانبینییە وەك سستمێکی مەعریفەو پەی پێبردن خۆیان دەخەنە پێشچاوی ئەوانەی لەخوارەوەدان، هەر ئەوانیش یەکەم قوربانی دەستی ئەون.

لێرەوە دەبێت تێبگەین ئەم توندوتیژییە، چۆن چۆنی لەرێگای (جلوبەرگو زمانو شێوازی قسەکردنو جموجۆڵو خواردنو ئارەزووی سێکسو.. هتد)، بەگەڕ دەخرێتو پەیوەندی کۆنترۆڵکردنو ئاراستەکردن لەخۆی دەگرێت، بەبێ ئەوەی هیچ مەشروعیەتێکی هەبێت. جگە لەو مەشروعیەتەی خۆی بەبەری خۆیدا دەکات، هاوکات ئەو پەیوەندیە ئاوەژووە کۆمەڵایەتیو ماددییەشی لەئارەدایە، پایەکانی زیاتر پتەوتر دەکات.

نەهێشتنی مەشروعیەتی ئەو جۆرە پەیوەندییە، تەنها لەرێگای ئاشکراکردنی رەگو ریشەکانیەوە دێت، لەگەڵ پەردە هەڵماڵین لەرووی لایەنی ئەو جەهلو بێ ئاگاییەی توندوتیژی رەمزی لەسەر دروست دەبێت. ئەمەش ئەو کارەیە کەدەبێت سۆسیۆلۆژیا پێی هەستێت، لەلایەك بەمەبەستی خزمەتکردنی زانستو زانین، لەلایەکیتر لەپێناو یارمەتیدانی هەموو ئەو چەوساوانەی دەیانەوێت سیستمە ماددیو رەمزییە باڵادەستەکان تێکوپێك بدەن.

### رۆشنبیری دەستە جەمعیو بزاوتی کۆمەڵایەتی

لەوتارێکیدا کەرۆژنامەی (لیبراسیۆن)ی فەرەنسی لەبەرواری 1983/3/31 داو لەژێر سەردێری (سارتەر، دروستکردنی رۆشنبیری شمولی بڵاویکردبووەوە)، "بۆردیۆ" دەیەوێت باس لەوە بکات کەچۆن "سارتەر" لەرێگای بەرهەمەکانیو هەڵوێستو شێوازی ژیانی خۆیەوە دەیویست رۆشنبیری شمولی بەرجەستە بکات، ئەو رۆشنبیرەی لەوەهمێکی وادا دەژی کە گوایە سنورێك بۆ ئازادییەکانی ئەو نییە، هەروەها دەیەوێت هەموو مۆدیلەکانی رۆشنبیر کەپێشتر لەئارادابوون، وەك (دەروەست، چەپرەو، فەیلەسوف، رۆماننوس، نوسەری شانۆ، رەخنەگر) لەخۆیدا کۆبکاتەوە.

"بۆردیۆ" لەکۆتاییدا دەگات بەوەی بڵێت: (ئەوەی پێی وابوو کایەی رۆشنبیری سەردەمەکەی خۆی کۆنترۆڵ کردوو. بێئاگابووە لەوەی ئەو خۆی لەژێر جەبری کایەکەدا بوو، بەومانایەی ئەو بەرهەمی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمو قۆناغە بووە).

لەبەرامبەر ئەم مۆدێلە سارتەریەی رۆشنبیرو ئەو مۆدێلە کاریکاتۆریانەی لەدوای مەرگی "سارتەر" هاتنە ئارا، وادەکەن "بۆردیۆ" زۆر بەگومانو وریا بێت، چونکە ئەو (بەردەوام هەستی بەوە دەکرد کەنامۆیە بەجیهانی رۆشنبیرانو لەناو ئەواندا، هەرگیز هەست بەوە ناکات لەماڵی خۆیدایە)[1]. تەنانەت لەکۆتایی نەوەدەکاندا دەگاتە

ئەوەی بڵێت: (ئەوەی لەخۆیەوە رقی لێی دەبێتەوەو بێزارە لێی، رۆشنبیرە)[2].

ئەی کەواتە "بۆردیۆ" چۆن چەمکی رۆشنبیری دەستە جەمعی دێنێتە ئاراوە، لەکاتێکدا ئەو زیاد لە هەموو کەسێك بەو چەمکانە بێزار دەبێت کە (*Intellectualisme*) بەبیر دێننەوە؟ "بۆردیۆ" چۆن چۆنی دەتوانێت چینی سیاسەتمەدارانی فەرەنسا بهەژێنێت و بیانهێنێتە شەکوشۆك، بۆ ئەوەی بکەوێتە ناو داوی رۆشنبیری شمولیەوە؟

لێرە بەدواوە هەوڵدەدەین وەڵامی ئەم پرسیارانە بخەینەروو.

تاسەرەتای ساڵانی هەشتا، بەشداریکردنی "بۆردیۆ" لەکاروباری گشتیدا تەنها لەرێی نوسین و لێکۆڵینەوەکانییەوە بوو، (چونکە پێی وابوو کاری سیاسی ئەو نوسینەکانیەتی)[3]. بەشی زۆری نوسینەکانیشی تایبەت بوون بە (لادێ نشینەکانی جەزائیر، سیستمی خوێندن لەفەرەنسا، سەر لەنوێ بەرهەم هێنانەوەی دەستە بژێرە باڵادەستەکان، ئەنجومەنەکانی خوێندن، قوتابخانە گەورەکان، ئاموشۆکەرانی مۆزەخانەکان و چێژ بینین لەهونەر)، ئەمەو سەرەرای لێکۆڵینەوە قەوارە گەورەکەی (لەهەردوو بەشەکەیدا)، دەربارەی (جیاوازی *Ladistinction*) و (هەستی گشتی *Lesens commun*).

بەلام بەهۆی گرنگی زۆری توێژینەوەکانی لەرووی کۆمەلایەتییەوەو ئەو کاردانەوە توندوتیژانەی دروستیان کرد، هاوکات لەگەڵ دەستنیشانکردنی لەساڵی 1981 بۆ ئەوەی کورسی سۆسیۆلۆژیا لە (کۆلیج دی فرانس) وەربگرێت، وایان لێکرد هەست بەوە بکات کە (بەقەد پێویست) بۆتە خاوەنی دەسەلاتێکی رەمزی وا، تابتوانێت بەشێوەیەکی چالاك خەبات لەدژی دەستدرێژی و سنوربەزاندنەکانی دەسەلاتی رەمزی دەست پێبکات.

دەست بەجێش کاتێك لەو دەزگا گرنگەدا بووە ئەندام، هەر لەپێشکەشکردنی وانەی یەکەمی کۆرسی ساڵی خوێندنی 1981وە، ئەو رێگایەی گرتە بەر. "بۆردیۆ" لەیەکەم لێکچەریدا رەخنەیەکی توندی لە (سروشتی رێزلێنان لەناو ئەو دامەزراوە ئەکادیمیەدا گرت و لۆژیکی ئەو دامەزراوەی لەسازدانی ئاهەنگ بۆ ئەوانەی رێزیان لێدەنێت دایە بەر رەخنە، تا گەیشتە رەخنەکردنی مانای ئینتما کردن بۆ ئەو دەزگایەو توانای خۆرزگارکردنی لەئاسەوارەکانی ئەو ئینتمایە).

(وانەیەك دەربارەی وانەیەك)، خاڵی دەسپێك و وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لەکاروانی رۆشنبیری "بۆردیۆ"دا. لەسەروبەندی هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکەی فەرەنسادا، "بۆردیۆ" ئیمزای لەسەر ئەو بەیاننامەیە کرد کەپشتگیری لەکاندیدکردنی ئەکتەری کۆمیدی "کۆڵش *COLUHE*" دەکات بۆ هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکەی فەرەنسا، لەبەرامبەر هەریەك لە "فرانسوا مێتێران و ژاك شیراك"دا.

لەئانوساتی سەرکەتنی چاوەروانکراوی "میتران" و نزیك بوونەوەی لەسەرۆکایەتیکردنی ئەو وڵاتە، "بۆردیۆ" دەیویست دەنگدەران هانبدات تابیر لەرێورەسمی پرۆسەی هەڵبژاردن و تاکرەهەندی پێکهاتەی چینی سیاسەتمەدارانی فەرەنسا و داخرانیان بەسەر خۆیاندا بکەنەوە، سەبارەت بەپرۆسەی خۆکاندیدکردنی "کۆڵش *Coluche*" بۆ پۆستی سەرۆکایەتیکردنی فەرەنسا دەڵێت: (هاتنە ناوەوەی ئەم گەمە کارە سەیرە بۆ ناو ئەم گەمەیە، واتە بۆ خۆی هەرەشەیەکە لە سەر

بڕواو قەناعەتو راستگۆیی گەمەکارە سروشتیو ئاساییەکانی ناو گەمەکە)[4].

"بۆردیۆ" بەدرێژای ماوەی حوکمڕانی "میتێران"، لەو رۆشنبیرە دەگمەنانە بوو کە حیزبی سۆسیالیستی فەرەنسا نەیتوانی دەستەمۆیان بکاتو بەلای خۆیاندا رایان بکێشن، ئەویش لەڕێی فرتو فێڵەکانی دەسەڵاتو ئەنجومەنە راوێژکاریەکانیو ئەو پلەوپایانەی وەك رێزلێنانێك بەڕۆشنبیرانیان دەبەخشی.. ئەو نەك هەر ئەوانەی قبوڵ نەکرد، بەڵکو پانتاییەکی رەخنەیی پانوپۆڕو بەرفراوانیشی لەنێوان خۆیو (چەپی) حوکمڕاندا هێشتەوە.

لەکاتی جەنگی دووەمی کەنداویشدا لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی روناکبیرانی فەرەنسادا، بەیاننامەیەکی لەدژی بەرپاکردنی شەڕ ئیمزاکرد. ئەمە حاڵتێکی دەگمەن بوو لەناوەندی رۆشنبیری فەرەنسیدا، چونکە لەو کاتەدا ئەو ناوەندە لەبەرژەوەندی چارەسەرکردنی قەیرانەکە بەڕێگا چارەی سەربازی تەیارکراوبوو. هاوکات لەگەڵ ئەمەدا کەوتە هەوڵی دامەزراندنی رێکخراوێکی فەرەنسی (هەر خۆشی بووە سەرۆکی رێکخراوەکە)، لەپێناو پشتگیریکردن لەو رووناکبیرە جەزائیریانەی ژیانیان لەمەترسیدا بوو دەیانویست لەوڵات هەڵبێنو رووبکەنە دەرەوە. ئەو لەم رێگایەوە دەیویست زۆر بۆ دەسەڵاتدارانی فەرەنسا بهێنێت، بۆ ئەوەی فیزەی هاتنە ژورەوەیان بدەنێ.

ساڵی 1992 "بۆردیۆ" کتێبی (رێساکانی هونەر- *Lesregles delart*) بەچاپ دەگەیەنێت، تیایدا باس لەدروستبونی کایەی ئەدەبی فەرەنسی دەکات لەسەدەی نۆزدەدا، هەروەها باس لەبونیادو چۆنیەتی بەرەو پێشچونی ئەم ئەدەبە دەکات، بەرەو بەدەستهێنانی سەربەخۆی زیاتر لە بەرامبەر دەسەڵاتەکانی دیکەی دەرەوەی ئەم کایەیەدا.

لەگەڵ ئەمانەشدا بەدوورودرێژی باس لەڕۆڵی کۆمەڵایەتی رۆشنبیرانیش دەکات. لەکۆتایی کتێبەکەدا پاشکۆیەك دەنوسێتو تیایدا داوا دەکات: (رێکخراوێك لەڕۆشنبیران پێکبهێنرێت کەتوانای ئەوەی هەبێت قودرەتی رەخنەیی رۆشنبیری بەرجەستە بکاتو گوتاری ئازادی بدات بەگوێی دنیاداو ئیعتراف بەهیچ سانسۆرو کۆتو بەندێکیش نەکات، جگە لەوەی هەموو هونەرمەندێك هەموو نوسەرو زانایەك بەسەر خودی خۆیو هاوڕێکانیدا دەیسەپێنێت)[5].

سەبارەت بەپرۆژەیەکی لەم جۆرە، "بۆردیۆ" تەئکید لەسەر لایەنی دەستە جەمعی رۆشنبیران دەکات، چونکە ئەو پێی وایە (ئەو دەسەڵاتەی لەبەرامبەر رۆشنبیراندا بەکاردەهێنرێت، هێزو توانای لەوەدایە کەڕۆشنبیران پەرت پەرتنو یەکگرتوونین. هەموو هەوڵێکیش بۆ کۆکردنەوەو یەکخستنی رۆشنبیران مەحکومە بەشکست، مادامەکی تۆزقاڵێك گومان هەبێت لەوەی هەوڵێکی لەم جۆرە، بۆ بەرژەوەندی ململانێی سالاریو بالادەستی رۆشنبیرێك بەکاردەهێنرێت)[6].

لەکۆتایی ساڵی 1993 و لەدیدارێکیدا لەگەڵ رۆژنامەی (لۆمۆند)، "بۆردیۆ" بۆ یەکەمجار راشکاوانە داوای دروستکردنی رۆشنبیری دەستە جەمعی دەکات. رۆشنبیرێك توانای ئەوەی هەبێت بوێران هەڵوێستی ئاشکرا وەرگرێتو رووبەڕووی فشاری دەسەڵاتە جۆراوجۆرەکان بێتەوە، ئەمەش لەلایەك بۆبەرگریکردن لەئازادیو سەربەخۆی داهێنەرانە، لەلایەکی تریشەوە لەپێناو داکۆکیکردن لەبەهای دادپەروەریو یەکسانییە، بەشێوەیەکی گشتیو هەمە لایەن. ئەم هەوڵەش لەبەرئەوەی

هەوڵێکی دەستە جەمعیانەیەو فەردی نییە, ئەوا نابێتە مایەی سودو دەسکەوتی رەمزی بۆ خاوەنەکەی, کارێك کەڕۆشنبیری شمولی لەدەورانی رابردوودا بەتاسەیەوە بوو.

ئەوانەی بەناوی بەها مەزنەکانەوە خۆیان وەك قسەکەری رەسمی دەناسێنن, لەبەرئەوەیە کەوەها مەسەلەیەك دەسکەوتی رەمزیو ماددیان بۆ دەستەبەر دەکاتو لەو مەترسیانەش بەدووریان دەگرێت (گەر بێتو قسە لە کێشەیەکی دیاریکراو رەوا بکەن) کەپەردەپۆش کراوەو باس ناکرێت, چونکە دەسەڵاتداران و بڕیار بەدەستەکان پلەوپایەیان هەرچییەك بێت دەیانەوێت مەسەلەکان بەو جۆرە بەڕێوە بچێت[7].

هاوشان بەم دەست پێشخەریە تازەیەی "بۆردیۆ" سەبارەت بەماناو رۆڵی رۆشنبیرو لەبەرامبەر ئیفلیجی سیاسەتمەدارانی فەرەنساو دەستە وستانی. حزبە چەپە تەقلیدیەکان (بەشیوعیەکانیشەوە), لەپێشکەشکردنی بەرنامەیەکی ئەلتەرناتیڤ لەبری ئەو پرۆژە لیبرالیەی لەمرۆدا باڵادەستەو کەم توانابیان لەوەی هاووڵاتیان لەدژی هانبدەن، ئەوا رێکخراو گەلێکی تایبەتی دروست دەبێتو سەبارەت بەچەند کێشەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوی وەك: (راسیزم، بێکاری، مافی نیشتەجێبوون، هەلومەرجی ئەو پەناهەندانەی مافی پەنابەرێتیان نادرێتێ) ، دەست بەچالاکیو خەباتی سیاسیو خستنەڕووی داواکارییەکانی خۆیان دەکان. زۆربەی ئەوانەشی بەشداری لەپێکهێنانی ئەم رێکخراوانەدا دەکەن, لەرۆشنبیرانو هەڵوسراوانی سەندیکاکانو ئەو کەسانەن کە بەلەبەریەك هەڵوەشانی دەوڵەتی بەرژەوەندی گشتیو دامودەزگاکانی زەرەرمەندبوون. هەموو ئەمانە پێکەوە یاخود هەریەکەو لەبواری خۆیدا (کار بۆئەوە دەکەن هێزێکی سیاسی دروست بکەن، بەبێ ئەوەی هەوڵی دروستکردنی سیاسەتمەداربدەن، هەوڵدەدەن هێزێکی سیاسی وەها پێکبهێنن کەوەك یەك کاریگەری لەسەر حزبە چەپرەوەکانو حزبە راستڕەوەکان هەبێت)[8].

ئەوەی ئەمرۆ لەفەرەنسادا بەناوی بزاوتی کۆمەڵایەتییەوە ***Le Mouvement social*** دەناسرێت, کۆی ئەو رێکخراوانەیە کەنەك بۆ پلەوپایەی سیاسیو بەدەستهێنانی دەسکەوتی رەمزی بۆ ئەندامەکانی خەبات دەکات, بەڵکو لەپێناو بەرگریکردن لەدەوڵەتی بەرژەوەندی گشتیو مافی فەرمانبەرانو ئەوانەی داهاتێکی دیاریکراویان هەیە کاردەکەن. هەروەها لەبەرژەوەندی بێکارانو بێجێگەو لانەکانو کۆچبەرانو ئەوانەی لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە پەراوێز خراون, یاخود لەڕووی جنسیو ئەتنیکییەوە دەچەوسێنرێنەوەو ستەمیان بەرامبەر دەکرێت, تێدەکۆشن.

## مانگرتنەکانی 1995

ئیستا باس لەوە دەکەین کەچۆن چەمکی (رۆشنبیری, دەستە جەمعی), بووە هۆکارێك لەکاراترکردنی میکانیزمی بەشداریکردنی رۆشنبیران لەکاروباری گشتی فەرەنساداو چۆن جدیەتی زیاتری دایە رۆڵی رۆشنبیرانو کاریگەرییان زۆرتر بوو لەسەر رەوتی رووداوەکان, ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ زیادبوونی رۆڵی رێکخراوی بزاوتە کۆمەڵایەتییەکان لەدروستکردنی جموجۆڵە میللییەکانو درێژە پێدانیاندا.

لەگەڵ گەڕانەوەی راستڕەوەکان بۆ سەر کورسی حوکمڕانی فەرەنساو وەرگرتنی پۆستی سەرەك وەزیران لەلایەن "ئالان ژۆپێ"وە لەساڵی

1995دا, ناڕەزاییە کۆمەڵایەتییەکانی دژ بەسیاسەتی نیو–لیبرالیزم لەزیادبووندابوو.

کاتێك "ژۆپێ" پلانی خۆی بۆ چاککردنی سیستمی بیمەی کۆمەڵایەتی خستە بەردەم پەرلەمان (کەلایەنگرانی زۆرینەبوون تیایدا), چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد لەسەر ئاستی میللی بەتوندی ئەو پلانەی ڕەتبکرێتەوەو لەکۆتایشدا ناچاربێت بەکشانەوەی. کاتێك ئەو پلانە وەك پێشنیارێك خرایەڕوو, ژمارەیەك لەنوسەران و ڕۆژنامەنوسان و مامۆستایانی زانکۆ, لەڕیزی پێشەوەشیاندا "ئالان تۆرین و پۆڵ ریکۆرو ئۆلیڤێ مۆنگان و بیار رۆزانفالۆن و میشال فیفۆرکاو جاك جۆلیار" کە لەچەپی تەقلیدی *cfdt* (یەکێك لەسەندیکا هەرە میانڕەوەکان) نزیك بوون, بەیاننامەیەکیان دەرکرد بۆ پشتگیری کردن لەپلانەکەی "ژۆپێ"و داکۆکیکردن لەهەڵوێستەکانی خاتوو "نیکۆڵ نوتا"ی سەرۆکی *cfdt*, (ئەم خانمە لەناو تەواوی سەرۆکی سەندیکاکاندا تەنها کەسێك بوو لایەنگری پلانەکەی ئالان ژۆپێ بوو).

ئەوکات وادیار بوو تەواوی فەرەنسا لەچەپەوە بۆ ڕاست و زۆربەی ڕۆژنامەکان و کەناڵەکانی تەلەفزیۆن, ڕازی بوون بەو پلانەو ئەوەیان بەتاکە پرۆژەیەك دەزانی بۆ دەربازکردنی بیمەی تەندروستی و سیستمی خانەنشینی لەئیفلاسییەکی حەتمی. بەڵام دوای چەند ڕۆژێك هێزە کۆمەڵایەتییە زیندووەکانی کۆمەڵگەی فەرەنسی, سەلماندیان کەتوانای ئەوەیان تێدایە بەرگری لەدەسکەوتی چینە هەژارەکان بکەن و نابێت چاککردنی سیستمی بیمەی کۆمەڵایەتی لەسەر حسابی ئەوان بێت. لەمانگرتنێکی بچوکی کرێکارانی هێڵی شەمەندەفەرو میترۆکانەوە, حاڵەتەکە تەنییەوەو لەماوەی هەفتەیەکدا تەواوی فەڕەنسای گرتەوە, ئەم ڕووداوەش بەگرنگترین جموجۆڵی جەماوەری دەدرێتە قەڵەم کە لەدوای ساڵی 1968 فەرەنسا بەخۆیەوە بینیبێت.

لەم بارودۆخەداو لەگەرمەی مانگرتنەکاندا کۆمەڵێك ڕۆشنبیر (کە بۆردیۆش یەکێك بوو لەوان), ڕۆڵێکی گەورەیان لەیارمەتیدان و پشتیوانیکردنی ئەو بزاوتی پرۆتستۆکردنەدا بینی, بەمەش توانیان ئەو دیواری بێ دەنگی و چەواشەکاریە هەرەس پێبهێنن کەدەزگاکانی ڕاگەیاندن (ئەڵبەتە زۆربەیان لەگەڵ پلانەکەی حکومەتدا بوون) لەدەوریاندا هەڵیان چنیبوو.

ئەو ڕۆشنبیرانەی (بەبێ ئامەدەبوونی نوێنەرایەتی هیچ حزبێك) لەبەرواری 1995/12/5دا, بۆ پشتیوانیکردن لەمانگرەکان و بەرگریکردن لە داواکارییەکانیان, بەیاننامەیەکیان دەرکرد, (هیڵە سەرەکییەکانی ئەو بەیاننامەیەش بۆردیۆ دەست نیشانی کردبوو). تیایدا داوایان کردبوو ئەوروپای هاوڵاتیبون لەبەرامبەر ئەو ئەوروپایەدا پێکبهێنرێت کە ئەوروپای لیبرالیەو بەسەر هەمواندا سەپێنراوە. لەپای یەکێك لەگەورەترین ئەو خۆپێشاندانانەی لەو مانگەدا پاریسی هەژاند, ئێوارەی 1995/12/12 "بۆردیۆ" لەگەڵ ژمارەیەك ڕۆشنبیری تردا چاویان بەنوێنەران کرێکارو فەرمانبەرە مانگرتووەکان کەوت, بەتایبەت نوێنەری سەندیکای کرێکارانی هێڵی شەمەندەفەرو میترۆکان کە لەیەکێك لەشانۆ میللیەکانی پاریس و نزیك لەویستگەی شەمەندەفەری (لیۆن) کۆبوونەوە.

لەو هۆڵەدا "بۆردیۆ" لەسەرەوە دانیشتبوو, نوێنەری زۆربەی ڕێکخراوەکانی بزاوتی کۆمەڵایەتی چواردەوریان دابوو, ئەڵبەت ئەم کۆبوونەوەیە

لەغیابی پارتە چەپەکان و بەدوور لەباق و بریقی میدیاکان و کامێراکانی تەلەفزیۆن ئەنجامدرا.

کاتێک ڕێیاندا بە "بۆردیۆ" قسە بکات، بەهێواشی و بەهێمنی ڕوی تێکردن و وتی: (لەگەڵ چەند ڕۆشنبیرێکی تردا هاتووین تاپشتیوانی خۆمانتان پێڕابگەیەنین و داکۆکیتان لێبکەین، داکۆکی لەوانەی تێدەکۆشن لەپێناو ڕێگەگرتن لەنابوتکردنی ئەو شارستانیەتەی لەسەر خزمەتگوزاری گشتی و چوونیەکی لەمافدا دروست بووە، لەوانەش مافی خوێندن و تەندروستی و ڕۆشنبیری و توێژینەوە و هونەر و بەر لەهەموو ئەوانەش مافی کارکردن.. هەروەها پشتیوانی هەموو ئەوانەش بین کەدژایەتی ئەو ڕێگا چارە نوێیە دەکەن بەزۆر بەسەریاندا دەسەپێنرێت و مرۆڤ ناچاردەکات بەوەی دەبێت لەنێوان لیبرالیزم و بەربەریەتدا – هەڵبژێرێت).

"بۆردیۆ" لەمیانەی قسەکانیدا وتی: ( من گاڵتەم بەو فەیلەسوفە دێت – مەبەستی پۆڵ ریکۆر بوو کەبەر لەچەند ڕۆژێک بەیەکێک لەڕۆژنامەکانی وتبوو جیاوازیەک لەنێوان تێگەیشتنی عەقڵانی بۆ دنیا کە بەڕای ئەو بریتییە لەپلانەکەی ژۆپێ و لەنێوان ئەوەی حەزو ئارەزووی قوڵی خەڵکیە نابینم).

ئەو گۆڕانکاریانەی دواتر ڕوو دەدەن، نائەقڵانیەتی ئەم (تێگەیشتنە ئەقڵانییەی دنیا) ئاشکرا دەکەن و "ژۆپێ" ناچار دەبێت پرۆژەکەی بکێشێتەوە، سەرەڕای ئەوەی خاوەنی زۆرینەی دەنگەکانی ناو پەرلەمانیش بووە، لەبەرامبەردا ناچار دەبێت سیستمی بیمەی کۆمەڵایەتی بەشێوازێکی دیکە چاک بکات، کەبەرژەوەندی چین و توێژە نەدارو کەم دەستەکان لەبەرچاو بگیرێت.

لەئەنجامی ئەم ئەزموونەو ئەو دەرەنجامانەی لێی دەکەوێتەوە، بەتایبەت لایەنگری ماس میدیاکان لەپلانەکەی حکومەت و خیانەتی زۆر لەنوسەرو ڕۆژنامەنوسانی فەرەنسا لەڕۆحی ڕەخنەگرانەی سەردەمی ڕۆشنەگەری، "بۆردیۆ" کتێبەکەی (دەربارەی تەلەفزیۆن) دەنوسێت و لەخانەیەکی بلاوکردنەوەی نوێ *Liber Raisons dagir* چاپی دەکات. "بۆردیۆ" ئەم دەزگایەی بەهاوکاری چەند ڕۆشنبیرێکی تر دامەزراند، تاکۆتایی بەپاوانخوازی دەزگا زەبەلاحەکانی چاپ و بلاوکردنەوەی پاریس بهێنێت و کتێب بەنرخێکی هەرزان و بلاوکردنەوەی بەئاستێکی بەرز بۆ خوێنەران دەستەبەر بکات. لەگەڵ هەوڵی ئەوەی گوتارێکی ڕەخنەی نوێ بدرێت بەگوێی ئەو جەماوەرە بەر فراوانەدا. گوتارێک قودرەتێکی وەهای هەبێت، بتوانێت پەردە لەڕووی خۆ بەڕۆشنبیر زانەکان هەڵماڵێ و ئەو مافەیان لێ بسەنێتەوە کەتەنها ئەوان مافی ئەوەیان هەبێت قسە لەمەسەلە گشتیەکان و کاروباری هاوڵاتیاندا بکەن.

ئەوەی لەم مەسەلەیەدا جێی سەرنجە، ئەوەیە کەئەم پرۆژەیە لەچاپکردن و بلاوکردنەوە و خستنە بازاڕی کتێبەکانیدا. ڕێگایەکی گرتۆتەبەر تەواو بەپێچەوانەی میکانیزم و لۆژیکی بازاڕەوەیە، واتە کتێبەکانی ئەو خانەی بلاوکردنەوە نوێیە، نەچاپی قەشەنگ و سەرنجڕاکێشە و نەڕیکلام و پروپاگەندەی بۆ دەکرێت و نە لەجامخانەی کتێبخانەکاندا جێگەی دیارو زەقی بۆ دیاریدەکرێت، نە لەسەر تەلەفزیۆنەکانیش بەرنامەی فرۆشتن و روپامایی بۆ سازدەکرێت و نەئاهەنگی بۆ ڕێکدەخرێ، نەکۆنگرەی ڕۆژنامەنووسیشی بۆ دەگیرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زنجیرە کتێبەی ئەم دەزگایە بلاویدەکاتەوە، ژمارەیەکی زۆری

لێدەفرۆشێت و دەگاتە ئاستێکی زۆر بەرز. واتە تائێستاش دەکرێت لەناو خودی بازاڕدا، لەدژی لۆژیکی بازاڕو میکانیزمەکانی کاربکەین و دەست بەکاربین، بەتایبەتی کاتێك مەسەلەکە پەیوەندی بەڕۆشنبیری و فیکرەوە هەبێت.

### سینەماکاران و یاخی بوونی مەدەنی

هەر ئەوەندەی جموجۆڵەکەی 1995 کۆتایی هات، ئیتر سەرەتاکانی جەنگێکی سیاسی نوێ بەدەرکەوت کەتیایدا چەمکی رۆشنبیری دەستە جەمعی لای "بۆردیۆ"، دەبێتە فاکتەرێکی سەرەکی بۆ تێگەیشتن لەچۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەو جەنگەو بردنەوەی لەدژی حکومەتی راستڕەوو یاسا تازەکانی، دەربارەی کۆچ و بارودۆخی مافی پەناهەندەیی لەفەرەنسادا.

بۆ تێگەیشتن لەناوەڕۆك و گرنگی ئەم شەڕە، پێویستە هەندێك بگەڕێینە دواوە. لەسەرەتای سالآنی هەشتاوە، راستڕەوە توندڕەوەکانی فەرەنسا دەرکردنی بیانیەکانیان لەو ولآتەدا کردۆتە خاڵی سەرەکی بەرنامەی هەڵبژاردنەکان، چونکە ئەوان بەهۆکاری سەرەکی ئەو قەیرانە ئابوری و بێکارییە زۆرە دەزانن کە لەفەرەنسا بەدەستیەوە دەناڵێنێت.

لەم رووەوە "جان ماری لۆپن" و پارتە توندڕەوەکەی، توانیان کۆچبەران بکەنە یەکێك لەمەسەلە سەرەکییەکانی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن و مشتومڕی گشتی سیاسەتمەدارانی فەرەنسا (بەراستڕەوو چەپڕەوەکانیەوە)، هەروەها بیکەنە سەرباسی ئەو رۆژنامەو کەناڵی راگەیاندنانەی هەواداری خۆیانن و وەك ئەوان بیردەکەنەوە. ئیتر بەرەبەرە هەموان قەناعەتیان هێنا بەوەی کەکێشەیەك لەئارادایە، بەناوی (کێشەی پەنابەرانەوە) و چارەسەریشی تەنها لەڕێگای توندکردنی یاساکانی کۆچ و پێدانی مافی پەنابەرێتییەوە دەبێت. لەم بارەیەوە ئەگەر جیاوازی و ناکۆکییەك لەنێوان راستڕەو و چەپڕەوەکاندا هەبێت، ئەوا لەسەر توندیی ئەو یاسایانەیە نەوەك لەسەر جەوهەرو ناوەڕۆکی یاساکان خۆیان بێت.

لەهەلومەرجێکی پڕ لەدژایەتیکردنی وەهاداو پاش دەرچوونی یاسا گەلێکی توند دەربارەی کۆچکردنی بیانییەکان بۆ فەرەنسا (کە بەیاساکانی باسکوا ناسرا) و ئەوەندەی تر گوزەرانی پەناهەندەکانی نالەبارتر کرد، "بۆردیۆ" لەبەرواری 1996/3/29 لەگەڵ کۆمەڵێك رۆشنبیردا بانگەوازێك بلآودەکەنەوە، وەك پاڵپشتی کردنێك لەبیانییەکانی ناو فەرەنسا و تیایدا ئاماژە بەوە دەکەن کەدەکرێت یاخیبونێکی مەدەنی بەرپابکرێت.

لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی ئەوانەی بەحوکمی ئەو یاسایانە دەچوونە لیستی پەناهەندە ناشەرعییەکانەوە، هەندێك لەوانە دەست دەکەن بەپێکهێنانی گروپێك بەناوی *Sana papier* و داوای ئەوە دەکەن چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە، ئەم گروپە بەیارمەتی هەندێك لەرێکخراوەکانی بزاوتی کۆمەڵایەتی ناو فەرەنسا (لەهاوینی 1996) داو بەمەبەستی فشار خستنە سەر حکومەت، لەناو جەرگەی پاریسدا دەست بەسەر کڵێسای (سانت بێرنار)دا دەگرن، بەڵام هێندە نابات کە بەزەبری هێز ئەو جێگایەیان پێ چۆڵ دەکرێت.

لەکاتێکدا ئەندامانی ئەم گروپە بەردەوامبوون لەسەر هەوڵەکانی خۆیان بۆ یەکلاکردنەوەی چارەنوسیان، ئالەو کاتەدا راستڕەوەکانی فەرەنسا و لەڕێگای پیاوێکی وەك "جاك شیراك"ەوە، پۆستی سەرۆکایەتیکردنی ولآت دەگرنە دەست و حکومەتە تازەکەشی بەسەرۆکایەتی "ئالان ژۆپێ" خۆی بۆ

دەرکردنی یاسا گەلێکی نوێ سەبارەت بەکۆچ و مافی پەنابەرێتی ئامادە دەکات, ئەو یاسایانەش زۆر لەوانەی پێشوتر توندتر بوون.

سەرەتای مانگی شوباتی 1997 و لەسایەی ئەو راپرسیانەی زۆربەیان دژ بەپەنابەران بوون, حکومەت پرۆژەی یاسایەك دەخاتە بەردەم پەرلەمان, ئەم پرۆژەیەش ئەوەندەی تر مەرجی چونە ناو فەرەنساو مانەوە لەو ولأتەدا قورستر دەکات. هەروەها داوا لەهاولأتیانی فەرەنساش دەکات هەر بیانییەك بڕیاری جێهێشتنی ئەو ولأتەیدا, دەبێت دەزگاکانی پۆلیسی لێئاگادار بکەنەوە.

هەندێك لەڕۆشنبیران پێیان وایە ئەم پرۆژە نوێیە, جۆرێکە لەتێوەگلاندنی هاولأتیانی فەرەنسا کە بەناچاری لەژێر زەبری یاسادا دەیکەنە (کرێ گرتەی) پۆلیسی ئەو ولأتە کە لەهەوڵی بەردەوامدایە بۆ دۆزینەوەی ئەوانەی مافی پەناهەندەیان نییە, تادەسگیریان بکات و رەوانەی ولأتانی خۆیانیان بکاتەوە.

حکومەت بەهۆی ئەوەی زۆرینەی پەرلەمانی لەگەڵدا بوو, پێی وابوو دەتوانێت هەر یاسایەك کەبیەوێت بیسەپێنێت. حزبە چەپڕەوەکانیش لای خۆیانەوە بەچاکیان نەزانی دژایەتی یاسایەکی لەوجۆرە بکەن, مادەمەکی زۆرینەی پەرلەمانیان لەگەڵدا نییە. هاوکات راپرسیەکانیش ئاماژەیان بەوە نەدەکرد کەخەڵکی رێگربن لەبەردەم پەرلەماندا تابڕیار لەسەر پرۆژەیەکی وابدات.

سەرەتاکانی قسەکردن لەسەر پرۆژەی یاسایەکی لەوجۆرە,وەهادەریدەخست کەهەموو شتێ بەرەو ئەوە دەچێت لەلایەن ئەندامانی پەرلەمانەوە بڕیاری لەسەر بدرێت, تەنانەت زۆربەی ئەو ئەندام پەرلەمانانەی سەر بەلیستی سۆسیالیستەکان بوون, ئامادەنەبوون و بەشداریکردنیان لەو گفتوگۆیانەدا بەهێند وەرنەگرت, مادامەکی پێشوەخت ئەنجامەکەیان لەلائاشکراو روون بوو.

لەبەرامبەر خەمساردی و گوێ پێنەدانی چەپی فەرەنسی و سیاسەتمەدارە لێهاتووەکانیان بەم مەسەلەیە, ژمارەیەك لەڕۆشنبیرانی ئەو ولأتە دەیسەلمێنن کەسیاسەت ئەوە نیە شوێن راپرسی و دەسکەوتی خێرا بکەوێت, بەڵکو دروستکردنی گوتارو چەمك و ئامراز گەلێکی وا لەکاری سیاسیدا کەبتوانێت کاریگەری لەسەر واقعی کۆمەلأیەتی و لەسەر ئەو شتەش هەبێت کەپێی دەڵێن (رای گشتی).ئاراستەی کارکردنێکی لەمجۆرەش لەکاتی دەرکردنی (یاساکانی باسکوا) دەستیپێکرد, ئەو یاسایانەی هەلەمەرجێکی ناهەمواریان خوڵقاندو بوونە مایەی ناڕەزایی رۆژانەو بەرخوردی بەردەوام لەلایەن گروپی *SANS PAPIER*.

لەگەڵ دەرچونی ئەم یاسا تازانەشدا, ژمارەیەك لەسینەماکاران کەوتنە خۆ بۆ دەرکردنی بەیانامەیەك بەناوی (بەیاننامەی 69)وە, لەم بەیاننامەیەدا داوا لەهاولأتیان دەکرێت, دژ بەو یاسایانە دەست بدەنە یاخیبونی مەدەنی و رازیش نەبن بەوەی پۆلیس لەجێکۆڕکێ کردنی هاولأتییە بیانیەکان ئاگادار بکەنەوە. هەر لەم بەیاننامەیەدا سینەماکاران ئامادەیی خۆیان نیشاندا بۆ لەئەستۆ گرتنی هەر ئاکام و سەرنجێك کە لەو کارانە بکەوێتەوە.

زۆر ناخایەنێت و دوای چەند رۆژێکی کەم, بەیاننامەیەکی بێشومار لەلایەن مامۆستایانی زانکۆکان و زانایان و ئەندازیاران و پزیشککاران و پارێزەران و خوێندکارانەوە دەردەچێت, وەك

پشــتیوانیكردنێك لــە بەیاننامــەی ســینەماكاران و ڕەزامەنـدی نیشـاندان بـۆ ئەنجامـدانی یـاخیبونێكی مەدەنی. دوای ئەوەی تـەیاركردن و سـازدانی خـەڵك بـۆ ئـەم مەسـەلەیە گەیشـتە ئەوپـەڕی، نـاڕەزایی دەربـــڕین بەشــێوەی خۆپێشـــاندان و مـــانگرتن شەقامەكانی گرتەوە وەك ئەمری واقیع خۆی بەسەر دەزگاكـانی ڕاگەیانـدن و پەرلـەمانتاران و حزبەكانـدا سـەپاند. ئـیتر لێـرەوە هاوسـەنگی هێـز دەسـتی بـەگۆڕان كـرد و حكومـەت دركـی بـەوە كـرد مەحاڵـە بتوانێت سزای هەموو ئەوانە بدات كەسەرپێچی ئەو یاسایانە دەكەن، ئەستەمیشە بتوانێت یاسا گەلێكی وا بـەزەبری هێـز بسـەپێنێت، هـەر بۆیـە دەسـتی بەپاشەكشـــەكرد و لـــەو بڕیـــارەی پەشـــیمان بووەوە.كاتێـك مەسـەلەكە بـەمجۆرە شـكایەوە، ســینەماكاران ڕێكخراوەكــەیان هەڵوەشــاندەوە و داوای ئەوەیان لەئەندامەكانیان كرد كەهـەر كەسـەو بەتەنها بەپێی توانای خۆی، درێژە بەكارو چالاكی خۆی بدات.

بەیاننامـەی ئـەو (69) سـینەماكارەو شـێوەی كـاركردنی ریكخراوەكـەیان، هـەروەها ئـەو توانـا بـەرزەی نیشـانیاندا لەتێگەیشـتنە میكـانیزمی كـاركردنی دەزگاكـانی ڕاگەیانـدن و بـەكارهێنانی ئـەوەش لـەپێنا و هەوڵەكانیانـدا و دووركەوتنـەوەی هەریەكەشـیان لەچـاوی كامێراكـانی ڕاگەیانـدن، لەگەڵ ئامادەیی بەرفراوانیان لەڕووی ڕاگەیاندنەوە وەك گروپێـك كـەكاری بەكۆمـەڵ دەكـەن، پاشـان هەڵوەشـاندنەوەی ئـەو كۆمەڵەیـە دوای پێكـانی مەبەستەكانی، چاكترین بەڵگەیەكە لەسـەر بـەتوانای ڕۆشـنبیری دەسـتە جـەمعی و هێـزو قـودرەتی ئـەو، لەتێكشـكاندنی ڕێسـاكانی گەمـەی سیاسـی و گەیاندنی دەنگی هـەموو ئەوانـەش كە بەشێوەیەكی زۆرەملـێ لـەجیهانی سیاسـەت و ئـەو كـەناڵی ڕاگەیاندنانـەی دەوری خۆیـان شـوار بەنـدكردووە، دەركراون.

### بێكاران و هۆمۆ سێكسواڵەكان

"بۆردیــۆ" بەپێچــەوانەی یــەكێك لــە بەڵگەنەویســتەكانی فیكــری ماركســی و، وەك درێــژەدانێك بــەتێزەكانی *E.P,THOMPSON*، لەكتێبەكەیـدا سـەبارەت بەدروسـتبونی چـینی كرێكـاران لەبـەریتانیا و لێكۆڵینـەوەكانی *luc boltanski* دەربـارەی توێـژی كـادێران لـە فەرەنسـا، نایـەوێت ماهیـەتێكی حەقیقی و ئەزەلی كـە بەفیعلی لـەواقعی كۆمەڵایەتیدا هـەن، بداتـە چەمكی (چینی كۆمەڵایـەتی) یـاخود (ریزبەنـدی كۆمەڵایـەتی)، چـونكە ئـەو پێـی وایـە (چـینە كۆمەڵایەتییـەكان بونیان نییەو ئەوەی هەیە كایەی كۆمەڵایەتیە، واتـە ئـەو كایەیـە لـەجیاوازی و وێـك نەچـون كەتیایـدا چـینەكان لـەدۆخێكی گریمانـەیی *VIRTUEL* دان، گـەر وردتـر قسـە بكـەین دەتـوانین بڵێین چینەكان شتێكن دەبێت دروست بكرێن، نـەك وەكـی پێـدراوێكی عـەینی و كـۆنكرێتی سـەیریان بكەین)[10].

بـەڵام میكـانیزمی دروسـتكردن و پرۆسـەیەكی لەمجۆرە، بەرەنجامی بەرەو پێشچونێكی مێژوویی و لەڕێگای ئەو دامودەزگاو ڕێكخراو و حزبانـەوە دێتە بـوون كـە لـەڕێی خەباتیانـەوە بـۆ تـەیاركردن و مۆبیلـەیزەكردنی خـەڵك و لـەڕێی نوێنەرایـەتیكردن و بـەناوی ئـەو گروپـە كۆمەڵایەتیانـەوە.(ئیتر چـینی كرێكاران بن یاخود خوێنكاربن یان كادێر)، هـەوڵی بۆ دەدەن و وای لێدەكەن دووچار بوون و ئامادەگی هـەبێت، جـارێ لەبۆچـون و سـەیركردنی خـەڵك بـۆ واقعی كۆمەڵایەتی و جارێكی دیكەش لەناو بونیادی ئەو واقیعە خۆیدا.

ئەگـــەر نـــاوی (بێكـــاران—Les chomeurs) لـــەكۆتایی ســـەدەیی نـــۆزدەدا لەئـــەورووپا وەك ڕێوشـوێنێكی ئیـداری هاتبێتـە ئـاراوە, تـا هـانی دامودەزگاكـانی خـۆی بـدات بـۆ ئـەوەی سـەرژمێری ئەوانە بكەن كـەبێكارن, ئەمـەش وەك سـەرەتایەك بـۆ مامەڵـــەكردن لەگـــەڵ ئـــەو كێشـــەیەو دۆزینـــەوەی چارەسـەر بـۆی. ئـەوا گۆڕانكارییـەكانی دوای ئـەو قۆناغـە بەتایبـەتی دوای دووەم جـەنگی جیهـانی و بەدیاریكراویش لەسەرەتای هەشتاكانەوە, ئەوانـەی كردووە بەكەسانێك كەهاوشانی پەراوێز خراوەكان و وەلانراوەكانی بازاڕی كاربن و هەروەها ببنە نمونەی نـــەداری و دەســـت كـــورتی و بـــەش مەینـــەتی. زۆر لەوبێكارانەی ناو فەرەنسا شەرم لـەخۆیان دەكەن و ئـەوەیان پـێ قـووت ناچـێت هـەڵگری نـاوێكی لـەو جـۆرەبن, ئـیتر چـۆن دەتـوانن وەكـی شوناسـێك لەساتەوەختی ئێستادا بەخۆیانییەوە بكەن و ڕێگای ئـەوەیان پێبـدات كۆبونـەوەو خـۆ سـازدان بكـەن, لەپێناو بەرگری كردن لەمافەكانیان و باشتر كردنی ژیان و گوزەرانیان.

بـــەڵام خـــەباتی ســـاڵانێكی دوورو درێـــژی ژمارەیـــەك لـــەو ڕێكخراوانـــەی زمانحـــاڵی ئـــەوانن, بەتایبەتی گرووپی (كار لەدژی بێكاری Agir contrele chomage), زەمینـە بـۆ جموجـوڵێكی وەهـا خـۆش دەكـــات كـــە لەســـەرەتای ســـاڵی 1998 تـــەواوی فەرەنســا دەهـــەژێنێت و بێكـــاران وەك توێـــژێكی كۆمەڵایـەتی سـازو ئامـادە نیشـان دەدات كـەتوانای ئـەوەی هەیـە, داكـۆكی لەمافـەكانی خـۆی بكـات و فشـاریش بخاتـە سـەر حكومـەت و ئـەو سـەندیكا تەقلیدیانـــەی هەمیشـــە وەكـــی ژمارەیـــەك لـــەناو دۆسێكانی خۆیاندا مامەڵە یان لەگەڵدا كردون.

كێشەی سەرەكی بێكاران لەوەدا بوو, لـەنێوان شـارە گەورەكانـدا دابـەش بوبـون و هێـزو توانایـان پەرت و كۆكراوە نەبووە ئەمانەش ڕێگربوون لـەوەی بڕژێنـە سـەر شـەقامەكان و خۆپێشـاندان سـاز بـدەن. ســەرەڕای نــەبوونی سەرچـاوەیەكی دارایــی وەهــا كـــەبتوانن بارەگایـــەكی پێبكەنـــەوە یـــاخود دەزگایـــەكی ئیـــدارییان هـــەبێت, تابتوانێـــت مۆبێلیزەیـــان بكـــات و یـــان دەســـت كراوەبێـــت لـــەوەی ژمارەیـــەك بڵاوكـــراوە بـــەناوی ئەوانـــەوە دەربكـــات, بـــەجۆرێك گوزارشـــت لەهەلومـــەرجی ژیانیـــان بكـــات و داواكارییـــەكانیان بخاتـــەروو, لەهەمانكاتـدا سـەرنجی مـاس— میـدیاكان بـەلای كێشەكانیاندا ڕاكێشێت و دەوڵەت ناچاركات بـەوەی گوێیان لێبگرێت.

لەهەلومـەرجێكی ناهـەمواری وادا هەنـدێك لـەو ڕێكخراوانــەی زمانحــاڵی ئــەوانن, دەســت دەدەنــە ئەنجامدانی چەند پرۆسـەیەكی بوێرانە كەدەلالـەتی ڕەمـزی قوڵیـان هەیـە. بـەم هەنگاوانـەش دەتـوانن بێكــاران لــەهێزێكی پــەراوێز كــەوتووەوە بكەنــە هێزێكی چالاك و بیانهێننـە مەیدان, تەنانـەت وایـان لێبكـەن ببنـە هێزێكـی كۆمەڵایـەتی ڕاسـتەقینەی وابتـــوانن داواكارییـــەكانی خۆیـــان بخەنـــەڕوو. لەبەرامبەریشـــدا حكومـــەت ناچـــاربكەن ئـــەو داواكارییانـــە بەهێنـــدە وەربگرێـــت. بـــەمجۆرە لەسەرتاســـەری وڵاتـــی فەرەنســـادا, بێكـــاران بەشـێوەیەكی شـێلگیرانە دەسـت بەسـەر ژمارەیـەك جێگاو دامەزراوەی گشتیدا دەگرن, كەهەریەكـەیان دەلالــەتی ڕەمــزی ئاشــكرای خــۆی هەیــە. هــەموو جـــــارێكیش كـــــار بۆئـــــەوە دەكـــــەن تـــــا دەزگاكانیڕاگەیانـــــدن ئامـــــادەبن, بۆئـــــەوەی ڕووداوەكــان وەكــو خۆیــان بگوازنــەوەو ڕێگــەش لـــەوەبگرن كـــەپۆلیس هێزیـــان لەبەرامبـــەردا بـــەكاربهێنێت. هەنـدێ جـاریش دەكەونـە ئـەوەی ستودیۆی كەناڵە تەلەفزیۆنییـەكان كۆنترۆڵ بكـەن,

بەمەبەستی ئەوەی دەنگی خۆیان بگەیەننە زۆرترین ژمارەی هاوڵاتیان.

بۆماوەی چەند هەفتەیەك دەوڵەتو دەزگاكانی ئاســـــایش لەنیگەرانی وپەشــــێویو حاڵـــــەتی ئامادەباشیدا دەبن، لەترسی ئەوەی نەك ئەوانە نووسینگەی یەك لەوەزیرەكان یاخود بارەگایەكی گشتی كۆنترۆڵ بكەن.

دوای ئەوەی بێكاران دەتوانن بچنە ناو *Superieure Ecoie normaie* و كۆنترۆڵی ئەو دامەزراوەیە بكەن, كەیەكێكە لەگرنگترین قوتابخانە دەستەبژێریەكانی فەرەنساو دەكەوێتە ناو جەرگەی (الحی اللاتینی) یەوە, "بۆردیۆ" پەیوەندیان پێوە دەكاتو وتەیەك ئاراستەی مانگرتووەكان دەكات لەو وتەیەیدا باس لە (بەهای كاری تێكۆشانو خەباتگێڕی دەكات كەبەبێ بوونی ئەوە شتێ نەدەبوو لەشێوەی ئەو بزاوتە كۆمەڵایەتییە رووی بدایە), هەروەها لەدرێژەی قسەكانیدا سوپاسی تەواوی ئەندامانی ئەو بزوتنەوەیە دەكات كە لەڕێگای ئەو كارەیانەوە (لەپێناو بێكاراندا), مەحاڵیان كردە واقیعو (موعجیزەیەكی كۆمەڵایەتیان خوڵقاند).

لەڕێی ئەم كارەوە (بێكاران) توانیان ئەو تەوقی پەراوێز خستنو بێ دەنگیەیەی لەدەوریان هەڵچنرا بوو, بشكێننو بۆ هەموو لایەكی بسەلمێنن كەئەوان بەتەنها ژمارەو ئامارێك نین لەلیستی حكومەتدا, بەڵكو خەڵكانێكن دەربەستی چارەنوسی خۆیاننو لایەنێكی سەرەكیشن لەهەر دانوستانو بریارێكدا كەتایبەت بێت بەوانو لەهەلومەرجی ئەوان بكۆڵێتەوە. ئەم جوڵانەوەیە ئاشكرای كرد كە لەپشت هەر بێكارێكەوە, حاڵەتێكی ناهەموار لەبێ نەوایی و برسیەتی و سەرگەردانی تەواوی خێزانێك لەئارادایە. ئەگەرچی فەرەنسیەكان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەكانیان ئەمە نابین, بەڵام حەقیقەتێكەو بەفیعلی لەهەموو شارو گەڕەكێكدا هەیەو پێویستی بەهاناوە چونێكی خێراو بەپەلە هەیە, هەروەك چۆن پێویستی بەوەشە كە لەماوەیەكی دووركایاندا چارەسەری ریشەیی بۆ بدۆزێتەوە. لەگەڵ پشتیوانی كردنی لەبێكاران, "بۆردیۆ" لەم چەند ساڵەی دوایشدا رۆڵێكی فیعلی و گرنگی دەبێت لەپشتگیری كردنی هۆمۆسێكسواڵەكان, بۆ بەشەرعی ناسینیان وەك توێژێكی كۆمەڵایەتی كەداواكاری خۆیان هەیەو دەیانەوێت لەمافدا بەیەك چاو لەگەڵ هاوڵاتیانی تردا سەیربكرێنو پەیوەندیەكانیان بەشێوەیەكی ئاشكرابێت. هەروەها رێگەی ئەوەیان بدرێتێ كەخێزان پێك بهێنن, بەڵام بەجۆرێك كەبنەمایەكی یاسای روونو ئاشكرای هەبێت.

"بۆردیۆ" لەگەڵ ژمارەیەك رۆشنبیری تردا بەیاننامەیەك ئیمزا دەكات (رۆژنامەی لۆمۆند, بەرواری 1996/3/1), تیایدا داوای ئەوە دەكات هۆمۆسێكسواڵەكان هەموو مافێكی خۆیان پێبدرێت. لەدوای یەكێك لەو رێپێوانانەشدا كەهۆمۆسێكسواڵەكان رێكیان خستبوو, "بۆردیۆ" داوای ئەوەیان لێدەكات ئەوانیش بێنو ببنە بەشێكی سەرەكی بزوتنەوەی كۆمەڵایەتی ئەو بزوتنەوەیەی لەهەوڵی ئەوەدایە بزاوتێكی سیاسی تایبەتو جیاواز دروست بكات.

لەدوایین كتێبیدا (*ladominaton masculine*) كە لەساڵی 1998دا چاپكراوە, "بۆردیۆ" نمونە گەلێك دەربارەی دەسەڵاتی (نێرینە) دەخاتەڕوو, ئاشكرای دەكات كەچۆن چۆنی رەگەزی پیاوانو ژنان وەك گروپێكی كۆمەڵایەتی لەكۆمەڵگەیەك لەكۆمەڵگەكاندا و لەڕێی رەوتێكی مێژوویی دیاریكراوەوە دروست دەبن, لەوێدا باس لەو رۆڵە

دەکات کەدەسەڵاتی نێرینەو توندوتیژی رەمزی ئەو دەسەڵاتە لەرێی رەوتێکی مێژوویی دیاریکراوەوە دەیگێرێت, "بۆردیۆ" ئەو کتێبەی بەپاشکۆیەك کۆتایی پێدێنێت, دەربارەی هۆمۆسێکسوالّەکان و رۆڵی سێنترالانەی ئەوان لەدەسکاریکردن و لەقکردنی ئەو بەڵگە نەویستانەی لەم بوارەدا بالادەستن و بەدرێژایی مێژوو وەك میراتیەك ماونەتەوە.

## پەراوێزەکان

*1-P.Bourdieu Questins de Sociologe Paris, seulil, p76.*

*2-P. Bourdieu, Meditation Pascaliennes, Paris, seuil, 1997, P.16.*

*3-Les inrockptibles, n.gg,avril 1997.*

*4-Actes de la recherche en sciences sociales, n. 36-37, fevrier-mars 1981, P.1.*

*5-Les regles de lart, Paris, Ep. De seuil, 1992, P.546.*

6-هەمان سەرچاوەی پێشوو, ل558.

7-لێرەدا ئەو بەیاننامانەم دێتەوە بیر کەرۆشنبیرانی عەرەب بۆ داکۆکی کردن لە(گارۆدی) و گوێ نەدانە رای گشتی لەفەرەنسا (بەبۆچونی ئەوان) مۆریانکردبوو, ئەو رۆشنبیرانە ئەوەیان بۆچوە سەر بێ ئەوەی دووچاری هیچ مەترسیەك بن, بەلام ئەو رۆشنبیرانەیان لەبیرچوو کە لەولاتەکانی خۆیاندا زیندانیکراون, چونکە ئەوە کارێکی پر مەترسییە.

*8-P.Bourdieu, A.Desplechin Centeetien (Que faire?), Les inrockuptilb Les,n. 93 mars 1997.*

9-بۆ زیاتر ئاگاداربون لەبانگەوازی سینەماکاران و کاریگەری بیروبۆچونی "بۆردیۆ" لەسەر جموجۆڵەکانیان, بروانە ئەو دیدارەی (لۆمۆند) بەرواری 1991/3/19 لەگەڵ زۆربەی زۆری سینەماکاران و بەتایبەت لێدوانەکەی *A.Desplechin* کەدیارترین کەسێکی ئەو بزاوتەیە و خۆشی بەیاننامەکەی نووسیوە, هەروەها بروانە دیداری *A.Desplechin* لەگەڵ "بۆردیۆ", سەرچاوەی پێشوو.

*11-P.bourdieu, contre- feux, Paris, liberraison dagir, 1998, P.102.*

## سەرچاوە

ملحق جریدة (النهار), العدد 381, 26حزیران 1999.

# ڕەخنە و لێکۆڵینەوە

- ئەدەب چییە؟

رۆجەر فۆلەر

لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

- رابلە و مێژووی پێکەنین

میخاییل باختین

لە فارسییەوە: عەزیز مورادی

- بەیەکگەیشتنی کورد و ڤیکینگەکان

رۆهات ئالەکۆم

لە سویدییەوە: کاوە ئەمین

- شەخسی و تاکە کەسی

لیوناردۆ مایکلز

لە فارسییەوە: شەیدا سەلاح

# ئەدەب چییە؟

## (بەشی یەکەم)

ڕۆجەر فۆلەر

لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

(1)

### چەند ئاماژەیەکی بەرایی

لەبواری لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکان و لەچوارچێوەی چەند کتێبێکی گشتیدا" چەند ناونیشانێکمان بەرچاودەکەون، وەك:

*ئەدەب چییە؟ جان پۆڵ سارتەر.

*Jaen Pqul Sarter, whats is Literature? 1949, 1967.*

*تیوری ئەدەب: ڕێنی وێلك و ئۆستن وارن.

*Rene wellek &Austin Warren, Theory of Literature. 1948,1967.*

*تیوری ئەدەب: تزڤێتان تۆدۆرۆڤ.

*Tzvetan Todorov, Theorie de Litterature, 1965.*

*سەرەتایەك دەربارەی تیوری ئەدەب: تێری ئێگڵتن.

*Terry Eagleton, Literary Theory:An Introduction. 1983.*

*تیوری نوێی ئەدەب... سەرەتایەکی بەراوردکار: ئان جێفەرسن و دێڤد رۆبی.

*Ann Jefferson & David Robey, Modern Literary Theory… A Comparative Introduction.1982.*

ئەم ناونیشانانە روون و راستەوخۆن و بەخۆڕسکی هاتوون، واتە پەیوەندیی وردیان بەسیاقی ئاسایی بواری لێکۆڵینەوەکەوە نییە. رەنگە خودی ئەم کتێبانە لەتاوتوێکردنی رەخنەیی ئەم رستانەدا ئیستیان کردبێ (ئیگڵتن لەبەشێکی کتێبەکەیدا ئاوڕێکی لەم بابەتە داوەتەوە). بەڵام شارەزایانی بوارەکە خۆیان دەزانن مەبەست لەو رستانە چییەو بەباشی لەوەدەگەن کتێبگەلێك لەژێر ئەو ناونیشانانەی سەرەوە چ مەغزایەکیان هەیە... بەڵام داخۆ ناوەرۆکی راستەقینەی ئەو فرێزانە چین کە هەروا بەئاسانی خۆیان نادەن بەدەستەوە؟!.

پرسیارکردنی بەلاغیانە دەربارەی ئەوەی "ئەدەب چییە؟" زۆر بەڕوونی ئەو مانایە دەگەیەنێ کە قەوارەیەك هەیە ناوی ئەدەبە" بەڵام لەهەمان کاتدا ئەوەش دەگەیەنێ کە پێناسەکردن و دەستنیشانکردنی ئەو قەوارەیە بێ کێشە نییە. سارتەر لای خۆیەوە لەکتێبەکەیدا هەوڵیداوە لەبری خوێنەر ئەم کێشەیە چارەسەربکا. بەهەمان شێوە گریمانەی هەر نوسینێك دەربارەی "تیورەی ئەدەب" بوونی قەوارەیەك بەناوی ئەدەبەوە دەسەلمێنێ، واتە خستنەڕووی چەند گریمانەیەکی تیوری پەتی دەربارەی ئەدەب، لەبابەتی گریمانەی ئەو زانایانەی (کە لەبواری فیزیکدا) تێزی تیورییان لەسەر چەند بابەتێك پێشکەشکردوە کەبایەخدارو گرانن، وەك تیوری موگناتیزیو پێکهاتە تیشکیەکان. مەرج نیە ئەو ناونیشانانەی کە پەیوەندییان بەفرێزی "تیوری ئەدەب"ەوە هەیە ئاماژە بۆ بوونی ئەدەب بکەن، بەڵکو دەلالەت لەو بزاوتی تیورسازییە دەکەن کە بەبێ پلانێکی پێشوەخت و لەڕستەی دەسپێکدا ناونرا "بواری لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکان". ڕەنگە تیورسازیی لەم بوارەدا ، هەروەك دواتر دەبینین، چەند ئامانجێك لەخۆبگرێ" بەڵام ئامانجی سەرەکی ئەوەیە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە داخۆ ئەدەب چییە؟. ئەو گوتارەشی کە لەم بابەتە دەدوا لەکەلەپوری ڕەخنەییدا پێیدەوترا "هونەری شیعر"، بەڵام هەنوکە بە "تیوری ئەدەب" پێناسەدەکرێ.

## سەرنج:

ئەم وتارە، هەوڵێکە بۆ دەستنیشانکردنی بیرۆکەی "ئەدەبی پایەبەرزو ئەفرێنەر"، یان "بیرۆکەی باڵاو ئیستاتیکی ئەدەب". تێبینی دەکرێ وشەی ئەدەب لەنێوان دوو جووت کەوانەدا بەکارهاتووە وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو بەهاو تایبەتمەندییەی کە پێشنیارو بۆچوونەکان پێیدەبەخشن، کە مەرج نییە نوسەر پابەندبێ پێوەیان.

ئێمە شوێن ئەو تێزانە ناکەوین کە خستماننەڕوو: مەبەستم ئەو تێزانەیە کە باسیان لەقەوارەیەك کردووە بەناوی "ئەدەب"ەوە" بەو مانەیەی ڕاستە ئەدەب هەیە بەڵام پێناسەکردنی قورسە. "ئەدەب" ملکەچی جۆرێکە لەتیورسازی کە ڕێگەخۆشدەکا لەبەردەم لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکانی ئایندەدا، لەپێناو دۆزینەوەی تیورو پێوەرەکانی پێناسەی ڕاست و ڕەواندا. هیچ تیوریك بەم جۆرە ناخرێتەگەڕ، چونکە مەسەلەکە بڕیاردانی تیورەکە نییە لەسەر شتێك یان چەمکێکی پێشوەخت، پاشان دانانی پێودانگی ڕاست (یان نزیککەوتنەوە بەلانی کەمەوە) لەو شتە، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەر تیورێك شتێك یان چەمکێك دادەڕێژێ لە مانا ڕاستەقینەکەیدا. پاشان ئەدەب قەوارەیەکی جیاوازە پشتئەستورە بەو چەمکەی کە تیورەکە دایدەڕێژێ جائیدی تیوری ڕۆمان یاکۆپسن *Jakobson* بێت، یان نۆرسرۆب فرای *Frye*، وۆڵفگانگ ئایزەر *Iser*، یان هەرکەسێکی تر بێت. کتێبەکانی ئیگڵتن *Eagleton*، جیفرسۆن *Jefferson* و ڕۆبی *Robey*، هەروەها ئەم کتێبەی ئێمەش... هەر هەموویان بەدیاریکراوی باس لەوەدەکەن چۆن تیورە جیاوازەکان قەوارەی جیاوازیان لەژێر ناونیشانی "ئەدەب"دا گەڵاڵەکردووە. ئەڵبەتە ئەو ڕێژگەرییەش بەڵگەی تەندروستییە، چونکە زیندوویێتی لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکان و ئاستی ئەفراندن و بایەخی فیکرییان بەدەردەخا.

دۆخی لێکۆڵینەوەیەکی لەمجۆرە بەشێوەیەکی ئاشکرا لەناونیشانی کتێبێکدا ڕەنگیداوەتەوە لەژێرناوی لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی تیوری ئەدەب *In Search of Literary theory (Bloomfield, 1972)* کە چەند وتارێکی لەخۆگرتووە. بەڵام یەکەمین بەشداری لەو کتێبەدا م.ھ.ئەبرامز *M.H.Abrams,1972* ئەنجامیداوە کە بەشێوەیەکی هوشیارانەو پۆزەتیڤانە باس لە فرەتیوری دەکا. ئەبرامز لەدەسپێکی ئەو کتێبەدا باس لەهێرشی فەیلەسوفگەلێکی وەك مۆریس ڤیتز *Weitz* دەکا بۆ سەر تیورسازی ئەدەبی لە پەنجاکان و شەستەکاندا (بۆ نمونە بڕوانە: *Weitz,1964*). ئەبرامز پێیوایە ڕەخنەگرانی ئەو تیورسازییە جەخت لەسەر ئەوەدەکەن کە پرسیارگەلێکی وەك "تراجیدیا چییە؟" یان "شیعر چییە؟"، پرسیارگەلێکی ساختەن، چونکە گریمانەی وەهمێك دەخەنەڕوو کە گوایا تاك گەوهەرێك هەیەو پێویستی بە دەستنیشانکردن هەیە. لێرەوە پرنسیپەکەی فیتگنیشتاین *Wittgenstien*[1] بەزەینمانەدا ختورەدەکا دەربارەی "لایەنەکانی ویکچوونی خێزانی". پوختەی ئەو پرنسیپەش بریتیە لەوەی گەر بێتو تەماشای چەند چامەیەکی شیعریی بکەین، دەبینین هەندێکیان لەچەند ڕوویەکەوە لەیەکدی دەچن بەڵام هەندێکی تریان لەچەند ڕوویەکی ترەوە هاوشێوەن" تەواو هەروەك چۆن هەندێ لەئەندامانی خێزان لووتیان درێژەو هەندێکی تریان قژیان سوورەو هەندێکی تریشیان دەستیان گەورەیە: بەجۆرێك مەرج نیە ئەو سێ خەسڵەتە لەیەك تاکی خێزاندا کۆببێتەوە. چوارچێوەی گشتی "خێزان *Family+*" یان "شیعر *Poetry*"، بە تاکە ئەدگارێك یان کۆمەڵێك ئەدگار لای هەموو تاکەکان دەستنیشان ناکرێ، بەڵکو بەکۆمەڵێکی لێکدراو لە هەموو پێوەرە دابەشکراو و لێکئاڵۆزەکان لێرەولەوێ دەستنیشاندەکرێ. ئەبرامز بەپێچەوانەی فەیلەسوفەکانەوە لە پێشەکیەکەیدا (کە بێگومان ڕاستە) باس لە بێهودەیی تیور ناکا" بەڵکو دەڵێ هەموو تیورسازەکان چەند پرسیارێکیان خستۆتەڕوو دەربارەی ئەو دەقانەی خوێندوویانەتەوە، کە تیایدا گەیشتوونەتە چەند دەرەنجامێکی جیاوازو بەهادار، بۆ هێنانەکایەی ئامرازگەلێك کە زۆر بەباشی دەستدەدەن بۆ شیکردنەوە. بەڵام هەڵەی تیورەکە زۆر بەئاسانی لەوەدایە کە تووشی وەهمێك ببین گوایا "ئەدەب" تاکە گەوهەرێکە چاوەڕێی ئاشکراکردن دەکا.

کەواتە بڕوا بەچی بێنین؟ چ ڕاستیەو پێشەکییەکی لۆجیکی دەمێنێتەوە کە کاری تیوری لە لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکاندا بەرەو پێش بەرێ؟ وەڵامدانەوەی ئەم دوو پرسیارە بەگوێرەی دیدە جیاوازەکانی مرۆڤ ڕێژەییە، ئەو پێشنیارانەی لێرەدا دەیانخەمەڕوو بایەخەکانی من دەخەنەڕوو دەربارەی ڕەخنەی زمانەوانی *Lingistis Criticism*، دەق و شیکردنەوەی گوتار *Text & Discourse Analysis* و زمانناسی کۆمەڵایەتی *Sociolingistics*.

(2)

## چەند دەروازەیەکی لۆجیکیو بەرایی

أ/پێوەرەکانی "ئەدەب"و بەهاکانی لە گوتاری ڕەخنەیی مۆدێرندا:

سەدەی نۆزدە مانای ئیستاتیکی "ئەدەب" لە ڕەخنەی ئینگلیزیدا چەسپی، ئەو مانایە پەیوەندیەکی تۆکمەی لەگەڵ هەستی نیشتمانی "ئەدەبی ئینگلیزی"دا پەیداکرد. لە سەدەی بیستەم

بەدواوە چەندین تیوری ئیستاتیکیو رەخنەیی، کە لەژماردن نایەن، هاتنەئاراوە بەمەبەستی شیکردنەوەی مانای ئەو زاراوەیەو پەرەپێدانی، لەڕێگەی پراکتیزەکردنیەوە بەسەر لێکدانەوەی دەقەکان، کتێبەکان، چاخەکان و رێچکەکاندا. هەروەها ئەو تیورانە سەریانهەڵدا کە نکوڵییان لە چەمکی "ئەدەب" دەکرد، یان تەنها وەك فۆرمێکی رۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو سیاسی باسیان لە "ئەدەب" دەکرد، کە شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەو چوارچێوەیە نابەزێنێ. بەڵام سەرباری ئەوە چەمکی "ئەدەب" لای زۆربەی خوێندکارانی ئەدەب، بابەتێکە لە نەریتی گشتیدا رێککەوتن و بڕیاری لەسەر دراوە. لەبڕگەی پێنجی ئەم وتارەدا پەیڤی خۆم سانادەکەمەوە دەربارەی چەند گوتارێکی نەریتی لای دوو قوتابخانەی مەزنی قوتابخانەکانی رەخنە: رەخنەی نوێ *New Criticism*، شێوەخوازی/ بنیاتگەری *Formalism/ stracturalism*، هەروەها چەند بەهاو پێوەرێکی باو ڕووندەکەمەوە کە رەخنەگرە هاوچەرخەکان خستویانەتە سەر مانای "ئەدەب".

ب/کارو بابەتە رەخنەییەکان:

بایەخ و کاری رەخنەگران ، وەك خودی چەمکی "ئەدەب"، قابلی پێداچوونەوەو پەرەپێدانە. رەخنەگران خۆیان بە چەند بابەتێکەوە سەرقاڵدەکەن وەك ئەفسانە *myth*، ژانری ئەدەبی *genre*، مەجاز *metaphor*، گۆشەنیگا، زمان، گێڕانەوەی واقیع و هاوبەندی بەشەکان و... هتد، کە چەند بابەتێکن مەرج نییە پشتئەستور بن بەگریمانەکان سەبارەت بە قەوارەی "ئەدەب". بەڵکو هەموو ئەم بابەتانە جێگەی بایەخپێدانی لێکۆڵەرەوانی ئەو دەقانەن کە ناچنە چوارچێوەی ئەو قەوارەیەوە. هەروەها دەکرێ زۆر بەئاسانی لەو بابەتانە تێبگەین، گەر گرێوگۆڵەکانی دۆخی "ئەدەب"یان لەسەر لابەرین.

ج/ئەدەب کەشکۆڵی نەتەوەیی[2]:

کاتێ دەربارەی "ئەدەبی ئینگلیزی" یان "ئەدەبی ئیسپانی" قسەدەکەین، لە ناسینی ئەم دوو فرێزەدا هیچ کێشەیەکمان نایەتەڕێو هیچ ئاڵۆزییەکی زاراوەییشمان تووش نابێ. ئەدەبی ئینگلیزی (بۆ نمونە) کەشکۆڵێکە چەندین دەقی کەلەپوریو هاوچەرخ لەخۆدەگرێ لەچەند کارێکدا لەشێوەی: سرودی کایدمۆن[3]، پێرس-ی جوتیار[4]، شا لیر ئابسالۆم و ئکیتۆڤیڵ[5] تریسترام شاندی *Tristram Shandy*[6] لەیادگاریدا *In memoriam*[7] پەلکەزێڕینە *The Rainbow*[8] جێمی خاوەن شانس *Lucky Jim*[9] لەژێر دارشیردا *Wood der milk*[10] مندالانی نیوەشەو *Midnight children*[11]. تێبینی دەکرێ ئەدەبی ئینگلیزی یان ئیسپانی تەنها دیوانی نەتەوە نییە، بەڵکو چوارچێوەیەکی گشتگیریشە: واتە پێوەری ئەو دەقانەی بەرجەستەو نوێنەرایەتی چەند دەقێك دەکەن (بڕوانە: هەردوو خاڵی هـ ، و).

د/"دەق":

ئەدەب سەر بەهەر پۆل و ژانرێك بێ، بەپلەی یەکەم دەقە. "دەق" لە ڕەخنەی ئەدەبیدا پێناسەی زۆری هەیە، (هەرچەندە) تەنها بریتیە لەو "وشانەی کە لەسەر پەڕە هەن"، لەگەڵ توخمە مێژوییو سیاقیەکان و هەموو ئەو ڕەگەزانەی دەوری دەدەن. لە زانستی زمانناسیدا "دەق" پێناسەیەکی دەوڵەمەندو هونەریی دیاریکراوی هەیە،

هاریکــاری ڕەخنــەگر دەکــا شــوێن ئاســۆکانی چەمکگەلێکی ڕوون بکەوێو ئەو ڕێگایانە پێڕەوبکا کـە لـە پراکتیزەکردنـی ڕەخنـەدا سـوودیان هەیـە. یــەکێك لــە ئــەدگارە ســەرەکیەکانی "دەق" بــەو شێوەیەی من باسیدەکەم، بریتیە لە ڕەگ و ڕیشـەو ڕۆڵـی ئـەدەب وەك ئـەوەی لـە گوتـاری کۆمەڵگـەدا بەرجەستە بووە.

هـ/ ئینتمای کۆمەڵایەتی ئەدەب:

قەوارەیــەك وەك قــەوارەی ئــەدەبی ئینگلیــزی، مەبەســـت و ئینتمـــاو پەیوەنـــدی کۆمەڵایـــەتیو رۆشنبیریو ئابوریو دامودەزگایی خۆی هەیە، کە دەکرێ وەك پەیوەندیگەلێکی حەتمی کە بەندن بە هونەرسازی مرۆڤ و فێرکاری و ئامرازەکانی تروەوە قسەیان لێبکەین. بۆ نمونە گەر بمانـەوێ گوزارشت لــە پەیوەنــدیی ئــەدەب بــە پرۆســەی فێرکارییــەوە بکــەین، ئــەوا چــەندین کــەسمان بەرچـاودەکەون کـە لـە خوێنـدنگاو کۆلیجەکانـدا دادەمەزرێن بۆ خوێندنی ئەدەبی ئینگلیزی. پێوەر لە هەڵبژاردنی ئەو دەقانەی بڕیاریـان لەسـەر دەدرێ بــۆ خوێنــدن، دەکــرێ هەمیشــە پێداچــونەوەو لێــدوانیان لەســەربکرێ لەســەر ئاســتی گشــتی. خوێندنی ئـەدەبی نەتـەوەیی کـارێکی کۆمەڵایەتییە کــە دەشــێ فــەرمانێکی ئایــدیۆلۆجی دیــار یــان شــاراوەی هــەبێ" لێــرەدا نــاتوانین درێــژە بــە شیکردنەوەی ئەو فەرمانـە بـدەین تـا لێکۆڵینەوەکە لەچوارچێوەی خۆی دەرنەچێ، بەڵام ئاشکرایە کە دەشێ لەسـەر فـەرمانی کۆمەڵایـەتیو ئایـدیۆلۆجی "ئــــەدەب" بوەســــتین لەڕێگــــەی شــــیکردنەوەی سروشتی ئەو دەزگایانەی بەشداریيان کردووە لە (بنیاتنانیدا). بۆ نمونە بڕوانە: ( *Eagleton, 1976;* *widdoson, 1982; Williams, 1981*).

و/ئایـدیۆلۆجیا لـە ئەدەبـداو ئایدیۆلۆجیـەتی ئەدەب:

لێدوان سـەبارەت بـە چـەند دەقێك لـە سـیاقی پەیوەندیەکانیاندا بە دەزگاکانی کۆمەڵگاوە یان لـە سـنووری بەخشـین و وەرگرتنـدا، خـۆی لەخۆیـدا پەیوەنـدی بـە خەڵکانێکـەوە هەیـە لـە کۆمەڵگـەداو ئــەنجامێکی گرنگــی لێدەکەوێتــەوە، خــۆی لــەو (ڕاستیەدا) دەبینێتەوە کە چێژ وەرگرتن لە ئەدەب لەبـەر ڕۆشـنایی بیروبـاوەڕو بـەهاکانی کۆمەڵگـەدا دێتەئاراوە، واتـە بـەپێی ئینتما کۆمەڵایەتیەکەی بە ئایـــدیۆلۆجیا تێردەکـــرێ. هـــەروەکو بینیشـــمان پێڕەوکردنی دەلالـەتی دەقـەکان بەسـەر فۆرمـەکانی گوتـــاری ڕەخنـــەیی ڕەخنـــەگران و مامۆســـتایانی ئەدەب بەگوێرەی ئینتمای کۆمەڵایـەتییان گۆڕانیـان بەســـەردێ. هـــەمان دۆخ بەســـەر "ئەدەب"یشـــدا پێڕەودەبێ، بەوپێیەی شتێکی پەتییە کە تیورەکان هەوڵـدەدەن پـۆلێنی بکـەن. بـەڵام "ئـەدەب" وەك شـتێکی سـنوردارو جیـاواز پرسـێکە کۆمەڵگـەی مـۆدێرن پێویسـتی پێیـەتی، پێویسـتییەك کـە لـە فۆرمـەکانی گوتـار لای ڕەخنـەگرو تیورسـازەکانەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەوانـەی سـەرقاڵی دانـانی بـەهاو پێوەرگەلێکن لەپێناو وێناکردنی چەمکێکی گشتی بۆ ئەدەب.

ز/"ئەدەب" وەك وشەیەك:

هەرچـــــەندە "ئـــــەدەب"، وەك چـــــەمکێك، بەجۆرێکی ئەوتۆ تیورسازی بۆ نەکراوە کە هـەموو لایـەك ڕازیبکا، بـەڵام لـەوە بووینەتـەوە کە وشـەی *Literature* وشـەیەکی ئینگلیزییـەو ئـەوە دیـارە کـە لــەکوێوە وەرگــیراوە، (چــونکە) لــە زۆربــەی زمانــە ئەوروپییەکانـدا ئـەو وشـەیە دەگەڕێتـەوە سـەر یـەك

چاوگ، هەروەها مێژوی گەشە سیمانتیکیەکەی تا ئەوپەڕی ساغکراوەتەوە. لەو لاپەڕانەدا کە دێن شیکردنەوەکانم بە ئاماژەیەك دەستپێدەکەم دەبارەی بەکارهێنانە جیاوازەکانی ئەو زاراوەیە لە گوتاری ڕەخنەی مۆدێرندا.

(3)

## مێژوی وشەی "ئەدەب" لە زمانی ئینگلیزیدا

تۆمارکردنی بەڵگەئامێزی زاراوەی "هونەری شیعر ***Poitics***" یان "تیوری ئەدەب ***Theory of literature***" دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسوفی یۆنانی (ئەفلاتۆن 427-347پ.ز). دوو زاراوەی بنەڕەتی کە بۆ زیاتر لە دوو هەزار ساڵە مشتومڕیان لەدەورە بریتین لە: "شاعیر ***Poet***"و "شیعر ***Poetry***"، بێ گوێدانە جۆری ئەدەبی یان شێوەی عەروزی. لەو دوو سەدەیەی دواییشدا، لە زۆربەی زمانە ئەوروپیەکاندا وشەی "ئەدەب" جێی شیعری گرتەوە (*Wellek, 1970; Williams, 1976*)، لە دوو پێناسەی موعجەمییەدا کە لەخوارەوە دێن ئەوە ڕووندەبێتەوە کە سەرەتا بەکارهێنانی نوێی زاراوەکە چۆن بووەو پاشان چی بەسەرهاتووە.

**ئەدەب:**

1-بەرهەمی تۆمارکراوە لە ڕۆشنبیریەکی دیاریکراودا یان لە ڕۆشنبیری میللەتێك لە میللەتەکاندا: ئەدەبی ئوسکوندڤانی وەك نمونە.

2-بابەتێکی تۆمارکراوە وەك شیعر، ڕۆمان، وتارو ...هتد، بەتایبەتی ئەو کارە خەیاڵیانەی کە جۆرێك لە ستایل و گوزارشتی باڵای تێدایەو ئەو بابەتە گشتیانە لەخۆدەگرێ کە دەمێننەوە.

3-بابەتێکی تۆمارکراوە یان بەجۆرێك لەجۆرەکان چاپکراوە دەربارەی پرسێکی دیاریکراو: بابەتی زانستی" ئەدەبی ئامێری کەمانچە.

4-بابەتێکی چاپکراوە بەمەبەستی نمایشکردنی چەند زانیارییەك: بڵاوکراوەی فرۆشتنی شمەك.

5-هونەر یان پیشەی نوسین.

6-فێرکردن (مانایەکی کۆنە).

***(Collins Dictionary of the English Language, 1986)***

**ئەدەب:**

1-شارەزایی پەیداکردن لە "نوسین"و کتێبدا، فێربوونی ڕەفتاری جوان و بەرهەمی ئەقڵی مرۆیی و کولتوری ئەدەبی.

2-کار یان بەرهەمی ئەدەبی، چالاکی و پیشەی ئەدیب وجیهانی نوسین.

3-أ. بەرهەمی ئەدەبی بەگشتی: ئەو بەرهەمەی لە وڵاتێکی دیاریکراو یان لە چاخێکی تایبەتدا نوسراوە، یان لە جیهاندا بەشێوەیەکی گشتی. بەمانایەکی وردتر لە نوسیندا دەردەکەوێ بەلەبەرچاوگرتنی بنەمای جوانی داڕشتن و کاریگەری سۆزداری.

ب. کۆی ئەو کتێب و بەرهەمە نوسراوانەی کە دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو نوسراون.

ج. بڵاوکراوەی چاپکراو بۆ هەر مەبەستێك.

***(Oxford English Dictionary, Compact Edition, 1971)***

سەرهەڵدانی وشەی "ئەدەب" لە زمانی ئینگلیزیدا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چواردە، بەڵام مانای ئیستاتیکی زاراوەی "ئەدەب" لە بنەڕەتدا لە هەردوو سەدەی نۆزدەیەم و بیستەمدا بەکارهاتووە. "ئەدەب" لە کۆتایی چاخەکانی ناوەڕاست بەدواوە،

بۆتــە شمــەکێکی کولتــوری ئــەوتۆ کــە هــەر تاقــە کەسـێکی ئاگـادار بـە نوسـین و کتێـب و زمانــەکان قـۆرخی کـردووە بـۆ خـۆی" ئەڵبەتـە هەمیشـە وەك شـتێکی نایـابیش تەماشـا کـراوە (کـۆلینز **Collins**، مانا:،، ئۆکسفۆرد، 1). لە فەرهـەنگی ئۆکسـفۆرد-دا رســـتەیەك لــە ســـکیلتۆن-ەوە وەرگــیراوە **Skelton** (1529) کە دەڵێ: "ئاکاری جوان و ئەدەبی خۆت بناســـە"، رســـتەیەکی تــر لــە جۆنســـن **Johnson** وەرگیراوە (ژیـانی میلتـۆن **Life of Milton**، 1780) کە دەڵێ "ئەڵبەتە ئەو خاوەنی ئەدەبێکی مەزن بوو، ئـەو بـە چـەند زمانێـك دەیخوێنـدەوە، کـە ڕەنگـە لـە ڕێگـای خوێنــدن یــان ناســینی ڕەفتــاری جوانــەوە فێریـان بـووبێ". بەکارهێنانـە بەراییـەکانی زاراوەی ئەدەب بە گشتی ئامـاژەیان بـۆ خوێنـدن و شـارەزایی پەیـــداکردن لـــە کتێبـــدا دەکـــرد، دوور لـــەو تایبەتمەندییـە مۆدێرنـەی کـە لـە مانـای خـەیاڵی و ئەفرێنەرانــەی "ئــەدەب"دا هەیــە. جــاران کەســی خوێنــدەوار و خــاوەن ئــەدەب کەسـێکی تایبــەت و نائاسـایی بـوو: ئـەوە مەسـەلەیەکی پێویسـت بـوو چونکە تـەنها دەستەبژێرێکی کۆمەڵایـەتی لە خـەڵك کە توانای ئابوورییان باش بوو، توانـای خوێندنـەوە و دەســکەوتنی کتێبیــان هــەبوو. ئەڵبەتــە کتــێبی چاپکراو شمـەکێکی نـاوازەی جـوان و (کـەمالیات) بوو بۆ ئەو دەستەبژێرە. لە زۆر شوێنی ئۆکسفورد-دا ئـەوە ڕوونکراوەتـەوە کە زاراوەکـانی "ئـەدەب" و "ئەدەبی" بۆ ستایش بەکاردێن" هەرچەندە برێك لـە هەڵسەنگاندنی کۆمەڵایـەتییان تێدایـە کە لـەم وتـەزا سەیرەی برادشۆ-دا دەردەکەوێ: "عەوامی خـەڵك.. کـە خـاوەن ئـەدەب و ماریفـەی بـاش نین لـە دڕنـدەی کوشـندە دەچـن". (**Bradshow**، 1513). لـە سـەدەی هـەژدەدا واتـای هەڵسـەنگاندنەکە جـێگیر بـوو، بـۆ نمونـە گۆڵـد سمـت **Gold Smith** (1759) بـاس لـە "تایبەتمەندیی ئەدەب" و جۆنسن (1773) باس لـە "سومعەی ئەدەبی" دەکا.

لـە کۆتاییــەکانی سـەدەی هـەژدەدا مانایــەکی دیکـەی وشـەی "ئـەدەب" لـەدایکبوو، ئـیتر ئـەدەب تــەنها مانــای ئــەوەی نەدەگەیانــد کــە فێرخــواز شارەزایی لـە کتێبـدا هـەبێ، بەڵکو لـەوە بەرفراوانتر بــوو بــەجۆرێك پیشــەی نوســەر و بەرهــەمهێنانی کتێبیشــی گرتــەوە (کــولینز، 5، ئۆکسـفۆرد، 2). فەرهـەنگی ئۆکسـفۆرد قسـەیەکی ئیسـحاق دزرایـل **Isaac Disraeli** (1803) بـە نموونـە وەردەگـرێ کـە دەڵـێ: "ئــەدەب لـەناو ئێمـەداو بـە ئێمـە دەژی، بـێ ئـەوەی پێویسـتمان بـە هۆکارێـك یـان هاوبەندییـەك هەبێ". "ئەدەب"" بە مانای پیشـەی نوسین، تـەنها. بەرهـــەمهێنانی جـــۆرێکی دیـــاریکراوی کتـــێبی نەدەگرتـەوە، هـەروەك چـۆن ئـەدەبی بـاڵاو فـەنتازی نەدەگرتەوە. بەڵام بەو پێیـەی چالاکییەکی پیشـەیی ئـەوتۆ بـوو کـە پـارەی پەیـدا دەکـرد، هەنـدێ جـار ئامـاژەکردن بـوو بـۆ لێهـاتوویی تـاك، پاشـان چـەند واتایـەکی ستایشـکردنی لـەخۆگرت، لـە قسـەکەی جۆنســن-دا لــە دەروازەی بابەتەکەیــدا دەربــارەی ژیانی کۆلی **The life of Couley** ئـەم خاڵـە بـە ڕوونـی دەردەکـــەوێ (1779، یـــەکێك لـــە ژێـــدەرەکانی فەرهـــەنگی ئۆکســـفۆرد) جۆنســـن لـــەو شـــوێنەدا ئاماژەدەکـا بـۆ نوسـەرێك کـە بەخـەیاڵی فـراوان و ڕێکپۆش (انیق)ی زمانەکەی پێگەیـەکی لە جیهانی ئەدەبدا بە هەقی خۆی وەرگرتووە. لە ڕاستیدا ئەو نوســـەرە (ئـــەبراهام کـــولی) نـــەبوو، بـــەڵکو قەشـــە (تۆماس سپرات **Sprat**) بوو. کە نوسەری بایۆگرافیا بوو، پاشان جۆنسن باس لە ئەدەب دەکا بەمانای نوسین نـەك بـە مانـای قسـەکردن دەربـارەی ئـەدەب. تێبینی دەکرێ سیاقی زمانـەوانی لای جۆنسـن بـە چەند وشـەیەکی وەك: خـەیاڵی، ڕێکپۆشـی (الاناقە)

و جیهان دەدرەوشێتەوە کە شێوازەکانی ڕەخنەی ئەدەبی و شوێنگەی ئەدەبی بۆ خوێنەری مۆدێرن دادەڕێژێ. ئەڵبەتە ئەم جۆرەش لە ناو سیاقی زمانەوانی مژدەبەخشی واتای نوێی "ئەدەب"دا دەرکەوت، بەتایبەتی لە سەدەی دواتردا.

گەشەیەکی تر لە واتادا ڕێگەی خۆشکرد بەرەو تایبەتمەندیی لە چەمکی "ئەدەب"دا: ئیدی مانای بنەڕەتیی ئەدەب دەربارەی فێرخوازی و شارەزابوون لە کتێب و ڕەفتاری کەسی خاوەن ئەدەب وەك خۆی نەمایەوە، بەڵکو ئەدەب مانایەکی پیشەیی پەیداکرد و چەند زاراوەیەکی وەك: نوسەر، دانەر، نوسین لە بواری بەرهەمی ئەدەبی سەدەی هەژدە "سەریانهەڵدا، بەتایبەتی لەسەردەمی ڕۆمانسیەتدا کە بایەخێکی چڕ درا بە چالاکی شاعیر. گۆڕانێکی گەورە لە وشەی ئەدەبدا سەریهەڵدا کاتێ وشەکە مانای بەرهەمی نوسراوی دەبەخشی لە کولتورێکی دیاریکراوداو لە چاخێکی تایبەتدا، هەروەك لە پێناسەی فەرهەنگی ئۆکسفۆرددا هاتووە (3–أ). ڕینی وێلك ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە مانای ئەدەب لەسەر ئاستی نیشتمانی لە سەدەی هەژدەدا مانایەکی مەئلوف پەیداکردووە لە زمانەکانی ئیتالی و فەرەنسی و ئەڵمانی و ئینگلیزیدا، هەروەها بەکارهێنانە جیاوازەکانی زاراوەی ئەدەبی لەساڵی 1760 بەدواوە خەسڵەتێکی نیشتمانی و ئیستاتیکی لە یەك کاتدا بەخشی بە وشەکە (*Wellek, 1970, pp 5-8*)، بە گوێرەی سەرچاوەکانی ئەو دەمە زاراوەکە لە زمانی ئنگلیزیدا مانای ئەدەبی نەتەوەی وەرگرتووە، ویلك پەرەگرافێکی لە (جۆرج کۆڵمان) وەرگرتووە (1761) کە دەڵێ: "ڕەنگە تەنها شکسپیر و میلتۆن لە چینی یەکەمی نوسەراندا بن لەو پاشاگەردانییە گشتگیرەی کە ئەدەبی ئینگلیزیی کۆن بە خۆوەی بینیوە". قسەیەکیش لە جۆنسن (1774) وەردەگرێ کە دەڵێ: "ئەوەی بە ناهەق لە ئەدەبی کۆنماندا فەوتاوە دەکرێ زیندوو بکرێتەوە". ۆردز ۆرس–یش لە (پێشەکی چامە لیریکیەکان 1800)دا مانایەکی تازەی دەربارەی "چاخە جیاوازەکانی ئەدەب" یان ئەدەب و نمایشی شانۆیی بەکارهێناوە. کولێردج **Coleridge** لە وتارێکیدا بەناونیشانی (ئایا دیدی شکسپیر هاوتای بلیمەتیەکەیەتی؟ 1808) دەربارەی "ئەدەبی پوختەکراو" قسە دەکا. بەلاّم پیکۆك **Peacock** (1820) بە ڕاشکاوی ئاماژە دەکا بۆ "ئەدەبی یۆنانی و ڕۆمانی" و پاشان پێیوایە "شیعر تا ئێستا هیچ ڕەکەبەرێکی لە هیچ بەشێکی تری ئەدەبدا نییە"، هەروەها دەڵێ: "مێژووی هیردۆت نیوەی چامەیەکە: کاتێ نوسراوە کە لە گۆڕەپانی ئەدەب تەنها بۆ خواوەندەکانی هونەر و ئەفسانەکان کراوەبووە". (***In Adams, 1970, P 493***).

بەکارهێنانی ماوەی زەمەنی "چاخ" و ئاوەڵناوی "نیشتمانی" لە بواری ئەدەبدا زۆر گرنگە لە پرۆسەی گەشەکردندا بەرەو مانای ئیستاتیکی زاراوەی "ئەدەب"، چونکە هەردوو ئاوەڵناوی نیشتمانی و ئیستاتیکی بەشێوەیەکی سروشتی لە سەدەی نۆزدەوە پێکەوە ژیاون، واتە زاراوەی "ئەدەبی نیشتمانی" زاراوەیەکی بۆش نییە، بەڵکو لە ڕاستیدا ئاماژە دەکا بۆ چەند فیکرێکی بەهادار یان چەند فیکرێك (کە بە پلەی جیاواز) بوونیان پێویستە وەك: ڕۆحی نەتەوە یان چاخ. بەستنەوەی ئیستاتیکی بە نیشتمانییەوە لە سیاقی گەشەکردنی دەلالی وشەی "ئەدەب"دا، ئاستێکی تری مانامان پێدەبەخشێ کە بایەخ و بەهای زاراوەکە دەردەخا.

لـــــە چـــــاخی ڕۆمانســــــی ئینگلیزیـــــــدا زاراوە ئیسـتاتیکیە سـەرەکیەکان بـریتی بـوون لـە: شــیعر، چــامە، شـــاعیر (ۆردزۆرس، کـــۆلێردج، پیکـۆك، شـیلی). چـامەی لیکیرلـی *Lyric poem* بـــەرزترین ئاســـتی لـــە ئـــەدەبی ئینگلیزیـــدا هـــــەبوو، نموونـــــەی باڵادەســــــتی ئـــــەقڵی تیورسـازەکان بـوو. بـەڵام لـە هـەمان کاتـدا هەسـت بەوە دەکرا کە پەشێوی لە بەکارهێنانی زاراوەکان لە ئـــارادا بـــوو. وشـــەی "شـــیعر *poetry*" بـــۆ دوو مانـا بـەکاردەهات: ئـەدەبی خـەیاڵی و داهێنـان، لەگـــەڵ داڕشـــتنی عەروزیـــدا. بۆیـــە پێویســـت بـوو جیاکـاری بکـرێ لـە نێوانیانـدا و قسـە لـە "شـــیعر" بکـــرێ وەك لقێـــك لــــە لقـــەکانی نوســـــیینی داهێنەرانـــــە" ڕەنگـــــە لـــــە دوو قســــــەکەی پێشـــــوتری پیکـــــۆك ئـــــەم تێگەیشـــــــتنەمان هـــــەڵێنجابێ. بـــــەڵام ۆردزۆرس و کـــۆلێردج هـــەردووکیان ئاگایـــان لــە کێشــەکە بــوو: بڕوانــە ژیاننامــەی ئــەدەبی کـۆلێردج *Biographia Literaria*، نەسـکی 14، کـــــە تیایـــــدا ۆردزۆرس لـــــە پـــــەراوێزی پێشـــەکی چـــامە لیریکیەکانـــدا ســـکاڵا دەکـــا و دەڵـــێ: "مـــن لێـــرەدا، ســـەرەڕای بیروبـــاوەڕی خـــۆم، وشـــەی شـــیعر بـــەکاردێنم دژی وشـــەی پەخشـــان و هاوواتـــای داڕشـــتنی عـــەروزی (*In Adams, 1971. P.437*). هـەردوکیان خوازیـارن وشـــەی "شـــیعر" وەك زاراوەیـــەکی گشـــتی دژ بـە "زانسـت" بـە کاربێـت" بـەڵام هـەردوکیان لـەوەش ئاگـادارن کـە کێشـەیەك هەیـە لـە کتێبـە خەیاڵیەکان کەوتۆتەوە کە ئەو کاتە، بەدەر لە هەر یاسایەکی عەروزی، تازە بەتازە سەریهەڵدابوو، وەك "ڕۆمـان و چـیرۆکەکانی ئـەوینی ڕۆمانسـی" کـە کـۆلێردج پێگـــەی شـــیعری پێدەبەخشـــین و لـــە پێناسەکردنیاندا هەمواری دەکردن. بەڵام هیچ کام لـــەو دوانـــە وشـــەی "ئـــەدەب"ی بـــە مانـــای "ئەدەب"بەکارنەهێناوە.

ئـەم گەشـەکردنە زۆر دڕەنـگ وەخـت گەیشـتە ئینگلتەرا، بە بەراورد لەگەڵ فەرەنسا. ماتیۆ ئارنۆڵد *Matthew Arnold* یەکـەمین ڕەخنـەگری ئینگلیـزی بـوو، کـە خـاوەن پێگەیـەکی بـەرز و کاریگەرییـەکی زۆر بـوو، مانایـەکی تـەواو مـۆدێرنی بـە زاراوەی "ئـــەدەب" بەخشـــی، ئـــەویش مانـــای "ئـــەدەبی خەیاڵی" بوو. ئەم چەمکە لە یەکێك لە وتارەکانیدا ڕوون و ئاشکرایە بەناونیشانی "ئەرکی ڕەخنە لە کاتی ئێستادا" *The Function of Critieism at the Present Time* (1864)، هـەروەها ئامـاژە بـۆ چـەند بەرهەمێکی بەکۆمەڵ دەکا وەك "ئەدەبی فەرەنسی و ئـەڵمانی" و "ئـەدەبی ئینگلیـزی"، جگـە لـە چـەند فرێزێکـی ڕەهـا وەك "کـاری ئـەدەبی و هونـەریی مەزن"، کە ڕەنگدانەوەی وەرچەرخانێکی تەواوە لە مانـای ئیسـتاتیکی وشـەکە و سـەرەتایەکی نـوێ (*Adams, 1971, pp 582-95*). بەمجۆرە هـزری ئارنۆڵـد لــــەژێر کاریگـــــەری دیـــــدی ئـــــەفلاتۆن و ڕۆمانسـیەکاندایە، بـەڵام گوتـارە ڕەخنەییەکـەی هـــەڵقوڵاوی ڕەخنـــەی نوێیـــە کـــە چـــەند تایبەتمەندییەکی "ئیستاتیکی" بە زاراوەی ئەدەب بەشـێوەیەکی گشـتی دەبەخشـێ. ئـەو کـات پێویســـت بـــوو پێوەرێـــك بدۆزێتـــەوە، واتـــە ڕســـتێك لـــەو کارانـــەی کـــە لـــە هـــەناوی "ئــەدەب"ەوە سەرچــاوەیان گرتبــوو، هــەروەها دانـانی چـەند بەڵگەنەویسـتێك کـە زادەی دیـدی ڕێـك و جـوان و خەسـڵەتگەلێك بـن شایسـتەی هونـەربن، لـە پـاڵ داڕشـتنی چـەند زاراوەیـەکی هونـەری کـە سـەرلەبەری پرۆسـەکە شـیدەکەنەوە و گوزارشتی لێدەکەن.

(4)

### بەرەو ڕەخنەیەکی ئینگلیزی نوێ

کاتێ مێژووی گەشەکردنی واتای وشەی "ئەدەب" مان لە زمانی ئینگلیزیدا بە درێژی باسکردو ئاماژەمانکرد بۆ چەند ئەدیبێکی دیاری بواری ئەدەب و ڕەخنەی ئینگلیزی لە هەردوو سەدەی هەژدە و نۆزدەدا، مەبەستمان ئەوە بوو بە وردی و چڕی لەسەر چەند نەریتێکی دیاریکراوی ڕەخنە و تیورسازی قسە بکەین. هەرچەندە ئەو نەریتانە بەرتەسك و مەحكومن (بە چەند یاسایەکی پێشوەخت)، چونکە دۆخی تیورسازی لە نەریتی فەرەنسی و ئەڵمانی و روسیدا لە یەکدی جیاوازن. ڕەنگە هەر دەروازەیەکی بەراوردکاریش بۆ بابەتەکە هەستێکی ئەوتۆی دروستبکردایە کە "ئەدەب" لە هەموو جیهاندا بوونی هەیە، بەڵام تێگەیشتن و تێڕوانین بۆ ئەدەب جیاوازە بەگوێرەی جیاوازیی کولتورەکان. بە بۆچوونی من "ئەدەب" — وەك قەوارەیەکی سەربەخۆ — بوونی نییە، بەڵکو تەنها وەك وشە (لە بەکارهێنانی زمانە جیاوازەکاندا لە ئەوروپا بوونی هەیە)، هەر ئەو وشەیە بووە کلیلی تیورسازییەکی سنوردار لەو شتەدا کە پێی دەوترێ "ئەدەب" لە کولتوری ئێمەدا. گەر "ئەدەب" بەشێکی دیاریکراوی ڕۆشنبیری بێت، دەبێ مرۆڤ بە وردی و چڕی لە چوارچێوەی ڕۆشنبیریەکی دیاریکراودا لێکۆڵینەوە ئەنجام بدا. مەبەستم لە کولتوری خۆمان کولتوری ئینگلیزی زمانە لە بەریتانیا و ئەمریکا، کە ڕێکخستنی ئابوریی هاوبەش و پیشەسازیی پەخش و بڵاوکردنەوە و بەدواداچوون و سیستمی فێرکاری هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە.

لە نێوان فێرخوازان و ڕەخنەگرانی کولتوری ئینگلیزی زماندا پەیوەندیی هاوبەش هەیە وەك بەڵگەنەویست و حوکمی نەریتی کە دەربارەی بیرۆکەی "ئەدەب" لە ئارادان. بۆ نموونە دەوترێ: ئەم دەقە ئەدەبییانە خەیاڵین، یاخود هاوپەیوەندین، یاخود خاوەن بەهای باڵان". یان دەوترێ: دەبێ لەم دەقە بکۆڵینەوە، یان مەبەستی نووسەرەکەی نادیار و نەشیاوە.. هتد. پێموایە ئەم حوکمە بەڵگەنەویستانە لە بنەڕەتدا پێویستیان بە هەستێکی هاوبەش ***Common Sense*** هەیە دەربارەی ئەدەب لای زۆرینەی ئەو خەڵکەی کە لەم کۆمەڵگایە خوێندوویانە. ئەو خەڵکەی کە ڕەنگە لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم بووبێتنە کەسانێکی نەریتپارێز بەتایبەتی لەبەر ڕۆشنایی دەروازە ڕەخنەییە هاوچەرخەکاندا کە لە گەشتی ئەم ئەنسکلۆپیدیایە و لە شوێنی تریشدا باس دەکرێن. بەڵام بەگوێرەی لیستی دەزگاکانی بڵاوکردنەوە و بیبلۆگرافیای کتێبخانەی زانکۆکان و میتۆدەکانی لێکۆڵینەوە و ژێدەرەکانی کتێب و ڕۆژنامەکان و ڕەخنەی ئەکادیمی، تاوەکو ئێستا ئەم یاسایانە وەك بەڵگەنەویست بەکاردێن. تەنانەت خاوەنی دەروازەکانی تر (وەك دەروازەی زمانەوانی، ڕەخنەی فێمنستی، دەرونشیکاری و ڕەخنەی مارکسی..) تاوەکو ئێستا ئەو بابەتانە وەك بەڵگەنەویست لە کتێبە ڕەخنەییەکانیاندا باسدەکەن، تەنانەت هەندێ جار لە مشتومڕ و گفتوگۆکانیاندا قسەی لێدەکەن. بۆ نمونە بڕوانە: (*Mac Cabe, 1988. Widdowson, 1982*). لێرەدا هەوڵدەدەم لەسەر چەند بیرۆکەیەك بووەستم کە زادەی "هەستی هاوبەش"ن و تا ئێستا لە "ئەدەب"دا پێگەی گرنگیان هەیە.

بـەکارهێنانی ئـەو "هەسـتە هاوبـەش"ە لـە دەوروبـەری سـاڵی 1940 بـەدواوە جۆرێـك لـە گیرسـانەوەی بـەخۆوە بینیـوە. پێویسـتە ڕانـانی مێـژوویی گەشەسـەندن و سـیاقی ڕۆشـنبیریی ئـەو هەستە، چوار خاڵ بەلانی کەمەوە، شیبکاتەوە:

1-بـەکارهێنانی "زمـانی ئینگلیـزی" لـە پرۆسـەی خوێندنـدا، لەسـەر ئاسـتی زانکۆکـان و خولەکانی خوێندنی پیشەیی.

2-پشتبەسـتن بـەو دیـدەی دەڵـێ ئـەدەبی ئینگلیـزی ڕۆڵێکـی نیشـتمانی و گرنگـی لـە ژیـانی جەماوەردا هەیە کە لەسەر بنـەمای هـزری ئارنۆلـد دامەزراوە، ئەو دیدە لە گەرمەی جەنگی جیهانیدا و لە چوارچێوەی گومانکردن لە ئاین سەریهەڵدا.

3-ئـەو خواسـتەی پێـی وایـە دەبـێ ئـەدەبی ئینگلیزی سەنگی مەحەك "یان نەریتی مەزن" بێت، کـە ف.ر. لیڤـیF. R Leavis و هـەوادارەکانی بانگەشەیان بۆ دەکرد.

4-پەرەسەندن و زاڵبوونی کارە ڕەخنەییەکان لـە چـەند بزاوتێکـی ڕەخنەییـدا وەك: ڕەخنـەی پراکتیکی *Practisel Critisism*، ڕەخنـەی نوێ *New Critisism* بە پێشەنگی ئ.أ. ریچاردز *I. A. Richards* و ولیام ئیمپسۆن *Empson* لە ئینگلتـەرا، هـەروەها ڕ. پ. وارین *R. P. warren* و کلینت بروکس *Brooks* و ئالان تێت *Tate* و چەند ڕەخنـەگرێکی کۆنەپارێزی تر لە باشووری ئەمریکا. هەموو ئەم پەرەسەندنانە بـە درێـژی و بـە بەڵگـەوە لای چـەند نوسـەرێکی تـر خراونەتە ڕوو، بڕوانـە: (*Tillyard, 1958; Palmar, 1965; Eagleton, 1983; Baladick, 1983*).

(5)

## تایبەتمەندیەکانی "ڕەخنە" لە گوتاری ڕەخنەی مۆدێرندا

هـەر لـە سـەرەتاوە ئـەوەمان ڕوونکـردەوە کـە ناکرێ وێنای قەوارەیەکی دیاریکراو بکەین کە ناوی "ئـەدەب"ە، پاشـان پێناسـەیەکی شـیاو بـۆ ئـەو قەوارەیە بدۆزینەوە. لە ڕاستیدا فرەیی لە پێوەرە پێشـنیارکراوەکانی پۆلێنکردنـدا، کـە زۆر جـار نـاکۆکن و لـە هـەردوو سـەدەی ڕابـردوودا سەریانهەڵداوە، تاوەکو ئێستا لە ئارادان.. هەر ئەم فرەییـە ئـەوە دەسـەلمێنن کـە پێناسـەکردنی "ئـەدەب" جۆرێکە لە گەڕانی نەزۆك. تەنانەت زۆر نووسـەر گەیشـتونەتە ئـەو دەرەنجامـەی کـە سـەرلەبەری پرۆژەکـە نەزۆکـە" بـۆ نموونـە بڕوانـە: (*Eagleton, 1983. 1; Ellis, 1974, Chap.2; A.fowler, 1982, chap 1*).

"ئـەدەب" قەوارەیـەکی سـەربەخۆ نییـە کـە بـە لیستێك پێوەری جێگیر دیاری بکرێ. بەڵکو ڕاستتر پۆلێکی کولتوورییە کە تایبەتمەندیی خۆی هەیە. پاشـان باشـتر وایـە ئـەو پۆلـە بکەینـە "چـەند دەقێکـی ئـەدەبی" نـەك خـودی "ئـەدەب"، جـۆن. م. ئیلیس *Ellis* کارێکی لەو جۆرەی کرد کاتێ ووتی: "پۆلێـك لـە پۆلـەکانی دەقـی ئـەدەبی خـاوەنی خەسـڵەتی تایبـەتی خـۆی نییـە، بـەڵکو لـە ڕێگـای بـەکارهێنانێکی تایبـەتی ئـەو دەقانـەوە لەلایـەن کۆمـەڵگاوە ئەو تایبەتمەندییە پەیدادەکەن (*1974, p. 50*). هەروەها ووتی: "دەقەکان لە ڕێگای کۆمـەڵگاوە دەچـنە خانـەی ئـەدەب، نـەك لـە ڕێگـای نوسینیانەوە" (ص 47).

ئەلیسـتەر فاولـەر *Fowler* بـە بـەکارهێنانی زاراوەی وردتـر بـاس لـە خـاڵێکی هاوشـێوە دەکا و دەڵـێ: "هـەرگیز نـابێ بڕوانینـە ئـەدەب وەك توێـژاڵێکی جیـاواز، بـەڵکو پێویسـتە وەك دەرەنجـامی گشـتی تەماشـای بکـەین *aggregate*. "ئـەدەب" تـوخمی هاوبەشـی نێـوان چـەند

کارێکی ئەدەبی نییە، بەڵکو ڕاستتر قەوارەیەکی کولتوورییە کە ئەو کارە ئەدەبیانە بەشێکن لەو قەوارەیە". (*1982, p.3*).

مەبەست لە "دەرئەنجامی گشتی *Aggregate*" پۆلێنێکی دەڵەمەییە کە ستراکتۆرێکی دیاریکراو لە خۆناگرێ، هەروەها پۆلێنێکی کراوەیە کە چەندین دەروازە لە خۆدەگرێ لەو دەروازانەی کە ڕۆشنبیری دیارییاندەکا. چونکە لە چوارچێوەی کولتور و لەبەر ڕۆشنایی کولتووردا نوسەر و خوێنەران ئەو دەقە ئەدەبیانە بە چاکی دەناسن کە هەن یان دەشێ هەبن" هەروەها ئەو خەسڵەتە جیاوازانە دەناسن کە ڕەخنەگران بە شێوازی جیاواز باسیاندەکەن. دەکرێ ئەو جۆرە ناسینە ناوبنێین "توانای ئەدەبی *Literay competence*"، ئەو ناونانەی کە بونیاتگەرەکان بانگەشەی بۆ دەکەن ( *Culler, 1975. Chap. 6*)" "ئەو ناسینە ڕۆشنبیرییە ڕێژەییە تا ئاستێکی زۆر ئاڵۆزە و مرۆڤ لە ڕێگای فۆرمەکانی گوتارەوە دەستی دەکەوێ لە ژینگەیەکی "ئەدەبیدا" کە پشت ئەستوور بێ بە دەزگا (جیاوازەکان).

دەربارەی "ئەدەب"ێکی لەمجۆرە کە زادەی دەرەنجامی گشتی دەقەکانە، ڕەخنەگران گوتاری خۆیان لە ڕێگای شیکردنەوە و گوزارشت و هەڵسەنگاندنەوە دادەڕێژن. چونکە گوتاری ڕەخنەییش دەرەنجامی گشتی بایەخە بەرفراوان و جۆراوجۆرەکانە و یەکێکە لە زاراوە سەرەکیەکان. هەر بە گوێرەی ئەو زاراوانە، تیورسازەکان لە ڕابردوودا هەوڵیانداوە گەوهەرێك بۆ "ئەدەب" بسازێنن" ئەمە لە کاتێکدا کە هەڵێنجانی ئەو خەسڵەتانەی زادەی دەرەنجامی گشتی دەقەکانی "ئەدەب"ن و وەستان لەسەر هۆکانی هەمەجۆری ئەو دەقانە کارێکی لۆجیکی ترە.

ڕەخنەگران – بەگوێرەی بایەخە جیاوازەکانیان – گرنگی بە چەند خەسڵەتێکی جیاوازی ئەو دەقانە دەدەن کە لێیان– دەکۆڵنەوە، کاریگەریی ئەو بایەخانەش بەسەر چەند زاراوەیەکی هونەرییەوە ڕەنگدەداتەوە کە لە گوتاری ڕەخنەییدا هەن. ئەو ڕەخنەگرانەی گرنگی بە ژانرەکانی گێڕانەوە دەدەن زاراوەی ڕۆمان یان *Fiction* زیاتر دەردەخەن، بەلاّم ئەوانەی بایەخ بە شیعر دەدەن زۆرتر باس لە "گوزارشت *Expression*" و "داڕشتنی وتە *Verbal Patterning*" دەکەن" کەسانێکی تر وا دەبینن کە "ئەدەب" ئامرازێکە بۆ گەیاندنی "هەقیقەتە گەردوونییە" پەتیەکان. ئەم جیاوازیانە مایەی سەرسوڕمان نین گەر مێژوی ئاڵۆزی تیوری ئەدەبی و پێگەی کولتوریی "ئەدەب" لەبەرچاوبگرین، هەروەها ئەو هەموو ژانر و داڕشتنە جیاوازانەی گوتاری ڕەخنەیی کە لە هەناوی "ئەدەب"دا بوونیان هەیە. لەم نێوەندەدا چەند تایبەتمەندییەکی دژ بەیەك دەدرێنە پاڵ "ئەدەب": بۆ نموونە هەیە پێیوایە "ئەدەب" کار لە هەست و سۆزی وەرگر دەکا و داگیری دەکا یان پاکی دەکاتەوە" لە کاتێکدا ڕەخنەگری تر هەیە وای بۆ دەچێ کە هەڵوێستی وەرگر لە ئاست دەقدا بریتییە لە تێڕامانی ئارام کە دواجار بە کردەوە کاری لێناکا. ڕەنگە تیمی دووەم تیمی یەکەم بەوە تاوانبار بکا کە زیاتر گرنگی بە "ڕەوانبێژی *rhetoric*" دەدا نەك بە "ئەدەب *Literature*". ئەم کۆدژییە بەزەرەر دەکەوێتەوە گەر تیوری ئەدەبی – وەك سۆسێر *Saussure* دەڵێ – زانستێك بێت وەك زانستەکانی تر خاوەن توانا و سنوری دیاریکراوی خۆی بێ. بەلاّم لە ڕاستیدا تیوری ئەدەب زانست نییە، بەڵکو بوارێك بۆ چالاکییەکی کۆمەلاّیەتی کە ملکەچی گوتاری ڕەخنەیی و چەند پێوەرێکی

هاوبەشە بۆ دەقەکان (شانۆنامەکان، ڕۆمانەکان، سۆنێتەکان و..هتد)، بەڵام (نوسینی سەر دیوار *graffiti*، لیستی کڕین و ڕۆژنامەکان..هتد) ناچنە خانەی ئەدەبەوە. ڕەخنە گوتارێکە کە لەبەر ڕۆشنایی پەیوەندیەکانیەوە بە چەند سیاقێکی دامودەزگایی دیاریکراوە وە نایەتە ئاراوە وەك (خوێندنگە و زانکۆکان، کتێب و ژێدەرە ڕەخنەییەکان، دەزگاکانی بڵاوکردنەوە) بەدەر لە نەخۆشخانەکان، یان پەرلەمانی و گۆڤارە وەرزشیەکان). بەڵام ئەو جیاوازیانەی سەرەوە، تەنانەت ئەو ناکۆکییەی کە لە گوتاری ڕەخنەییدا هەیە، هەڵوێستی دژواری ئەوتۆ نین کە تەنها لە ڕووی تیورییەوە نەتوانرێ چارەسەر بکرێن، بەڵکوو توخمگەلێکی ئەوتۆن کە لە شارەزایی تاکەکەسیدا پەرش و بڵاودەبنەوە، هەروەها هەواداری ڕۆشنبیری و کولتوری، کە لە چالاکی کۆمەڵایەتیدا دەیانبینینەوە نەك چالاکی زانستی.

لە ژینگەیەکی لەمجۆرەدا کە فرەیی لە خۆدەگرێ، چەند خەسڵەتێك دەربارەی دەقەکان، بە درێژایی مێژوی هەوڵەکانی تیورسازی "شیعر" و "ئەدەب" وردەوردە ڕەگیانداکوتیوە" تاوەکو ئێستاش بە بەردەوامی لە ڕەخنەی مۆدێرن و تیورەی ئەدەبی مۆدێرندا دووبارە دەبنەوە و پێوەری ڕەخنەیی دەپۆشن.

لەبەر ئەم هۆیە، دەکرێ هەر یەکێك لەو خەسڵەتانە ڕەتبکرێتەوە لەسەر بنەمای ئەوەی کە پێویست نین یاخود تەواو نین.

بۆ نمونە خەسڵەتێکی وەك "ڕێکخستنی پتەو لە شێوەدا" کە لە چەند دەقێکدا بەدی دەکرێن وەك "سۆنێت *Sonnets*" کە لە ژانرەکانی تری وەك "ڕۆمان *Novels*"دا بەدی ناکرێ.. هەموویان دەچنە خانەی قەوارەی "ئەدەب"ەوە" هەمان ئەو خەسڵەتە لە چەند دەقێکدا دەبینرێتەوە کە ناچنە خانەی "ئەدەب"ەوە (وەك لیستی خواردن و خشتەی ئەنجامی یاریەکانی تۆپی پێ). بەڵام پێوەرە ڕەخنەییەکان پەیوەندییان بە "ئەدەب"ەوە نییە، هێندەی پەیوەندییان بە چەند دەقێکی ئەدەبی دیاریکراوەوە هەیە، کە چەند "خەسڵەت و سیفەتێکی پێویست و جێگیرمان پێدەبەخشن" و بایەخ و سوودی دەقەکان بەرجەستەدەکەن.

لە کتێبەکەی ویلك و وارین-دا (1963، نەسکی دووەم)، هەروەها لە کتێبەکەی ئەبرامز-دا (1965)، بە درێژی باس لە تایبەتمەندییە "ئەدەبی"یە جێگیرەکان کراوە. "ویلك و هاوڕێکەی بابەتەکە بە درێژی نمایشدەکەن، بەڵام سەختە بتوانین جیاکاری لە نێوان ڕاوبۆچوونی ئەو دوانە و کەسانی تردا بکەین. هەرچەندە چەند کارێکی تیوریی نوێتر هەن کە هێرش دەکەنە سەر دەروازەی "ڕەخنەی نوێ"، بەڵام تا ئێستا کتێبی ئەو دوانە کتێبێکی ئەکادیمی گرنگە لە لێکۆڵینەوەکانی ئەدەبدا و سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندە بۆ زاراوەکان و ڕێکخستنی چۆنیەتی بەکارهێنانیان (وەك جیاکاری لە نێوان ڕەخنەی ناوەکی *Intrinsic* و ڕەخنەی دەرەکی *extrinsic*). وتارەکەی (ئەبرامز) لە ئەنسکلۆپیدادا لە بارەی تیورەکانی شیعرەوەیە، بەڵام بۆ "ئەدەب"یش دەستدەدەن، چونکە تیوری گشتی ئەدەب تاوەکو ئێستا مەحکومی تیورەی شیعرەو لە (ئەفلاتۆن)ەوە تا ڕۆمانسیەکان بۆتە سەرچاوەی هەموو نوسەران. (ئەبرامز) توانی تیورەکان لە چوارچێوەیەکی دابەشکردنی ئاساندا ڕێکبخا" ئەو (لە لاپەڕە 640 بۆ 647) جیاوازی دەکا لە نێوان چوار جۆری "تیوری شیعر *Theory of poetry*":

1–تیورەکانی گێڕانەوە یان لاسایی *Mimic or imitative* کە بایەخدەدەن بە پەیوەندی نێوان دەق و ئەو جیهانەی بەرهەمی هێناوە.

2–تیـــورە ســـوودگەرەکان *Pragmatic*، کـــە تەماشـای دەق دەکـەن بـەو پێیـەی "ئامرازێکـە بـۆ جێبەجێکردنی چەند هەستێکی دیاریکراو بەسەر وەرگردا".

3–تیورەکـانی گوزارشـتکاری *expressive*، کـە تیایاندا "شاعیر لە چەقی ئەزموونەکەدایە و دەبێتە بزوێنـەری یەکـەمی بابـەتی چـامەکە و ئـەدگار و بەهاکانی".

4–تیـورە بابەتیـەکان *objective* کـە بایـەخ دەدا بـە "خـودی دەق" و بەکەمبایـەخی دەڕوانێتـە سـێ ڕەهەندەکەی تر.

ئەم پلەبەندییە بە شێوەیەکی مێژوویی دانراوە، هەر جۆرێك لـەو چوارەی سـەرەوە بـەدوای یەکتریـدا دێـن، لـە کەلـەپووری یۆنانییـەوە تـا سـەدەی هـەژدە (لەگێڕانـەوە *imitative*ەوە بـۆ سـوودگەریی)، لـە ڕۆمانسـیەت (گوزارشـتخوازی)یەوە بـۆ سـەدەی بیستەم (بابەتگەری). لە ڕاستیدا شوێن پەنجەی ئەو چوار تیورەیـە تـاوەکو ئێسـتا زاڵـە بەسـەر ڕەخنـەی مـۆدێرن و تیـوری ئـەدەبی نوێـدا: چـونکە ڕەخنـەی مـۆدێرن، تـا "ڕەخنـەی پراکتیکـی" تـەنها "بابـەتی" نییـە. بـە مەبەسـتی دەرخسـتنی ئـەم بەیەکداچوونە سـەیرە لـە ڕەخنـەی مۆدێرنـدا، دەکـرێ پرۆژەکـەی ئـەبرامز هـەموار بکـەین تـا جـۆرە ڕەخنەییـەکان پێکـەوە هاوکـات بخرێنەگـەڕ" ئـەو چـوار تـوخمی گوتـاری "شـیعری" لێکـدی جیادەکاتـەوە کـە بـە گوێرەی زاراوەکـانی خـۆی بـریتین لـە: (1) جیهـانی دەرەکـی *external world*" (2) جـەماوەر *Audience* (3) شـاعیر *Poet*" (4) چـامە – قەسـیدە *poem*. هـەروەها ئـەبرامز تیورەکـانی خـۆی بـەگوێرەی بایـەخی توخمـەکان ڕێکـدەخا (واتـە پلـەی گرنگـی توخمەکـە)، پرۆژەکـەی لـە شـیکردنەوە بەناوبانگەکـەی یاکۆبسـن دەچـێ "چـوار فۆرمەکـەی گوتـاری زمانـەوانی"، کـە تیایـدا شـەش فـەرمانی زمـان لـە یەکـدی جیادەکاتـەوە، لـە نێویانـدا "فـەرمانی شـیعری" (1960، ل 353).

جێـی خۆیـەتی زاراوەکـان بـەبێ لایەنیـەکی زیـاتر دابڕێـژین و ڕێکخسـتنی سـیاقەکە بگـۆڕین بەمجۆرە: (1) جیهان *world*" (2) نوسـەر *writer*" (3) خوێنـەر *reader*" (4) دەق *text*. لێـرەوە دەکـرێ تایبەتمەندییـە گریمانـەیی یـان پێشـنیارکراوەکانی "ئـەدەب" لەلایـەن ڕەخنەگرانـەوە، لەسـەر بنـەمای هاوجۆرییـان لەگـەڵ چـوار توخمەکـەدا، پێکـەوە کۆبکەینەوە.

**سەرنج:**

پێمـان باشـبوو پرۆژەکـەی ئـەبرامز بـەکاربێنین کـە پشتئەسـتوورە بـە پۆلێنکردنـە ئەدەبییـە نـەریتی و ئاسـانەکان، چـونکە ئـەم پۆلێنکردنـە گۆشـەنیگامان دەبەسـتێتەوە بەسەرچـاوەکانەوە. هـەر هـەوڵێکیش بـۆ ڕونکردنـەوەی چـەمکە پێشـنیارکراوەکان بەشـێوەیەکی تیوریی شـیاو پێویسـتی بـە چوارچێوەیەکی کـارکردنی زۆر ئـاڵۆزتر هەیـە، چوارچـێوەیەك کـە پەیوەنـدی بـە بـوارێکی تـرەوە هەیـە نـەك بـواری تیـورەی ئـەدەبی هەنووکـەیی، بـەجۆرێك ئـەو زمانـەی کـە غـەرقی وەهـم دروسـتکردن و درێـژدادڕی بـێ مانایـە نـاتوانێ بـاڵ بکێشـێ بەسـەر زمـانی واقعـی هەسـتپێکراودا. چـەند چوارچـێوەیەکی کـارکردن هـەن ئومێدبەخشـن و دەرفـەتی کـارکردن دەبەخشـن لـە بـواری زانسـتی زمانناسـی، زماننـاس کۆمەڵایـەتی، ڕێزمـانی دەق، وەك: یاکۆبسـن (1960)، هـایمز *Hymes* (1972)،

هاڵیـدای *Halliday* (1978)، دیبۆگرانـد و دیسـلەر *de Beaugrand & Dressler* (1981). بـەڵام چوارچـێوەی شیاوی کارکردن لای مـن بریتیـە لـەوەی هاڵیـدای لەگـەڵ هەموارکردنیدا.

دەشـــێ "دۆخـــی رەخنـــەیی" زیـــاتر ســـنووردار بکـرێ لــە ڕێگــای چــەند ئــەدگار و خەســڵەتێکەوە کــە زادەی زیــاتر لــە هــەرێمێکن لــەو چــوار هەرێمــەی کــە باســکران. بـەڵام بـا تەماشـای هـەر یـەکێك لـەو چـوارە بەجیابکەین.

## سەرچاوە

روجـر فـولر، الادب. موسـوعة الادب و النقـد. ت: عبدالرحمن شیحة. المجلس الاعلی للثقافة و الفنون. ص 23–44.

# رابلە و مێژووی پێکەنین

"نووسینی مێژووی پێکەنین، ئێجگار شیاو دەبێ"
ئێلکساندر هرتسن

**میخاییل باختین**

**لە فارسییەوە: عەزیز موورادی**

... هاوچـــەرخەکانی رابلـــە، پەیوەنـــدی وێنەکانی رابلەیان لەگەڵ شێوەگەلی شانۆیی گشتی و سروشتی جەژنی تایبەتی ئەم وێنەگەلە، بەجوانی هەست پێدەکرد کە پڕبوون لە شوێنی زۆر خۆشی کەرنـــەڤاڵی. بـــە قســـەیەکی تـــر، هاوچـــەرخەکان یەکپارچـەیی و لـۆژیکی هـەموو جیهـانی هونـەری و بۆچـوونی رابلــە و یــەکێتی رێبــاز و هاوئاهــەنگی هەموو توخمەکانی کە پڕبوون لە روانینێکی تاقانە بۆ جیهان و شێوازێکی مەزنی تاقانە، دەدۆزیـەوە و دەرکیــان دەکــرد.. بــەلأم تێگەیشــتنەکە تەســك و خۆبزۆزانە بوو.

ئەو شتەی بۆ چەرخی حەڤدە و چەرخەکانی دواتـر ببـوو بـە شـتێکی شـاراوە، بۆ ئـەوان شـتێکی دیـار و بەرچاو بوو. کەواتـە تێگـەی هاوچەرخەکان نـاتوانێ وەلأمـدەری مەسـەلەکانی ئێمـە بـێ، چـونکو بۆ ئەوان مەسەلەگەلێکی وەها نەبووە.

سەردەمی سیرڤانتس و شکسپێر، دەورانێکی بنـــەڕەتی لـــە مێـــژووی پێکـــەنین نیشـــان ئـــەدا، ســـــنوورەکانی بەرجەســـــتەکردنی چـــــەرخی حەڤدەهەم و چەرخەکانی پاش ڕێنیسانس لە هیچ شـوێنێکدا بـەڕادەی ڕامـان لـە بـارەی پێکـەنین، جەختی لەسەر نەکراوەو دیار و بەرچاو نین.

دەکرێ روانینی سـەردەمی رێنیسـانس لەسـەر پێکـەنین، بـە کـورتی و پێشـەکیانە بـەمجۆرە بـاس بکـــەین: پێکـــەنین بەهایـــەکی قـــووڵی چەشـــنە جیهانبینیەکی هەیە و یەکێ لە شێوە سەرەکیەکانی دەربڕینی حەقیقەتە لە بارەی کۆی جیهان، مێژوو و ئینسـان" روانگەیـەکی تایبـەت و گشـتگرە لـە بارەی جیهانەوە کە بەشێوەیەکی جیاواز دنیا ئەدۆزێتەوە، بەلأم گرنگیەکـەی ئەگـەر لـە هەڵسوکەوتی ماقوولأنـە زۆرتر نەبێ کەمتریش نییە" کەواتە ئەدەبیاتی مـەزن (کە باسی مەسەلە جیهانگرەکانیش دەکا) پێویستە

پێکـەنینیش بـەڕادەی ئـەدەبیاتی مـاقوولْ (جـدی) قـەبوولْ کـا: لـە راسـتیدا تـەنیا پێکـەنین دەتـوانیْ هەنـدیْ لەلایەنـە ئێجگـار گرنگـەکانی جیهـان بدۆزێتەوە.

دەکریْ تووشیاری (برخورد) چەرخی حەڤدە و چـەرخەکانی دواتـر لەسـەر پێکـەنین بەشـێوەی خوارەوە شیکەینەوە: پێکەنین ئیتر توانای ئەوەی نییە شێوەیەکی گشتگیر بیْ لە جیهانبینی، تەنیا دەتوانیْ هەندیْ لە دیاردە پاژیەکان و بەرێژەیی (جزئاً) نموونەدار لە ژیانی کۆمەڵایەتی و دیاردە نەرێتیەکان، بگرێتە خۆ" ئەو شتەی سەرەکی و گرنگە، ناکریْ بزەهێنەر (کومیك) بیْ.

مێژوو و مرۆڤگەلێك کە پەیکەراندنی ئەون (شاکان، سەرکردە نیزامیەکان، قارەمانەکان) مـومکین نییـە گاڵتەچـی بـن" بەسـتێنی کومیـك سنووردار و تایبەتە و (ئەگەڕێتەوە بۆ خراپیەکانی تاك و کۆمەڵگا) حەقیقەتی بنەمایی لەسەر جیهان و مرۆڤ بە زمانی پێکەنین ناوتریْ، تەنیا زمانی باش و پێویست، زمانی ماقوولە، کەواتە پێکەنین لە ریزی چەشنگەلی بیْ بایەختر دادەنێن کە ژیانی کەسە تاکەکان یا دەروونی کۆمەڵگای پیْ دەکێشن" پێکەنین یا گەشەیەکی کەمخایەنە یا ئامۆژگارییەکی چاکە کە کۆمەڵگا بۆ بوونەوەرە بندەست و چەپەڵەکان دەیباتە کار. دەتوانین تووشیاری چەرخی حەڤدە و هەژدە لەسەر پێکەنین بەمجۆرە واتاکەینەوە، هەڵبەت واتاکە تاڕادەیەك کورت و گەلاڵە ئاسایە. فۆنـاغی رێنیسـانس بۆچـوونی تایبەتی خۆی لە بارەی پێکەنین، هەوەڵجار لە رێی کردەوەی ئەدەبی و لە هەڵسەنگاندنەکانی ئەدەبیدا، دەرخستووە، بەلاْم لە دادگەریەکانی نەزەری خۆشی خەریکی ئەم کارە بووە. ئەو دادگەریانەی کە پێکەنینان وەك شێوەیەکی گشتگیری جیهانبینی پاساو دەدا. ئەم بیرۆکەیە تەنیا بەپێی سەرچاوەکەو نارایەکان هاتووەتە بەرهەم. رابلەش لە پێش وتاری هەوەڵ و دووەمی خۆی لەسەر چوار کتێب باسی ئەوەی کردوە و زۆرتر لەسەر بوقراتی حەکیم بەڵگەی هێناوەتەوە. بوقرات کە تیۆرەوانی (نظریة پرداز) چەشنی پێکەنین بووە. لە کاتی خۆیدا: رۆڵێکی گرینگی بینیوە. نەك تەنیا بابەتە شیبووەکانی نێو سیپارە پزیشکیەکانی بوقراتیان وەك سەرچاوە ئەهێناوە، بەڵکوو جەختیان دەکردە سەر رومانەکەشی، واتا نوسینەکانی (هەڵبەت دەستکردی) کە باسی "شێتی" دیموکراتیی دەکرد، شێتییەکە بە پێکەنینەوە دەکەوتەڕوو.. پێکەنینی دیموکریت لە رۆمانەکەی بوقرات باسی چەشنە جیهانبینێکی فەلسەفی دەکا" ناوەرۆکی ئەم پێکەنینە ژیان و هەموو ترس و تەگەرە و خولیا پووچەکانی مرۆڤە لە بارەی خوداکان و ژیانی پاش مەرگ. دیموکریت پێکەنین وەکوو روانگەی مرۆڤێکی تاك و تەنیا بە جیهان واتا ئەکاتەوە، وەك مانەوەی رۆحی ئینسانێك کە کامڵ بوونی خۆی بەدەست دێنیْ و ئەگەشێتەوە" بوقرات لە دوا راڤەدا لەگەڵ دیموکریت بە تەواوی هاوبیرە.

دووەمین سەرچاوەی فەلسەفەی پێکەنین لە سەردەمی رابلە وتە ناسراوەکەی ئەرەستوو بووە: "لە نێو بوونەوەرەکاندا، مرۆڤ تاقانە بوونەوەرێکە کە خاوەنی پێکەنینە". بۆ ئەم قسەیە کە ناوبانگێکی زۆری هەبووە، واتایەکی بەرینیان لەبەرچاو دەگرت: پێکەنین، بەرزترین بەهای مەعنەوی مرۆڤ بووە کە دەستی بوونەوەرەکانی دیکەی پێنەگەیشتووە، پارچە هەڵبەستێك کە لە سەرەتای کتێبی گارگانتوا هاتووە بەم دێڕە دەگاتە ئەنجام: (پێکەنین باشترە لە گریان چونکوو پێکەنین تایبەتی مرۆڤە).

سێیەمین سەرچاوەی فەلسەفەی پێکەنین لە سەردەمی ڕێنیسانس بەرهەمەکانی لووسین (یا لوکیانووس)ە و بە تایبەت کەسایەتی منیپەیە کە لەو دونیا دەست بە پێکەنین دەکات.

جارێکیتر دەیڵێینەوە کە تایبەتمەندی سەرەکی تیۆری پێکەنینی ڕێنیسانس (هەروەها سەرچاوە مێژینەییەکانی) قەبووڵی ئەم بابەتەیە کە پێکەنین واتایەکی ئەرێتانمی ژیانەوە و ئافراندنانەی هەیە و ئەم خاڵە بە ئاشکرایی جیای دەکاتەوە لە تیۆر و فەلسەفەکانی دوایی لەسەر پێکەنین (بە تایبەت تیۆری برگسون) کە جەخت ئەکاتە سەر کارکردگەلی خاپوورکەر و بچووککەرەوە. نەریتی کۆن کە پێشتر باسکرا. بۆ تیۆری پێکەنین لە سەردەمی ڕێنیسانسدا بەهایەکی بەرینی هەبوو" ئەم تیۆرە، نەریتی ئەدەبی بزەهێنەری بردە نێو ڕەوەندی ئەندێشەی ئومانیستییەوە و بەمجۆرە کەوتە پیاهەڵدانی. کردەوەی هونەری پێکەنین لە سەردەمی ڕێنیسانس زۆرتر لە هەموو شتێك شوێنکەوتەیی نەریتەکانی فەرهەنگی بزەهێنەر و گشتی چەرخە ناوەندێکانە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، لە دەورانی ڕێنیسانس تەنیا بەردەوامی ئەم نەریتانە نابینین، بەڵکوو بە پێچەوانە دەبینین کە ئەوانە دەگەنە قۆناغێکی تەواو نوێ و بەرزتر لە ژیانی خۆیان. هەموو فەرهەنگی خەڵکی پێکەنینی زۆر دەوڵەمەند لە چەرخە ناوەندێکان، لە دەرەوەی بازنەی فەرمی ئیدیولۆژی و ئەدەبیاتی بەرز هاتوەتە بەرهەم و بڵاوبووەتەوە. و لە ژێر ئەم ژینە نا فەرمییەیە کە فەرهەنگی پێکەنین لەگەڵ ڕادیکالیسم و ئازادی ئاوارتەیی (استثنایی) و ڕەوشەن بینی بێسنووری خۆی جیابوەتەوە. چەرخە ناوەندێکان ئەگەرچی بەرگریان کرد لە برەوی پێکەنین لە نێو هەموو بوارە فەرمییەکانی ژیان و ئەندێشەکان، بەڵام لە بەرامبەریدا ئازادی ئاوارتەیی پەتی دەرچوون و پارازشیان بۆ دابین کردبوو لە دەرەوەی ئەم بوارانە: پێکەنین لە شوێنە گشتیەکان، لە جەژن و ئەدەبیاتە سەرقاڵکەرەکان ئازادبوو قازانجێکی قووڵ و بەرینی لەم ئازادیە برد.

لە ڕاستیدا لە سەردەمی ڕێنیسانس بوو کە پێکەنین لە ڕادیکاڵترین و عامترین شێوە کە بە وتەیەك هەموو جیهانی دەگرتەخۆ و هەروەها لە شادترین شێوەی خۆی، لە ماوەی پەنجا – شەست ساڵ (و لە زەمەنێکی جیاواز لە هەر وڵاتێکدا) لە دەروونی خەڵك بە زمانگەلی "گشتی" هاتە دەر و چووە نێو ئەدەبیات و ئیدیولۆژی بەرزەوە و ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا لە ئافراندنی شاکارەکانی جیهانی وەك دکامروونی بووکاتچۆ. بەرهەمەکانی ڕابلە، ڕۆمانی سێرڤانتس درام و کومیدیەکانی شکسپیرو...

لەم سەردەمە سنوورەکانی نێوان ئەدەبیاتی فەرمی و نا فەرمی بە ناچاری دەبێ تێکەڵی یەك بن، تا شوێنێ کە ئەم سنوورە بەرجەستەکەرانەی بەشە تایبەت و گرنگەکانی ئیدیولۆژی، سنووری جیاکەرەوەی زمانەکانیان دەبری: زمانی لاتین و زمانە گشتیەکان. لەگەڵ قەبووڵبوونی زمانە گشتیەکان لە نێو ئەدەبیات و هەندێ لایەنی ئیدیولۆژی فەرمی، دەبوایە ئەم سنوورانە بۆ ماوەیەك هەڵگیرێن یا لانی کەم کاڵببنەوە. کۆمەڵێکی تر لە هۆکارەکان کە زادەی پووکانەوەی سیستەمی فیوداڵی و ئایینی چەرخە ناوەندێکان بوون، بوونە یاریدەری پشێویی و تێکەڵی نێوان ئەدەبیاتی فەرمی و نا فەرمی. فەرهەنگی بزەهێنەری گشتی کە لە ماوەیەکی زۆردا شکڵی گرتووە و ژیانی خۆی لە شێوەگەلی نافەرمی

ئافراندنی گشتی – ئافراندنە شانۆیی و گوتاریەکان – بەردەوام بوو لەسەر ژیانی ڕۆژانەی نافەرمی، خۆی هەتا لوتکەکانی ئەدەبیات و ئیدیولوژی بەرزکردەوەو ئەوانەی گەشاندەوەو پاشان لەگەڵ سەقامگیری دەسەلات و هاتنەرووی سیستمێکی تری فەرمی نوێ، بۆ ریزەکانی خوارەوەی زنجیرە پێگەکانی چەشنگەلی ئەدەبی نێررایەوە، لەوێدا سەقامگیر بوو. تارادەیەکی زۆر لە دەرروونی خەڵکی دوورکەوتەوە، تووشی تەگەرەی جۆراوجۆر هات و لە ئەنجامدا پووکایەوە.

بەمجۆرە هەزار ساڵ پێکەنینی گشتی ئەدەبیاتی ڕێنیسانسی پڕ کردو بووە هۆی گەشانەوەی و لەو ڕێوە خۆیشی گەشایەوە. لەگەڵ پێشکەوتووترین فکرەکانی ڕۆژگار و زانستی ئومانیستی و هونەری بەرزی ئەدەبیات، پەیوەندی گرت..

پێکەنینی چەرخەکانی ناوەڕاست، لەم تێکەڵاوییە تازەیە، دەبێ لەم قۆناغە کە قۆناغێکی پێشکەوتووی تازەیە. ئاڵوگۆڕی بەرچاو بهێنێتە بەرهەم" رامانی گشتی، جیهانگەرایی، رادیکالیسم، قۆشمەیی، ڕەوشەن بینی و ماتریالیسم، دەبێ لە قۆناغی ئەزموونی هەتا رادەیەك خۆبزۆز بڕواتە نێو حاڵەتی زانستی هونەری و حەز بە مەبەستێکی دیاریکراو. بەوتەیەکی تر، پێکەنینی چەرخەکانی ناوەندی" لەسەردەمی ڕێنیسانس ببووە خاوەنی ئەزموونێکی زانستی نوێ، ئازاد، رەخنەگرانەو مێژوویی رۆژگارەکەی، و تەنیا بەو بۆنەوە وای لێهات کە پاش هەزار ساڵ گۆڕان، لەڕەوتی چەرخە ناوەندیکان، توخم و چرۆکانی ئەم سروشتە مێژووییە و هێزەکەی، بەتەواوی حازر و ئامادەببوون هەنووکە باسی چۆنیەتی دروست بوون و بلاوبوونەوەی شێوازەکانی فەرهەنگی بزەهێنەر شی دەکەینەوە لە چەرخەکانی ناوەندی.

بەو جۆرە کە پێشتر باسکرا، پێکەنین لە چەرخە ناوەندێکان نرابوە ئەوپەڕی هەموو بوارەکانی فەرمی ئیدیولوژی و شێوە فەرمی و ماقووڵەکانی ژیان و پەیوەندییە ئینسانیەکانی. پێکەنین هیچ شوێنێکی لە نەریتە ئاینییەکاندا نەبوو، نەریتە باوەکانی فیوداڵی و دەوڵەتی، دابونەریتی کۆمەلایەتی و هەموو چەشنەکانی ئیدیولوژی فەرمی و پیرۆز، لەو رۆژگارەدا تەنیا وتەی ماقووڵانە، بوونی فەرهەنگی باو بوو. ناوەڕۆکی ئەم ئیدئولۆژییە (چلەکێشی، بڕوا بە چارەنووسی ترسناك، کاریگەری زاڵبووی وتەزاگەلی وەك تاوان، سزا، رزگاری) و سروشتی سیستمی فیوداڵی و شێوەکانی سەرکوتکردن و ترساندنی توندڕەوانە، کە ئەم ئایدۆلۆژییە بە پیرۆزی یادی لێ دەکردەوە، دابینکەری ئەم پەیڤە سنووردارەبوون لەگەڵ ماقووڵیەتی وشك و بەستەڵەکیدا. پەیڤی ماقووڵانە وەکو تاقانە شێوەی گونجاو بوو بۆ دەربڕینی حەقیقەت، چاکە و بە گشتی هەموو سروشتە گرنگ و بەهادارە جێگرتوەکان..

بەڵام ئەنجامی پێویستی ئەم ماقوڵیەتە کامڵەی ئیدیولوژی کە کلیسای فەرمی لایەنگری بوو، کوژاندنەوەی شاری، پێکەنین و خۆشی و گاڵتە بوو لە ئاقاری کلێسا و ئازادبوونیان لە دەرەوەی ئەم ئاقارە، واتا لە دەرەوەی ئایین و داب و نەریتەکان، پێکەنین ئازاد و پیرۆز بوو. لە ئەنجامدا لە پاڵ شێوە فەرمی و پیرۆزەکاندا، شێوەگەلی تەواو کومیك لە دایکبوون.

سروشتی گشتگیری پێکەنین، لە هەموو ئەو دیاردانەی کە پێشتر باسی لەسەرکرا، بە

ڕووناکیەکی تەواو ئاشکرایە، پێکەنینی سەدەکانی ناوەندی هەموو بابەتەکانی فەرهەنگی ماقووڵ، ئامانج ئەگرێ. ئەگەرچی لە هیچکام لە شتە بەرزەکاندا ئاماژە ناکا بە ئاوارتەیەك بەڵام بە پێچەوانە لە هەنگاوی هەوەڵ هێرش ئەکاتە سەر هەموو ئەوانە و لەگەڵ ئەوەشدا، بابەت یا بەشێکی تایبەت ناگاتە ئامانج، بەڵکو ڕووبەڕووی کۆمەڵگا بە گشتی و ژیانی دونیا و جیهان ئەبێتەوە. لە بەرامبەر دونیای فەرمی، دونیای تایبەتی خۆی دەئافرێنێ" لە بەرامبەر کلێسا و دەوڵەتی فەرمی، کلێسا و دەوڵەتی خۆی بینا دەکا.

دەبێ لە پاڵ گشتگیری پێکەنینی سەدەکانی ناوەندی، (کە هەوەڵین تایبەتمەندی جیاوازی ئەوە) ئاماژە بکەین بە دووهەمین تایبەتمەندی جیاوازی، واتا پەیوەندی نەپچڕاو و سەرەکی لەگەڵ ئازادی.. ئەم ئازادی پێکەنینە، وەکو و هەر ئازادییەکی تر، گومانی تێدا نیە، ڕێژەیی بوو، بەستێنەکەی هەنگاو بە هەنگاو کراوە دەبوو یا دەبەستراییەوە، بەرین دەبوو یا دەیانخستە نێو سنوورەوە، بەڵام هەرگیز بە تەواوی بەرگری لێنەکرا.. ئەم ئازادییە لەگەڵ شاییەکان، پەیوەندییەکی نەپچڕاوەی هەبوو، تاڕادەیەك دەکەوتە نێو بازنەی ڕۆژەکانی جەژن و تێکەڵ بوو لەگەڵ دۆخی خۆشی و شایی، لەگەڵ ئازادبوونی خواردنی گۆشت و بەزی بەراز و دەستپێکردنی دووبارەی خزمایەتی. ئەم ئازادی پێکەنینە و جەستەی مرۆڤ، دژایەتیەکی ئاشکرای هەبوو لەگەڵ پارێزەکانی ڕۆژگاری رابردوو یا ڕۆژەکانی داهاتوو.

جەژن وەکوو ڕاوەستانی کەم خایەنی هەموو سیستمی فیئودالی بوو لەگەڵ هەموو بەرگری و بەربەندو کۆسپەکانی. بۆ ماوەیەکی کورت، ژیان لە ڕەوتی ئاسایی، یاسایی و فەرمی دەترازاو دەچووە نێو ئاقاری ئازادی خەیاڵەوە. سەقامگیرنەبوونی ئەم ئازادییە، تەنیا خولیا و رادیکالیسمی خەیاڵی ڕوخسارگەلی بەدیهاتوو لەم دۆخە تایبەتە پڕ ڕەنگ ئەکاتەوە. فەزای ئازادی جێنەکەوتوو، زاڵبوونێتی بەسەر شوێنە گشتیەکان و نەریتی چێشت خواردنی جەژنەکانی نێو ماڵ. نەریتی باستانی وتە ئازادەکانی سەر چێشت خواردن، کە زۆربەیان دوور بوون لە ئەدەب و هەروەها ئەو باسە فەلسەفیانەی کە لەسەردەمی ڕێنیسانسدا پەرەیانسەند، پەیوەندیان گرت بە نەریتی ناوچەیی جەژنگەلێك کە سەرچاوەیەکی فولکلۆری یەك ڕەنگیان هەبوو، پێکەنینی چەرخەکانی ناوەندی جگە لە گشتگیری و ئازادی، تایبەتمەندیەکی بەرچاوی دیکەی هەبوو: پەیوەندی سەرەکی لەگەڵ حەقیقەتی خەڵکی نافەرمی.

لە فەرهەنگی کۆندا، تووشیاری ماقووڵانەی فەرمی زاڵە و لەگەڵ توڕەیی بەرگری و تەگەرە هاوڕێ دەبێ، لەم هەڵسوکەوتە ماقووڵە هەمیشە توخمێك لە ترس و سزا هەیە. ئەم توخمە لە چەرخەکانی ناوەندی بە ئاشکرایی زاڵ بووە. بە پێچەوانە بۆ ڕەچاوکردنی پێکەنین پێویستە ترس نەبێ. پێکەنین هیچ چوارچێوە و سنورێك ناسەپێنێ. دەسەڵات، تووڕەیی، مانەوە هەرگیز زمانی پێکەنین بەکارنابەن.

مرۆڤی چەرخە ناوەندیێکان بە شێوەیەکی خەست، سەرکەوتنیان بەسەر ترسدا لە پێکەنیندا هەست پێکردووە، نەك تەنیا زاڵ بوون بەسەر ترسی عیرفانی (یەزدان ترسی) و ترس لە هێزەکانی سروشت، بەڵکو و زۆرتر سەرکەوتن بەسەر ترسی مەعنەوی و ئاکاری کە زانستی مرۆڤی کۆیلە کردوەو خستویەتیە بەر هەڕەشە. ترس لە هەموو شتە پیرۆز و بەرگری لێکراوەکان (تابۆ و مانا) ترس

لــە دەســـەڵاتی خــودایی و ئینســـانی، فــەرمان و هەڕەشــە میریــەکان، مــەرگ و ســزای پــاش مــەرگ، دۆزەخ و هــەموو ئــەو شــتانەی ترسـناکتر بـووە لـە دونیـا. پێکـەنین بـە زاڵبـوون بەسـەر ئـەم ترسـەدا، زەینی مرۆڤی روناك کردەوە و جیهانێکی تـازەی بـۆ ئاشکرا کـردوە. لـە راسـتیدا ئـەم سـەرکەوتنە کـەم خایەنە تەنیا لە ماوەی جەژنەکان بەردەوام بووە و پاشــان خێــرا لەگــەڵ رۆژەکــانی ئاســایی تــرس و سـەرکوتکردن دەگەڕایـەوە" بـەلاَم بـەهۆی رووناکییـە کــە وەك لـــەم رێگـــەوە بەســـەر ئاگـــایی مرۆڤـــدا ئەدرەوشایەوە، جۆرە حەقیقەتێکی جیا و نافەرمی لە بارەی جیهان و مرۆڤەوە خەریکی شکڵگرتن بووە کـە بەسـتێنی بەخۆداچـوونەوەی نـوێی سـەردەمی رێنیسانس بووە.

هەستی توندڕەوانەی زاڵ بوون بەسەر ترسدا، لە توخمە سـەرەکییەکانی پێکەنینـە لـە چەرخەکانی ناوەڕاست و لە تایبەتمەندیە جۆراوجۆرەکانی وێنـە بزەهێنەرەکانـدا خـۆی دەنـوێنێ.. گاڵتـە بـە هـەموو شتە ترسناکەکان دەکرێ..

پێکــەنینی چــەرخەکانی ناوەنــدی، هەســتی زەیــنی، تاکــەیی و ژیــنی بــەردەوامی ژیــان نییــە، بـەڵکوو هەسـتێکی کۆمەلاَیـەتی و گشـتگیرە. مـرۆڤ بەردەوامی ژیان لە شوێنە گشتیەکان، لەگەڵ بوون لــە نێـو بەشـدارانی کەرنـەڤاڵ هەسـت پـێ دەکـا و لەوێـدا جەسـتەی هەسـت بـە جەسـتەی کەسـانێکیتر دەکا کە خاوەنی تەمەن و پێگەی جیاوازن. خۆی بە ئەندامێکی ئەو خەڵکە ئـەزانێ کـە خـەریکی گەشـە و نوێبوونەوەی بەردەوامن. بەم بۆنەوە پێکـەنینی نێـو جەژنــەکانی خــەڵکی نــەك تــەنیا زاڵ بوونــە بەســەر ترسی سەرچاوە گرتوو لـە دڵەراوکێکانی ئاخیرەت، بابەتـە پـیرۆز و مەرگـەکان بـەڵکو دەسـەلاَتی هـەموو حاکمــەکانی ســەر زەوی، دەرەبەگایــەتی و هــەموو شتە سەرکوتکەر و سنووردارەکانیش دەگرێتە خۆ.

پێکــەنینی ســەدەکانی ناوەنــدی کــەزاڵبووە بەسـەر تـرس لـە راز و رەمـز، دونیا و دەسـەلاَت، بـە نەترســـیەوە حەقیقەتـــەکانی دونیـــا و دەســـەلاَتی خســـتوەتە ڕوو و دژایـــەتی کـــردوە لەگـــەڵ درۆ، خوڵتەکــەری، ریاکــاری. پێکــەنینی راســتەقینە، سووکایەتی کردوە بە هەموو دەسەلاَتەکان و هاوڕێ بــووە لەگــەڵ جنێــو و بــێ حــەیایی و گاڵتەچــی بێژەرەکەی بووە.

پێکــەنین شــێوەی دەرەکــی حەقیقــەت نییــە، بەڵکو شێوەی دەروونی بنەمایەکە کە ناکرێ پـەیڤی جیدی بخرێتـەجێی. ئـەگینا نـاوەڕۆکی حەقیقەتێك کــە لـــە رونـــاکی پێکەنینـــەوە ئاشـــکرا بـــووە، تێکدەشــکێ و دەگــۆڕێ. پێکــەنین نــەك تــەنیا لــە سانسۆری دەرەکی بەڵکو زۆرتر لە هـەموو شتێك لـە سانسـۆری مـەزنی دەروونـی رزگـار دەکـا" مـرۆڤ لـە ترسی شتە پیرۆزەکان، بـەرگری زۆردارانـە، رابـردوو دەسـەلاَت کـە لـە مـاوەی هـەزاران سـاڵەوە لـە زەینـدا جێــی خۆیــان کردوەتــەوە، رزگــار دەکــا، پێکــەنین بنــەمای مــادی و جەســتەیی زینــدوو ئەکاتــەوە و ئاشـکرای دەکـا. چـاو لەسـەر هـەموو شـتێکی تـازەو داهــاتوو ئەکاتــەوە کەواتــە نــەك تــەنیا دەربــڕینی حەقیقــەتی خــەڵکی دژی فیــودالّی تــەیارکردووە، بـەڵکو یارمـەتی دۆزینـەوە و ناسـینی توخمەکەشـی داوە. ئـەم راسـتیە لـە مـاوەی هـەزاران سـاڵ لـە دڵـی پێکەنین و شێوەکانی بزەهێنەری جەژنە گشتیەکان، دروست بوەو ماوەتـەوە.. ڕەنگـە پێکـەنین کـەمتر لـە هـــەر شـــتێك ببێتـــە کەرەســـەی ســـەرکوتکردن و گــەوجێتی خــەڵك. هــەرگیز کــەس نــەیتوانیوە بــە تـەواوی فـەرمی کاتـەوە. پێکـەنین هەمیشـە چـەکی ئــازادی بــووە لــە دەســتی خــەڵك. بـە پێچــەوانەی

پێکـەنین، پـەیڤی ماقووڵانـەی فیـودالی پڕیـەتی لـە هۆکارگـەلی وەك تـرس، کـزی، بەندایـەتی، دیلـێتی، درۆ، ریاکـاری، یـا بـە پێچـەوانەوە پـڕ بـووە لـە توڕەیی، ترساندن، هەرەشە و بەرگری جۆراوجۆر. زۆر جـار پـەیڤی ماقووڵانـە لـە زاری خـاوەن دەسەڵاتەکان فەرمانی داوە بە ترساندن بەندایەتی و بـەرگری" بـە پێچـەوانە بـۆ خـەڵکی رەمـەکی وەکـو ترسان، بەندایەتی، پیاهەڵدان و خوڵتەکەری (تملق) بـوەو بـەم بۆنـەوە رق و کینـەی خـەڵکی بزوانـدوە، پـەیڤی ماقوڵانـە، پـەیڤی فـەرمی بـوەو خـەڵك وەکوو هەموو شتە فەرمیەکان سەیریان دەکرد، ئەم پەیڤە، سەرکوتکەر، ترسێنەر و بەندایـەتی بووە و دەستی داوەتە هەرەشە و فرێو و تـەماح و قێزەون بـووە. لە شوێنە گشـتیەکان، لـە کـاتی جـەژن و شـاییەکان لـە بەرامبـەر مێزێکـی رازاوە، خـەڵکی قسـەی ماقووڵانـەیان وەك دەمامکێـك دەنـا لاوەو پاشـان حەقیقـەتێکی نوێیـان ئـەبێت کـە لـە شـێوەیەکی بزەهێنـەر، بە گاڵتـەو گـەپ، قسـەی قۆڕ و ناشیرین، دژە وازییـەکان، لاسـایی کردنـەوەکان و.. دەرئـەبرا. هـەموو تـرس و درۆکـانی لـە بەرامبـەر سـەرکەوتنی مادی و جەستەیی دەکوژاندەوە.

لـە کۆتـایی چـەرخەکانی ناوەنـدا رەوەنـدی کزکردنـی دوولایەنـەی سـنوورەکانی فەرهـەنگی کومیـك و ئـەدەبیاتی مـەزن دەسـت پێئـەکا. شـێوە نزمـەکانی ئـەدەبی زۆرتـر لـە جـاران لـە بـوارە بـەرزەکانی ئـەدەبیات ئەتوێتـەوە و پێکـەنینی خـەڵکی دەچـێتە نێـو حەماسـەوە و لەشـین گێڕیەکانـدا رەهەنـدی بـەرینتر ئەدۆزێتـەوە. شـانۆگەری ئامۆژگاریانـە، کایـەی شـێتانە و شـانۆگەرییە تارۆزاوێکـان پەرەئەسـێنن.. فەرهـەنگی کومیـك سـنووری تەسـکی جەژنـەکان ئەخاتـە دواوە و بۆ تواندنـەوە لـە هـەموو بوارەکـانی ژیـانی بیروباوەڕیـدا ئەکەوێتـە هەوڵ و تەقەلا.

کۆتـایی ئـەم رەوتـە سـەردەمی رێنیسانسـە. لەبەرهەمـەکانی رابلەیـە کـە پێکەنینـەکانی چـەرخە ناوەنـدێکان بـەرزترین شـێوەی دەربـڕینی خۆیـان دەدۆزنـەوەو رامـانی مێـژوویی نـوێ، ئـازاد و رەخنەگرانـە لـە شێوەی ئەودا خۆی دەنوێنێ. ئەم قۆناغـە بـەرزەی پێکـەنین لـە هـەموو مـاوەی چـەرخە ناوەندێکاندا پەروەردە بووە.

چەرخی شانزەهەم سەرچاوەی بەرزبوونـەوەی مێـژووی پێکەنینـە کـە بەرهەمـەکانی رابلـە باشـترین نموونەیـەتی، کـە لەگـەڵ پلئیـاددا رووبـەرووی کـەوتنێکی تونـد ئەبینـەوە. پێشـتر لـە بـارەی پێکەنینـەوە روانگـەی چـەرخی حەڤـدەمان شیکردەوە: ئەم دیدگایە پەیوەندی سەرەکی لەگەڵ جیهانبینی لە دەستداوە و رووئەکاتە خراپە وتـن — هەڵبـەت خراپەوێـژی دوگمانە — لـە بوارە تایبـەت و ئاساییەکاندا رادەوەستێ و رەنگی مێـژوویی خۆی لە دەست ئەدا، لەراستیدا پەیوەندی لەگـەڵ بنـەمای مـادی و جەسـتەیی هێشـتا هەیـە، بـەڵام ئـەم بنەمایەش دەخرێتـە نێو بـوارە نزمـەکانی کاروبـاری رۆژانە.

ئەم رەوتی پووکانەوەیە چۆن دروست بووە؟

چـەرخی حەڤـدە نیشـاندەری سـەقامگیری سیسـتمی نوێیـە، سیسـتمی دەسـەڵاتی رەهایـە کـە "شـێوەی جیهـانگیر و مێـژوویی" تـا رادەیـەك پێشکەوتوانە دێنێتە بەرهەم. دەربڕینی بیرۆکـەکانی لەسـەر فەلسـەفەی عـەقڵ بـاوەڕی دیکـارت و جوانیناسـی کلاسـیزم بینـابووە. ئـەم دوو قوتابخانەیە، تایبەتمەنـدێکانی سـەرەکی فەرهـەنگی فـەرمی نـوێ بـە شێوەگەلی بەرچاو نیشـان ئـەدەن، فەرهـەنگێك کـە لەگـەڵ فەرهـەنگی کلێسـا و

فیئودالیسم جیاوازی هەیە بەڵام وەکوو ئەوان پڕیەتی لە پەیڤی ماقووڵ و میریانە (آمرانە) بەڵام کەمتر کۆنەپەرستانەیە. چەمکی زاڵبووی نویٚ گەشە ئەکەن کە بە وتەی مارکس چینی دەسەڵاتداری نویٚ، بە ناچار ئەوانە وەکوو حەقیقەتگەلی هەمیشەیی نیشان ئەدا.

لەم فەرهەنگە فەرمییە نوێیە، خواستی سەقامگیری، ئاکاری وەستا و، ماقووڵیەتی یەك لایەنەو یەك ئاستی وێنەکان زاڵە. دوو چەشنی (دو گونگی) گروتسك قەبووڵ ناکریٚ. چەشنە جوانەکانی کلاسیسم لە هەموو جۆرە کاریگەری کۆمیکی گروتسك رزگار ئەبن.

هەنووکە باسی چەرخی هەژدە دەکەین. رابلە هەرگیز بە رادەی ئەم دەورە رووبەڕووی تێنەگەیشتن و ڕێزلێنەنان نەبوەتەوە. لە راستیدا لە تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی رابلەیە کە لاوازیەکانی چەرخی رۆشەنگەریان بۆ دەرئەکەویٚ نەك دەسەڵات و هێزەکەی. نوسەرانی چەرخی رۆشەنگەری لە لایەکەوە بە نەبوونی دەرکی مێژوویی، خەیاڵکردنی دەرهەستیانەو عەقڵانی، تێگەیشتنی میکانیستانە لە مادە حەز بە گشتی کردن و نموونە سازی دەرهەستیانە، و لە لایەکی تریشەوە بە بەڵگەپەرەستی و بەڵگەسازی، کەمتر لە هەموو کەسێك توانیویانە تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی دروستیان لە رابلە هەبیٚ. بە بۆچوونی ئەوان رابلە نموونەی تەواو کاملی "چەرخی شانزەهەمی وەحشی و بەربەری"بوو..

بە گشتی فەیلەسوفەکانی رۆشەنگەری نەیانتوانیوە، لانی کەم لە بواری زانستی تیۆری خۆیان، رابلە دەرك کەن یا هەڵیسەنگێنن. هۆی ئەم تێنەگەیشتنە بە سانایی دەرئەکەویٚ. بە وتەی ئێنگلس، لە چەرخی رۆشەنگەری "ئاوەزی ئەندێشەگەر بووە تاقانە پێوەری هەموو شتەکان". ئەم عەقڵباوەڕی دەرهەستیانە، ئەم نەفی مێژووە، ئەم خواستە بۆ دەرهەستی گشتی، ئەم نەبوونی دیالێکتیکە (جیایی نەفی و قەبوڵکردن) نەیهێشت فەیلەسووفەکانی رۆشنگەری دەرکی دروستیان هەبیٚ لە دوو چەشنە پێکەنینی جەژنەکانی خەڵکی و بەخشینی واتایەکی تیۆریانە بەو بابەتە. دیمەنی ژیانێکی رۆژانە کە لە نێوان دژایەتیەکان شکڵی دەگرت و هەرگیز بە تەواوی کامڵ نەبوو، بە پێوەری عەقڵ هەڵیان نەدەسەنگاند.

لە بواری بەرهەمە هەستیەکان، لە هەموو چەرخەکاندا، لە داستانی شیعری و ئەویندارانە و شانۆ، شێوەگەلی جۆراوجۆری پەیڤی ماقووڵانەی قووڵ و خاوێن، بەڵام کراوە و هەمیشە ئامادەی لەناوچوون و نوێبوونەوە هەبوە. پەیڤی ماقووڵانەی بەڕاستی کراوە، ترسێکی نییە لە دژایەتی یا شێوەگەلی تری پێکەنین. چونکو دەزانیٚ بەشداری لە دونیایەکی ناتەواو دەکا کە گشتێك (کل) دروست ئەکا.

لە هەندیٚ لە بەرهەمە ئەدەبیەکانی جیهانی، دوولایەنی جیهان – ماقووڵانە و گاڵتەجاڕی – پێکەوە دەژین و یەکتری پەرچ ئەدەنەوە.. ئانست بەرهەمی یوریپیدس کە تێیدا تراژیدیی دەکەوێتە پاڵ درامی داشۆرین، نموونەیەکی ناسراوە لەم چەشنە لە ئەدەبیاتی کۆندا. هەڵبەتە بەرزترین بەرهەمەکان لەم بارەیەوە تراژیدیەکانی شکسپیرن.

پێکەنینی راستەقینە، دوا لێزمە و گشتگیرە، پەیڤی ماقووڵانە نانێتە لاوە، بەڵکو خاوێن و کامڵی دەکا. لە دوگماتیسمی، یەك لایەنی، وشکی، دەمارگیری، رەش بینی، توخمەکانی هەرەشە یا ترساندن، ئامۆژگاری کردن، بیرۆکەی ساویلکانە و

خەیاڵی، سەقامگیری بابەتی ترسناك لە بوارێکدا و دەمارگێری گەوجانە پاك و خاوێن ئەکاتەوە. پێکەنین ماقوولێتی (جدیەت) لە دوگمایی و جیایی لە گشتیەتی (کلیت) بێکۆتایی ژیانی رۆژانە دوور ئەخاتەوە. ئەم گشتیەتە دوو لایەنە دیسان سەقامگیر ئەکاتەوە لە بابەتە وتراوەکانی پێش کارکردە گشتیەکانی پێکەنین و لە گۆڕانی مێژوویی فەرهەنگ و ئەدەبیات.

لە پێشەکی ئەم کتێبەدا بە گشتی باسی دیدگای رومانتیکەکانی فەرانسایی (و بە تایبەت ڤیکتۆر هوگۆمان) لە سەرگروتسکە کرد. لێرەدا باسی روانگەی ئەوان لەسەر رابلە ئەکەین کە رابلە لە پاڵ شکسپێر بە بەرزترین نوێنەرەکانی سیستمی گروتسك دەزانن.

سەرەتا باسی بیرۆکەکانی شاتووبریان دەکەین کە یەکێ لە چەمکە تایبەتەکانی رومانتیسم شی ئەکاتەوە. چەمکی "هەڵکەوتوەکانی دایك" کە دەڵێ هەموو نوسەران کەسانێکی تایبەتیان هێناوەتە دونیا و پەروەردەیان کردوون و ژمارەیان لە ئەدەبیاتی جیهاندا. زۆرتر لە پێنج یا شەش کەس نیین. رابلە یەکێ لەوانەیە کە دەکەوێتە پاڵ هوومیر، شکسپیر و دانتە. رابلە هەموو ئەدەبیاتی فەرانسای خوڵقاندووە بەو جۆرە کە هومیر ئەدەبیاتی یوونان و رومی خوڵقاندووە و شکسپیر ئەدەبیاتی ئینگلیز و دانتە ئەدەبیاتی ئیتالی خوڵقاندوە. کەسێك ناتوانێ لەمە زیاتر رابلە بەرزکاتەوە. بۆچوونی شاتووبریان چ جیاوازیەکی مەزنی هەیە لەگەڵ دادگەریەکانی سەدەکانی رابردوو بۆ نموونە بۆچوونی ڤولتێر، کە رابلە بەسەر دەستەی گاڵتەچیەکان و بێ حەیا بۆ هەموو نەتەوە دەزانێ. چەمکی "هەڵکەوتووەکانی دایك" کە دەکرێ بڵێین هەموو رومانتیکەکان بەکاریان بردووە، لە کاتی خۆیدا کاریگەر بوەو خاوەن ڕاکانی بزواندوە کە توخمەکانی داهاتوو لە رابردوودا بدۆزنەوە و رابردوو لە چاوی داهاتوویەکەوە هەڵسەنگێنن کە ئاوس و زادەی رابردوە، چەمکێکی رومانتیکی تر لەم چەشنە چەمکی هەڵکەوتەیی "زەینی چرای ڕێناسی مرۆڤ"ە کە ڕێی مرۆڤ روناك ئەکاتەوە. ئەم چەمکە وامان لێ ئەکا تا لە بەرهەمەکانی رابردوو (بەرهەمەکانی شکسپیر، دانتە، رابلە) نەك تەنیا بە شوێن ئەو شتانەوە بین کە تیایاندایە و حازر و ئامادە و بە تەواوی ناسراو و سنووردارە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نوسەرەکە خۆی، بەڵکو زۆرتر دەبێ بە دوای توخم و چرۆکانی داهاتووەوە بین، واتا شتێك کە تەنیا لە چەرخەکانی دوایی و تەنیا لە بەرهەمی زارۆکەکانی ئەم هەڵکەوتوە دایکانە بە تەواوی ئاشکراو رووناك بوەتەوە. لە ژێر کاریگەری ئەم چەمکە، بەرهەمەکانی رابردوو پرشنگ و پێداویستی تازە ئەگرنەخۆ" رومانتیکەکانیش بە یارمەتی ئەم چەمکە گەیشتنە دۆزینەوەگەلی پڕ بەرهەم. لە بەرهەمەکانی شکسپیر، سرڤانتس و رابلە.

لەم چەمکە و بەرهەمەکانی، جیاوازی رومانتیکەکان و فەیلەسوفەکانی رۆشنگەری بە رووناکی دەرئەکەوێ، فەیلەسووفەکانی رۆشنگەری بە شوێن ئەوەوە بوون کە لە بەرهەمەکان و نوسەرانی رابردوو، شتێك کەمتر لەوەی کە بەراستی ئەوان هەیانبوو، بدۆزنەوە: عەقڵی دەرەکی مێژووی رۆشنگەرەکان لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە لەم بەرهەمانەدا شتگەلی بێ واتا، بێ کەڵك و دەرك نەکردنی زۆر هەیە، کەواتە دەبێ ئەوانە خاوێن و کورت بکرێنەوە.. فەیلەسووفەکانی رۆشنگەری لە راستیدا خوازیاری خاوێن کردنی جیهان بوون و جەختیان دەکرد کە لە

دونیادا، شتە ڕاستەقینەکان زۆر کەمترن لەوەی کە لـە ڕەواڵەتــدا دەکەونـە بەرچــاو" ڕاســتیەکان (واقعیت) بۆ بەهادارکردنی پاشماوەکانی ڕابردوو، پێشداوەریەکان، خەیاڵ و خولیا و خەونەکان و.. بە سانایی بڵاوبوەتەوە. ئەم تێکە تەسك و نابزۆزە لە واقیعیــەت، ســێبەری خســتوەتە ســەر هەڵسەنگاندنەکانیان لەسەر بەرهەمە ئەدەبیەکان و ڕووبەڕووی خـاوێن کـردن و کورتکردنـەوەی بابەتەکانی کردونەتەوە.

ڕۆمانتیکەکان بە پێچەوانەی فەیلەسووفەکانی قۆناغی ڕۆشەنگەری تێگەیەکی (برداشت) بەرینیان لـە ڕاسـتی خسـتووەتە ڕوو کـە تێیـدا زەمـەن و پێشکەوتنی مێـژوویی بەهایـەکی بەرچاوی هەیە. ئەوان لەسەر ئەم تێگە بەرینە لە جیهان بە شوێنی ئـەوەدابوون کـە بـەپێی توانایـان لەبەرهەمـە ئەدەبیەکان بابەت هەڵگۆڕن. زۆرتر لەو بابەتانەی کە لە چاوپێکەوتنی هـەوەڵ دەکەوێتە بەرچاو. ئەوان لەنێو بەرهەمەکاندا بە شوێن خواستەکان، داهاتوو، توخمـەکان، چـرۆکان، دۆزینـەوەو دیـتنی و ئایندەخوازیدا گەڕاون.

بـەڵام ئـەم تێگـە بەرینـە لـە واقیعیـەت خـاوەنی لایـەنی ئـەرێتی و نەرێتیـە لـە پـاڵ یەکـدا. لایەنـە ئەرێتیـەکان سروشـتی مێـژوویی ئـەم بۆچـوونە و شـێوەی ڕوانـینی بـۆ ڕۆژگـار و گـۆڕانی مێـژوویی. واقیعیــەت و نــابزۆزیی و سروشــتخوازی و پەرشوبڵاوی خۆی (کە تەنیا بە یارمەتی ئەندێشەی دەرهەستانە و عەقڵ باوەڕ پارێزراوە) لەدەست ئەدا" داهاتووی ڕاستەقینە لـە چوارچێوەی خواستەکان، پێداویسـتیەکان و پێشدەسـتیەکان دەچـێتە نێـو واقیعیەتــەوە. تێگــەی مێــژوویی لــە واقیعیــەت هاوڕێیــە لەگــەڵ دیـدگا بناغەییـەکان لـە بـارەی ئازادییەوە و جەبر باوەڕی و ڕوانینی میکانیکانەی تەسـك و دەرهەسـتانە، ئەخاتـە لاوە. لـە بـواری ئافرانـدنی هونـەریش، هـەموو جـۆرە دوورکەوتنـەوەکان لـە واقیعیـەتی سـەرەتایی، لـە نـابزۆزی ئـەم چرکەسـاتە، بەڵگـە دۆزینـەوە و نموونەسـازی تەسـك پاسـاو دەدرێـن و گروتسـك و خولیاکـانی گروتسـکیش وەك شـێوەگەلی سـەلمێندراوو هـەڵگری زەمـەن و داهـاتوو، قـەبووڵ دەکـرێن. شـیاوی حاشـا هەڵنـەگری ڕومـانتیکی واقیعیەت لەم خاڵەدایە.

لایـەنی نـەرێتی (منفـی) ڕوانـینی ڕومانتیـك، ئیدەئالیسـمی ئـەم ڕوانینـە و تێنەگەیشـتن لـە کاریگـەری و سـنوورەکانی ئاگـایی زەینـە کـە وای کـردوە کـە زۆربـەی ڕومانتیکـەکان شتگەلێك بخەنـە سـەر واقیعیـەت کـە واقیعیـەت بـۆ خـۆی ئەوانـەی نـەبووە. کەواتـە خەیاڵپـەروەری هـەتا ڕادەی دەروێشایەتی نزم بوەتەوە و ئازادی مرۆڤایەتی جیا بوەتەوە لە پێداویستی و بوەتە هێزێکی بەرزە مادی (فوق مادی). تایبەتمەندیگەلێك کە ڤیکتۆر هۆگۆ بە نیشـانەی هەڵکەوتـەیی (بـە واتـا ڕومانتیکەکـەی) دەزانـێ، لـە ڕاستیدا، دەبـێ بدرێتـە پـاڵ ئاسـەوار و ئـەو نوسـەرانەی کـە کاردانەوەیـەکی بناغـەیی قـووڵ ئەخەنــەڕوو لــە چــەرخەکانی بــازدانی مێــژووی جیهــانی. ئــەم نوســەرانە ڕووبــەڕوون لەگــەڵ دونیایــەکی ناتــەواو و نــوقمی گــۆڕان و ئــاوس بەرابردوویــەك کــە خــەریکی پووکانەوەیــە و داهاتوویــەك کــە خــەریکی شــکڵ گرتنــە. بەرهەمـەکانیان بـە ناتـەواوی ئیجـابی و قسـەیەکی تەواوتر، بە ناتەواوی عەینی بەرجەستە دەبێتـەوە و داهاتوویـەکی گرتوەتـەخۆ کـە هێشـتا نوانـدنێکی قــووڵ و عــەینی نەدۆزیوەتــەوە. ئــەم بابەتــە ئەوانــە دەخاتــە جموجــووڵ بــۆ دۆزینــەوەی ڕێگەگــەلێك بــۆ بــەیانی عــەینی و بــەرین لــەم

داهـــاتووە. دەرئـــەنجامی ئـــەم ڕەوتـــە، واتـــا تایبەتـــە جۆراوجۆرەکـــانی ئـــەم دەقانەیـــە، شـــــاراوەیی ڕەواڵەتیانـــــە، مێـــــژووی زۆر دەوڵەمەنـــد و جۆراوجـــۆری ئـــەم ئاســـەوارانە و نوسـەرەکانی لـە قۆناغـەکانی دوایـی و لـە کۆتایـدا، ئاڵۆزی تێگەیشتنیانە، واتا ناکۆکیان لەگەڵ ڕێباز و یاســاکانی هـــەموو چـــەرخە بەسەرچـــووەکانی حکومەتە خۆپەرست و کۆنەخوازەکان. لەم دەورانی پەرینـەوە، فەرهـەنگی خـەڵکی بـە تێگـەی خـۆی لـە بوونیـــەتی (موجودیـــت) ناتـــەواوی زەمـــەنی شادیهێنەر، کاریگەریـەکی بـەرینی لەسـەر ئـەدەبیات دەبـێ، ئـەم بابەتـە بـە ڕونـاکی لـە هـەموو چـەرخی ڕێنیسانس ئاشکرا بووە.

بڵاوبوونەوەی کتێبی مێژوونوسی فەرانسایی لووسـین فـوور (مەسـەلەی بـێ بـاوەڕی لـە چـەرخی شانزەهەم. ئاییـنی ڕابلـە پـاریس 1942) ڕوداوێکـی مەزن بـوو لـە مێژووی توێژینـەوەکان لەسـەر ڕابلـە.. ئامانجی سەرەکی فوور دەرکی ڕابلە لە دۆخە فکری و فەرهەنگیەکانی سەردەمی خۆی و لە چوارچێوەی ئـەو پێداویسـتیانەی کـە لـە ڕۆژگارەکەیـدا هـەبووە. فـوور جـەختی کـردووە کـە ئەگـەر مرۆڤـی چـەرخی شــانزەهەم لــە "فــەزای ئاکــاری" و "بــاروودۆخی فکـری" ئـەو ڕۆژگـارە کـە تێیـدا ژیـاوە، جیاکەینـەوە نـاتوانین ئـەو چـەرخە بناسـین. ئـەرکی سـەرەکی مێــژوونووس ئەوەیـــە کـــە ڕوونیکاتـــەوە بۆمـــان مرۆڤــەکانی ســاڵی 1532 (ســاڵی بڵاوبوونــەوەی هەوەڵین کتێبی ڕابلە) چۆن توانیویانە پانتاگرۆئیل هەست پێبکەن و دەرکی کـەن و چۆن ئەوانـە، قامك دەخەنـە سـەر ئەوانـە نـەك خۆمـان، نەیانتوانیوە ئـەم کتێبـە تێبگـەن. دووبـارە خوێنـدنی دەقـی ڕابلـە بـە چـاوی هاوچـەرخەکانی دەکـرێ، واتـا مرۆڤـەکانی چـەرخی شـانزە نـەك چـەرخی بیسـت، گـەورەترین هەڵەی مێژوونووس، خۆ هیلاککردنە بە تێکەڵاوی یا هەڵەی مێژوویی.

لووسین فوور لـە دیـدگای ئـەم پێداویسـتیانەی ڕەوشناسی، کە بە گشتی تەواو دروستن، ئەکەوێتە ڕەخنەگرتن لە ئابل لووفرانك، ئابل لووفرانك بڕوای وایـە کـە ڕابلـە، بانگەشـە دەکـا بـۆ قـازانجی خـودا نابـاوەڕی عـەقڵ باوەڕانـەی بـەردەوام. فـوور بـەپێی سەرچـاوەگەلێکی زۆر و بـاوەڕپێکراو لــە بــوارە جۆراوجۆرەکـانی فەرهـــەنگ و فکـــری چـــەرخی شـانزەهەم، هــەوڵ و تەقــەلای ئەوەیــە کــە بۆمــان ڕوونکاتەوە کە لە ساتێکدا بەستێن یا بنەمای شیاو بۆ خـودا نابـاوەڕی عـەقڵ باوەڕانـەی بـەردەوام نـە لـە هەسـتەکاندا بـوەو نـە لـە جیهـانبینی (فەلسـەفی و زانستی) لە ئاکامدا ئەم خـودا نابـاوەریـە هـیچ جـۆرە پشتیوانێکی نەبووە، هەر نەفیەك بۆ کـەڵك وەرگـرتن لـــە بـــەهای کۆمەڵایـــەتی و مێـــژوویی دەبـــێ پشـتیوانێکی هـەبێ. نـەفی زەیـنی و گانـاوی (هـوس بازانــە) بــێ بنــەما و پشــتیوان (تــەنیا "مــن نــەفی دەکەم") هیچ بەهایەکی مێژوویی نییە.

لــە چــەرخی شــانزەهەم، فەلســەفەش وەکــو زانســت (لــە ڕاســتیدا هێشــتا نــەبووە) پشــتیوانی پێویســتی بــۆ نــەفی ئــایین تــەیار نــەکردووە و بــەم بۆنـەوە، خـودا نابـاوەڕی عـەقڵ باوەڕانـەی بـەردەوام نـامومکین بـووە. فـوور هـەموو کتێبەکـەی تـەرخان کردووە بۆ سـەلماندنی ئـەم تیـۆرە.. کتێبەکەی ئەو بە تایبەتی دەرکی لایەنگەلێك لە فەرهەنگی چەرخی شـانزەهەمی تـەیارکردوە. بـەڵام بـە پێچـەوانە بـۆ تێگەیشتن لە ڕۆمانی ڕابلە وەك بەرهەمێکی ئەدەبی، بۆ تێگەیشتنی جیهانبینی هونەری ڕابلە، زۆر کەم و هەمیشـە بـە شـێوەی ناراسـتەوخۆ – قـازانجی هەیـە. ئەندێشەی هونـەری ڕابلـە بـە ڕادەیـەك نـەك لـە خـودا نابـاوەڕی عەقڵ باوەڕ جـێ دەگـرێ و نـەك لـە بـاوەڕی

دینی، بریتییە لە ئایینی کاتولیک، پروتستان یا "ئایینی مەسیحی" دڵخوازی ئورتوودوکسەکان. ئەندێشەی رابلە لەگەڵ ئەوەشدا بەرینتر، قووڵتر و رادیکاڵترە، هەموو چەشنە ماقووڵیەکی یەك لایەنەو هەموو کۆنەپەرستیەك لەگەڵیدا نامۆیە. جیهانبینی هونەری رابلە نەك نەفی دەرهەستانە و خاوێن قەبوول دەکا و نەك سەلماندنی یەك لایەنە. تیۆریەی لووفرانك" هەروەکوو تیوریە دژەکەی نوور، بە گشتی بەیەك رادە ئێمە دوور ئەخەنەوە لە تێگەیشتنی دروستی جیهانبینی هونەری رابلە و فەرهەنگی چەرخی شانزەهەم.

..لە ئەدەبیاتی جیهانی رابردوودا، پێکەنین و تارۆز ئێجگار زۆرتر لەوەیە کە گوێی ئێمە توانای بیستن و تێگەیشتنی هەیە. ئەدەبیاتی (بە تایبەت شێوەی بەیان) هەندێ لە دەورانەکان (شارستانیەتی یوونانی چەرخەکانی ناوەندی) بە تەواوی نوقمە لە شێوەگەلی جۆراوجۆری پێکەنینی سنووردار کە ئێمە تەنانەت لە گرتنی هەندێکیان دەستمان کێشاوەتەوە. زۆر جار واتای دژایەتی لەبەرچاو ناگرین. گومانی تێدا نییە کە دەبێ زۆربەی بەرهەمە ئەدەبیەکانی جیهانی رابردوو سەر لە نوێ بخوێنینەوە و هەڵیسەنگێنین بەلاّم بۆ ئەم کارە بەر لە هەموو شتێك دەبێ تێبگەین لە سروشتی تایبەتی پێکەنینی خەڵکی. بایەخەکەی لە پێگەی جیهانبینی، دوو چەشنی و پەیوەندی لەگەڵ رۆژگاردا، واتا تێبگەین لە هەموو ئەو شتانەی کە پێکەنینی رۆژگاری ئێمە دەکرێ بڵێین بە تەواوی لە دەستی داوە.

چونکوو لوسین فوور فەرهەنگی بزەهێنەری خەڵکی لەبیرچووە، توانای ناسینی دروستی رێنیسانس و چەرخی شانزەهەمی فەرانسایی نییە.

ئازادی دەروونی ئاوارتەیی، دژایەتی کۆنەپەرستانەی بڕی (قاطع) زاتی ئەم قۆناغە نابینێ و نایەوێ ببینێ چونکو و پشتیوانێکیان بۆ نادۆزێتەوە. ئەو دیمەنێکی یەك لایەنە و درۆینە لە فەرهەنگی چەرخی شانزە ئەخاتە ڕوو.

ئیحساسگەلێك وەکوو بڕوای ساویلکانەو سەرشۆڕانە، بە تەواوی نامۆیە لەگەڵ پێکەنینی بەهێزی رابلەیی.. گەشبینی رابلە، گەشبینی گشتیە.. سەلوفسکی سروشتی تایبەت و حەقیقەتی شۆڕشگێڕانەی پێکەنینی گشتی کە لەبەرهەمەکانی رابلە بابەتێکی دەرەوشاوەیە، نابینێ.. لە راستیدا ئەو وەکوو پسپۆڕە رۆژئاواییەکان، تەنیا رابلەی فەرمی دەبینێ، و لە کتێبەکەی خۆیدا تەنیا لایەنە لاوەکیەکانی شی ئەکاتەوە کە پەرچدەری هەندێ لە رەوتە ئەشرافی یا بۆرژوازیەکانن بەلاّم بەرهەمەکانی رابلە لە بنەمای خۆیدا، قازانجەکان، هیواکان و رادیکاڵترین ئەندێشەکانی خەڵکی پەرچ ئەدەنەوە کە لەگەڵ هیچ کام لە بزوتنەوە هەتا رادەیەك پێشکەوتووی ئەشراف یا بۆرژوازی بە تەواوی یەکناگرنەوە.

پینسکی بە دروستی ئەوە شی ئەکاتەوە کە پێکەنینی رابلە بەرەو ناسین هەنگاو دەنێ و پەیوەندییەکی راستەوخۆی هەیە لەگەڵ حەقیقەتدا. پێکەنین ئاگای لە ماقوڵیەتی درۆ نییە، کۆنەپەرستی و هەموو ئەو سیفەتانە خاوێن ئەکاتەوە کە خەریکی رەشکردنەوەی زەینن.

## سەرچاوە

باختین، میخائیل. "رابله و تاریخ خنده"، درآمدنی برجامعه شناسی ادبیات (گزیده و ترجمه). محمد جعفر بوینده. چاپ اول (تهران: انتشارات نقش جهان 1377) ص 496–485.

# بەیەکگەیشتنی کورد و ڤیکینگەکان

## (پەیوەندی کورد و سوێدی لە ماوەی هەزار ساڵدا)

ڕۆهات ئالەکۆم

لە سویدییەوە: کاوە ئەمین

ئەو سەرچاوە مێژووییانەی کە باس لە پەیوەندییەکانی کورد و سوێدی دەکەن، دەستنیشانی ئەوەش دەکەن کە کورد و سوێدیەکان لە سەردەمی ڤیکینگەکانیشدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، پەیوەندییان هەبووە. ئەوەی کە ئێمە دەیزانین ئەوەیە کە ئەو پەیوەندیانە لەو سەرچاوانەی کە باس لە ڤیکینگەکان دەکەن، لەسەریان نەنووسراوە. تەنها لە گێڕانەوەیەکدا باسی کوردەکان کراوە ئەویش هێرشی ڤیکینگەکانە بۆ سەر شاری *Berdaa* ساڵی 943، هەروەها لەو لێکۆڵینەوانەی کە لەسەر دراو (سکە)ی وڵاتە ڕۆژهەڵاتیەکان کراوە کە لەسەردەمی ڤیکینگەکاندا لە ژێر ئاخی سوێدا شاردراونەتەوە. بۆ جاری یەکەم ماریا ئانهۆلم و ئ. یوهان لارشۆن هێڵێکی تەریبیان لە بەینی جۆری ژیانی کورد و ڤیکینگەکاندا کێشاوە.

بەشێك لەو دراوانەی کە لە سوێد دۆزراونەتەوە و هی سەردەمی ڤیکینگەکانن، ڕاستەوخۆ گرێدراوییان بە کوردەکانەوە هەیە. کاتێك ئەو جۆرە کەرەستانە بەراورد دەکەین لەگەڵ ئەو سەرچاوانەی کە باسی ڤیکینگەکان دەکەن لە ڕۆژهەڵاتدا، دەبینین کە ڤیکینگەکان پێشتریش پەیوەندییان لەگەڵ میرنشینی کوردەکان و ئەو ناوچانەی کە بەشێوەیەکی سەرەکی دەکەونە سەر دەریاچەی خەزەر و دەوروبەری ڕووبارەکانی فورات و دیجلە، هەبووە.

سوێد بۆ خۆی هیچ وڵاتێکی کۆڵۆنی نەکردووە لە ڕۆژهەڵاتدا، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، لە لێکۆڵینەوە ئارکیۆلۆگی و ئێتنۆگرافی و فیلۆلۆگیەکاندا دەبینین بەشێوەی جۆراوجۆر پەیوەندی لە نێوان سوێد و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا لەسەردەمی ڤیکینگەکاندا، هەبووە. ئەم مێژووی

پەیوەندییە لە بەینی سوێد و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتیدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ڤیکینگەکان (800-1050). لەم ماوەیەدا ڤیکینگەکان سێ تا چوار جار بەرەو ڕۆژهەڵات سەفەریان کردووە. ئەوان چەندین جار سەفەریان بەرەو ناوچەکانی دەریای خەزەر کە بە سێرکلاند ناودەبرا، کردووە. گۆتلاند کە بە "مرواریی دەریای بالتیک" ناو دەبرێت، جێگایەکی گرنگی کڕین و فرۆشتن بوو لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا و، لەوێوە پەیوەندیان لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا دەبەست بەناو ڕووبارەکانی (*Volga* و *Dnepr*)ی ڕووسیادا.

لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا ئەندازەیەکی زۆر ئاوریشم و جەواهیرات و داودەرمان (بەهارات) و شەراب و شووشە و دراوی ڕۆژهەڵاتی هێنراون بۆ سوێد. پەیوەندی نزیک لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا بەستران، کە گەلێك خەڵك و ناوچەیەکی بەرفراوانی لە خۆی دەگرت.

بەشێك لە لێکۆڵەرەوان پێیان وایە کە ڤیکینگەکان، بە تایبەتی سوێدییە ڕووسیەکان، ئەو سوێدیانەی کە پێیان دەوترا ڕووس دەورێکی گرنگیان گێڕاوە لە ڕووداوە مێژوویەکانی کە بە بنیاتنەر و لەدایکبوونی ڕوسیا دەژمێردرێن. بە ئیحتیمالێکی زۆر ئەو ڤیکینگانە لەناو خێڵە سلاڤیکەکانی ڕووسیای مەزندا تواونەتەوە. ڕوسییەکان بوون بە ڕووسەکانی ئێستا. لەماوەی 250 ساڵدا مێژوونوسانی سوێدی و ڕووس لە پەیوەندیی سوێدی - ڕووسیان لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا، کۆلیوەتەوە و هەوڵی ئەوەیان داوە کە گفتوگۆیەك ساز بکەن لەمەڕ بنج و بناوانی وشەی ڕووس، کە لە چەندین سەرچاوەدا بەکارهێنراوە. وشەی ڕووس لە چەند سەرچاوەیەکدا بە مانای خەڵکانی باکوورنشین لە ڕۆژهەڵات، بەکارهێنراوە. یەکێك لەو سەرچاوانە *"Nesorskroniken"*یە کە بە زمانی ڕووسی لە ساڵی 1100دا نووسراوە، لەلایەن ڕەبەندێکەوە بەناوی "*Noster* لە *Kiev*". ئەم سەرچاوەیە ئەوە دەستنیشان دەکات کە هەرسێ برا، (ڕوریك، سینیوس و تروڤور) لەلایەن سلاڤەکانەوە لە ساڵی 862 بانگکران، تاوەکو حوکومڕانیی ڕووسیا بکەن.

### بەرەو سێرکلاند

ڤیکینگەکان بەناو ڕووسیادا بەرەو سێرکلاند کەوتنە ڕێگا، کە دەکەوتە دەوروبەری دەریای خەزەر لەسەر ڕێگای ڕۆژهەڵات. گفتوگۆ لەسەر گرنگی ناوی سێرکلاند بە درێژایی هەموو ساڵی 900 بەردەوام بوو. ناوی سێرکلاند وشەیەکی کۆنی باکووری (سکەندەناڤیاییە) بۆ ئەو شوێنانەی کە زۆرینەی دانیشتووانی عەرەب یاخود موسوڵمان بوون لە ڕۆژئاوای ئاسیا. ئەم ناوچەیە لە کاتی "خاچهەڵگرەکاندا" پێی دەوترا وڵاتی (*Saracen eras*) واتە وڵاتانی موسڵمانان بە زمانی بێزەنتینی.

هەندێك لە لێکۆڵەرەوان پێیان وایە کە ئەو ناوە کۆنە باکوورییە واتە سێرکلاند لە وشەی (*Saracen*)ەوە هاتووە کە بە ئیحتیمالێکی زۆر لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا مەبەستیان لە خەڵکانی وڵاتانی عەرەبی بووە، بە تایبەتی وڵاتانی سەر بە خەلافەتی عەباسی (749-1258). بە گوێرەی قسەی پرۆفیسۆر (*T.J Arne*) دەتوانرێت ئەم وشەیە لە وشەی لاتین *Sericum* هاتبێت واتە ئاوریشم. کەواتە سێرکلاند مانای وڵاتی ئاوریشم. ئەو ئەوەشی بۆ زیاد دەکات و دەڵێت سێرکلاند ئەو ناوچەیە بووە کە ئاوریشمی لێوە هێندراوە، بەتایبەتی وڵاتانی ناوچەی کەنارەکانی خوارووی

دەریایی خەزەر. (*T. J Arne*) پێشنیارێکی تر لە دوای خۆی بەجێدەهێڵێت ساڵی 1911 کە دەڵێت: سێرکلاند لە ناوی شاری وەك پەناگای *Serkel*، کە دەکەوێتە سەرووی دەریای خەزەرەوە لە (کازێرین) و بەهاوکاریی بێزەنتینییەکان قایم کرا بۆ بەهێزکردنی بەرگرییان لە دژی ڤیکینگە ڕۆژهەڵاتیەکان لە ساڵی 800 د.ز. بە پێی هەندێك سەرچاوەی تر (سێرکلاند) کەوتبووە ڕۆژئاوای دەریای خەزەرەوە. (*T.J Arne*) کە لە چەند گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر وشەی سێرکلاند کردووە، ئەوە نیشان دەدات کە پەیوەندی بازرگانی سوێد لەگەڵ ئوریەنت (ڕۆژهەڵات)، لە زۆر دەمێکەوە هەبوو. ئەگەر ئێمە هەموو ئەم ئەگەر و تێگەیشتنانە کورت بکەینەوە، ئەتوانین بڵێین کە ڤیکینگەکان بە گشتی بە هەموو ناوچەی دەریای خەزەریان وتووە (سێرکلاند).

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەسەر ڤیکینگەکان کراون، ئەوە نیشان دەدەن کە ڤیکینگەکان چەند جارێك سەردانی (سێرکلاندیان) کردووە لەو ماوەیەدا بە جۆرەها شێوە پەیوەندیان لەگەڵ دانیشتوانەکەی کردووە. ئەو بەردە نەخشێنراوانەی کە لە سوێد دۆزراونەتەوە ئەوە نیشان دەدەن کە هەندێك لە ڤیکینگەکان لەو وڵاتی خۆرهەڵاتە مردوون: یەکێك لە ڕۆژهەڵات مردووە، ئەوی تریش لە ڕۆژئاوا. یەکێك لەو نوسینانەی کە لەسەر ئەو بەردانە هەڵکۆڵراون و بە چاکی باسی سەفەری ڤیکینگەکان دەکات، ئەو بەردەیە کەوا لە نزیك (گریبسهۆلم) لە نزیك ماریافرید، دۆزراوەتەوە. لەسەر هەندێك لەو بەردانە بۆ نموونە نووسراوە: "ئەو لە ڕۆژهەڵات گیانی لەدەستداوە" یاخود "ئەو بەرەو وڵاتی خۆرهەڵات سەفەری کرد بۆ باخچە گرانبەهاکە". نووسراوی سەر ئەم بەردانە سەرچاوەی گرنگن چونکە باس لە پەیوەندی سوید دەکەن لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژهەڵات لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا. ئەم بەردانە کە بۆ یادکردنەوەی ئەوانەی کە لە سێرکلاند گیانیان لە دەستداوە، دانراون، بەڵگەیەکی زیندوون لەسەر پەیوەندی ڤیکینگەکان لەگەڵ میللەتە جۆراوجۆرەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەوانەش کوردەکان.

**گۆتلاند: گەورەترین جێگایە کە سکەی کوردی لێ دۆزراوەتەوە**

بە گوێرەی ئەو زانیاریانەی کە لە زۆر کەتەلۆگ و ئەو زانیاریانەی کە لەلای دەستەی لێکۆڵینەوەی سکەناسی لە زانکۆی ستۆکهۆڵم هەن، گۆتلاند گەورەترین جێگایە کە (سکە و دراوی) کوردی لێ دۆزراوەتەوە لە سوێد. لە بەینی ساڵانی (1815 – 1990) لە سەرانسەری سوێددا، 90دانە (سکەی مەروانی) و ژمارەیەکی کەمتر لە هی میرنشینەکانی تر، دۆزراونەتەوە. زۆربەی ئەوانە واتە 83 دانەیان لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی (گەڕەکەکان)ی گۆتلاندا، بڵاوبوونەتەوە، 7 دانەش لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی تری سوێد دۆزراونەتەوە.

دراوی (سکەی) مەروانی لە سەردەمی جۆراوجۆر و شوێنی جیاواز لە گۆتلاندا دۆزراونەتەوە. ئەمەش گەلێك ناوچەی گۆتلاند دەگرێتەوە. هەروەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد هەندێك سکەی کوردی کە لە ئازەربایجانەوە هێنراون بۆ سوێد دۆزراونەتەوە. ئەگەر هەموو ئەم سکە دۆزراوانە کۆبکەینەوە واتە بە (90) دانەکەی مەروانیەکانیشەوە، ژمارەی سکەکان (ئەوانەی لە گۆتلاند و ناو سوید خۆشی دۆزراونەتەوە) تەخمین دەکرێت بە 100 دانە. لێکۆڵینەوەی زەویناسی

(ئـەرکیۆلۆگی) بـە بـەردەوامی لـە وڵاتـی سـوێد دەکرێـت، بۆیـە زەحمەتـە ژمارەیـەکی دروسـت لـە ژمارەی (سکەکان) بدرێت.

نزیکـەی هـەموو ئـەم (سـکانە) لـە سـەردەمی دەستەڵاتدارێتی (ئەبو عەلی الحەسەن ئبن مەروان) و (ئەبو مەنسور سەعید بن مەروان) لێ دراون لە شـارەکانی (مایفـارقین و جزیـرە و نسـێبین). ناسراوترین ناوچەش مایفارقین بووە. لەناو ئەو سـکە کوردیانـەی کـە لـە سـوێد دۆزراونەتـەوە دانەیـەکیان لـە شـاری ئامیـدا (دیاربـەکری ئێسـتا) دروستکراوە. لەناو سکەکاندا سکەی دوولەتکراو و سکەی کۆنتێکراو دەبینرێن. ئەم جۆرە شێوانە ئەوە دەگەیـەنێت کـە ئـەم سـکانە وەکـو خشـڵیش بەکارهاتوون.

یەکەمین سکەی کوردی کە لە سوید دۆزرایەوە لە ساڵی 1815 بوو، ئەویش لە (برۆبی) سەر بە ناوچـەی (ئۆسـتیر هانینگـە) بـوو کـە دەکەوێتـە پارێزگای سۆدیرمانلاند. ئەو سکە مەروانیانەی کە لە سوێد دۆزراونەتەوە، بەم شێوەی خوارەوەیە:

*Gotland ………….83*

*Medelpad ………..3*

*Skane …………….1*

*Sodermanland …….1*

*Uppland …………..1*

*Vastergotland …….1*

گۆتلاند پەیوەندیەکی زیندووی بە جیهانەوە هەبوو لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا. لە سوید نزیکەی هەشتا هەزار سکەی ڕۆژهەلاتی دۆزراونەتەوە لەوانە پەنجا هەزاریان لە گۆتلاند.

لەسـەردەمی ڤیکینگەکانـدا، خـەڵکی گۆتلانـد زیـاتر خـەریکی بازرگـانی کـردن بـە شـێوەیەکی ئاشـتیانە، بـوون. ڕەنگـە هـەر ئـەوەش بێـت وای کردبێت کە ئەو هەموو سکانە لەوێ دۆزراونەتەوە. لـەم خشـتەی خـوارەوەدا نمونـەی ئـەو سـکە مەروانیانە دەبینین کە لە کاتی جیاوازدا لە گۆتلاند دۆزراونەتـەوە، ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت کـە بـە هەموو جزیرەکەدا بڵاوبوونەتەوە.

فیندئارڤە (ڕۆنیٚ، 1848) ………2

ئۆسـتره بیرومینـت (ڤیسـپی، 1869) ………..9

ئۆستره ریفتیس (فولا، 1871) …………14

مانێگۆردا (لیێ، 1900) ……………4

ستوره سۆیدەبی (فولا، 1910) ………6

ئێسکۆپس (هایده، 1961) ……..2

بۆته (ئالسکۆگ، 1990) …………2

ئەگەرچی ئەوەی کە سکە کوردیەکان زۆریش نـەبوون، بـەڵام لـە هـەموو سـکندەناڤیادا دۆزراونەتـەوە. ئـەو سـکە کوردیانـەی کـە لەلایـەن لێکۆڵـەرە جۆراوجۆرەکانـەوە دۆزراونەتـەوە لـە نـەرویج و دانمـارك، لـەو سـکانەن کـە لـە هـەموویان تـازەترن. دوو سـکەی مـەروانی لـە نـەرویج و یـەك دانەش لە دانمارك دۆزراونەتەوە. ئەوەی کە بۆچی هێندە کەمن دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پەیوەندیـەکی کەمیان لەگەڵ ڕۆژهەلاتدا هەبووە.

مێـژووی ڕەچـەڵەك و تەمـەنی سـکە سـەرەتاییەکان کـە دۆزراونەتـەوە لـە سـوێد لەلایـەن ڕۆژهـەلاتناس (*1807-1877, C.J Tornberg*) و (*-1843 1928, Esaias Tegner*) دیـاریکراون. پرۆفیسـۆر تـۆرنبیری یەکێکـە لـەو یەکـەمین کەسـانەی کـە وەك شارەزایەك لێکۆڵینەوەی لەسەر سکەی ڕۆژهەلاتی و کـوردی سـەردەمی بنەماڵـەی مەروانیـەکان کـردووە، کە لەناو زەویی سویدا دۆزراونەتـەوە. بۆ یەکـەمین جـار لـە وتارێکـدا، لـە سـاڵی 1847دا سـێ سـکەی کوردی زەمانی مەروانیەکانی ناساند. ساڵێك دوای

ئەوە پێناسەی جۆرەها سکەی کوردی کرد و 12 وێنەی سکەی سەردەمی مەروانیەکانی کێشا. ساڵی 1857 تۆرنبێری باسی ئەوە دەکات کە لە سوید 13 سکەی سەردەمی بنەماڵەی سەربەخۆی کوردی مەروانی دۆزراونەتەوە: ..لەهەمان سەردەمی پێشوودا، بنەماڵەی مەروانی کە بە ڕەچەڵەك کورد بوون، هەبوونی هەبووە، کە دەکەوتە ناوچەی دیاربەکر، ئەوان دەسەڵاتیان گرتە دەست پاش ئەوەی ناوچەکەیان داگیرکرد لە ساڵی (990 پ.ن) لەناو زەوی سویددا 13 سکەی سەردەمی یەکەمین پاشایان دۆزراونەتەوە (994/993) و (1008 /1009).

لە ڕوانگەیەکی کولتوریەوە دۆزینەوەی ئەم سکە کوردیانە لەناو خاکی سوید بایەخێکی گرنگیان هەیە زانیاری لەسەر ئەم سکانە کۆمەکێکە بۆ پەرەپێدانی (سکەناسی)ی کوردی لە داهاتوودا. ئەم دۆزینەوە ئارکۆلۆگیانە، بایەخێکی گرنگیان هەیە بەوەی کە نیشاندەری جۆرەها پەیوەندین، بۆ کۆنترۆڵکردنی کە تا چ ئەندازەیەك ئەم زانیاریە مێژوویانە لەسەر پەیوەندی کورد و سوێدی کە لە سەرەچاوە نووسراوەکاندا هەن، لە ڕاستییەوە نزیکن.

**چۆن ئەم سکە کوردیانە گەیشتوونەتە باکوور؟**

دوو ڕێگای سەرەکی هەبوون بۆ هێنانی کاڵا بۆ باکوور. یەکێکیان ڕێگای دنێپر و ئەوی تریشیان ڕێگای ڤۆڵگا بوو. ڕێگای دنێپر ئەو ڕێگایە بوو کە دەچووەوە سەر دەریای ڕەش و بیسانس. بە ئیحتیماڵێکی زۆر ئەو سکانەی کە هێنراون بۆ گۆتلاند و هی سەردەمی مەروانیەکانن، ئەو گەنجانە (ئەوانەی کە دەبوون بە پاسەوانی قەیسەر، بە کوردیی ئێستا جاش) لەگەڵ خۆیان هێنابوونیان بۆ کۆنستەنتینیۆڵ و پاشان بەم ڕێگایەدا هێنراون بۆ گۆتلاند. ئەو گەنجانەی کە بە ئارەزووی خۆیان هاتبوون بۆ کۆنستەنتینیۆڵ وەکو پاسەوان (بەکرێگیراو)ی قەیسەر کاریان دەکرد. ئەوان چۆن ئەم سکانەیەن بە دەست کەوتبوو؟ ئەم بەکرێگیراوانە لە کاتی شەڕیشدا شوێن قەیسەر دەکەوتن، لەوانەش بۆ کوردستان و ئەو ناوچانەی دەوروبەری. ڕەنگە ئەوان ئەم سکانەیان ڕاستەوخۆ لە کاتی شەڕەکاندا لە کوردستان بە دەستخستبێت. ئیحتماڵێکی تر ئەوەیە کە ڕەنگە ئەوان هەر لە کۆستەنتینۆپل ئەو سکانەیان بە دەستخستبێت. لەو سەردەمەدا کۆنستەنتینیۆڵ شارێکی ناوداری جیهانی بازرگانی بوو. بازرگانانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەوێ کۆدەبوونەوە و ئاڵوگۆڕی بازرگانییان دەکرد. گەلێك ڕێگای بازرگانی لە کۆستەنتینیۆڵ بەیەك دەگەیشتنەوە. ئەم پەیوەندیانە دەبوونە هۆی زیاتر دەستاو دەستکردنی سکەکان.

بەگوێرەی تیۆریەکی تر، ڕێگایەکی تر کە سکەی مەروانیەکانی پێدا هاتبێت بۆ گۆتلاند، لە ڕێگای دەریای خەزەرەوە بەناو ڕووباری ڤۆلگادا. ئەم ناوچانە چەند جارێکی تریش پێشتر لەلایەن ڤیکینگەکانەوە سەردانیان کرابوو. ڕێگای ڤۆلگا کە دەچووەوە سەر دەریای خەزەر و ڕۆژهەڵاتی موسڵمان (ئەوەی کە پێیان دەوت سێرکلاند)، ڕێگایەکی سەرەکی هاتوچۆ بوو لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا.

ئەی ئەو سکانەی ناوچەی دیاربەکر کە دەکەوێتە لای خوارەوە، چۆن گەیشتوونەتە کەنارەکانی دەریای خەزەر لە باکوور؟ دەبێت چی بووبێتە هۆی دروستکردنی ئەو پەیوەندیانە؟ من پێموایە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ دەوری گرنگی بازرگانیی شاری مایفارقین لەگەڵ جیهان. مایفارقین

پایتەختی دیناستی مەروانییەکان بوو کە خۆیان کورد بوون. لە سەردەمی پڕ دەسەڵاتی بنەماڵەکەیاندا، لە گەلێك ناوچەی جیاوازەوە، بازرگان ڕوویان دەکردە ئەو دەڤەرە. ئەو ناوچەیەی کە مەروانییەکان حوکمیان لێ دەکرد، لە ڕووی بازرگانییەوە گەلێك گرنگ بوون، چونکە زۆر کاروانی بازرگانی لەوێ یەکیان دەگرتەوە، هەمانکات کوردستان زۆر دەوڵەمەند بوو بە سەروەتی سروشتی. تۆرنبیری ئەم زانیاریانەی لەسەر شاری نسێبین لە دوای خۆی بۆ بەجێهێشتووین:

...بەهەمان ڕێگادا بە سێ ڕۆژان دەگەیشتیتە نوسێبین، کە پایتەختی وڵاتی بەنو – ڕابیس بوو، ناوچەیەك بوو کە لە هەموو جزیرەدا زیاتر ژیانی تێدا دەکرا، ئەم ڕێگایانە گەلێك بەناودەنگ بوون، بە تایبەتی ڕێگا ئاویەکانی گرنگیەکی تریان دابوو بە بازرگانی. لە چیای جودی کە دەکەوێتە ئەو نزیکانە، کریستاڵیان دادەتاشی. ئێمە چوار دانە لەو سکانەمان لە بەردەستدایە، یەکێکیان هی ساڵی (920)، سێ دانەکەی تریان هی سەردەمی کۆتایی سەدەی چوارەمە، کە لە لایەن میری مەروانییەکانەوە لێدراون.

مایفارقینی پایتەخت، یەکێك بووە لە ناوەندە بازرگانییەکانی دیناستی مەروانییەکان، کە بازرگانی قوماش و ئەو کەرەستانەی کە لە پەموو دروست دەکران باش بەرەو پێش چوو بوون. یەکێك لە بازاڕەکانی شارەکە ناوی "بازاڕی قوماشی پەموو" بوو. بە گوێرەی قسەی تۆرنبێری بەشێك لە سکەکان لە شاری دیاربەکر لەلایەن مەروانییەکان و حەمدانیەکانەوە لێدرابوون:

...لەلای سەرووی نوسێبینەوە، بە چوار ڕۆژ دەتوانی بگەیتە شاری مایفارقین، کە دەکەوێتە لای ڕووباری دیجلەوە و جوانترین شوێنە لە ناوچەی دیاربەکر، گەلێك دەوڵەمەندە بە میوە و دارخورما بەڵام هەتا بڵێی ئاووهەوایەکی خراپی هەبوو. شەش دانە لەو سکانە لەلایەن حەمدانییەکان و مەروانیەکان دروستکراون لە بەینی ساڵانی (965-1009) لە شاری مایفارقین، هەموو ئەم سکانە ناوازەن (شازن) و بە چاکی پارێزراون.

هەروەك تۆرنبێری باسی کردووە هەمدانیەکان (905-1004) دیناستیەکی عەرەبی بوون کە پێش دامەزرانـدنی مەروانییەکان حوکمڕانی سووریا و پارێزگای دیاربەکریشیان کردووە. هەندێك لەو سکانەی کە هی (دیاربەکر)ن لەلایەن میرەکانەوە دروستکراون و لە کاتی جیاوازدا هێنراون بۆ سوید، لەلایەن لێکۆڵەرەوە (*Ulla S. Linder- Welin*) وە لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە.

لەلایەکی ترەوە سێهەمین ئەمیری مەروانی (نەسر ئەلدەولە) کە لە پارێزگای دیاربەکر حوکمڕانیی کردووە ساڵی 1011-1061، کچی ئەمیرێکی پارێزگای ئاڕان ژنی بووە، کە دەکەوێتە لای دەریای خەزەر. ئەم دوو ناوچە کوردیە بە شێوەیەك جۆرە پەیوەندیەکیان هەبوو لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا. ئەمەش بە نۆرەی خۆی کاریگەری هەبووە لەسەر ئاڵوگۆڕپێکردنی ئەو سکانە لە ناوچەیەکی گەورەتردا. هەروەك لەسەرەوە باسمان کرد، بەشێك لە هەڵمەتی ڤیکینگەکان بۆ ئاران لە ساڵی (1030-1033 و 2 1041) کراون. ئەمەش یارمەتیدەرێکی باش بووە بۆ ڤیکینگەکان تا دەستیان لە سکەی مەروانییەکان گیرببێت، بەو شێوەیەش تەنها لە ڕێگای کۆستەنتینیپۆڵ نا، بەڵکو لە ڕێگای تریشەوە بۆ نموونە لە ڕێگای دەریای خەزەر و ناوچە نزیکەکانی دەوروبەری، سکەکانیان بەدەست خستووە.

هەنـدێك پەیوەنـدی ناڕاسـتەوخۆ لـە بەشـە جۆراوجۆرەکانی ڕووسیاوە گرێدراون، بەو شێوەیە ئـاڵوگۆڕی بازرگـانی کـراون. کـازار و بولگاریـەکان دەورێکی گەورەیان گێڕاوە بۆ بازرگانەکان، بە هـۆی ئـەوەی کە ولاّتی خۆیانیـان لـە قـەراخ ڕووبارەکـانی (دۆن و ڤۆڵگا)وە دروست کردبوو. پاشان ڤیکینگە ڕۆژهەلاّتیەکان بەناو دەریای بالتیکدا ئەو سکانەیان لەگەڵ خۆیان هێناوە بۆ سوید و باقی سکندەناڤیا. کازارەکـان لـە شـارەکانی وەکـو (سـەرکەل و ئیتـل) گەلێك پەیوەندی بازرگانیان گرێدابوو. کازارەکان کە دینی جۆراوجۆریان دەپەرست (ئیسلام، مەسیحی و جوولەکە) کۆنترۆڵی ئەو ڕێگا گرنگانەیان دەکرد کـە دەچـوون بـۆ سـەر دەریـای خـەزەر. کازارەکـان کۆنترۆڵیان بەسەر ڕێگا بازرگانیەکانـدا هـەبوو، هـەر بۆیـە لـە سـەدا دەی کەلوپـەلی ڤیکینگـەکانیان وەکـو گـومرگ بـۆ خۆیـان دەبـرد، کاتێـك بـە ولاّتەکەیانـدا تێپـەڕ دەبـوون. لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ ناوهێنـانی (*Kaspiska havet*) واتـە دەریـای خـەزەر، کوردەکـان ئێستاش پێی دەڵێن (بەحری خەزەر). نووسـەرێکی عـەرەب (*Ibn Al-Athir*) دەڵێت کە نزیکـەی 10000 کورد لەلایەن سوپای کازاریەوە کوژراون.

بە ئیحتمالێکی زۆر لـە سـەردەمی گەشـەکردنی مەروانیەکانـدا بازرگانـە موسـوڵمانەکان، ڕاسـتەوخۆ ئـەو سـکانەیان لەگـەڵ خۆیـان بـردووە بـۆ بازاڕەکـان کـازارین و مەملەکـەتی ڤۆلگـای بولگاریـەکان لـە ڕوسـیا. بولگاریـەکانی ڤۆلگـای کـە پێشـیان دەوتـن (ڕەشـە بولگارە)کـان لـە قـەراخ ڕووبـاری ڤۆلگـای بارەگایان لـێ خستبوو. خـەڵکی ولاّتی باکوور هـەم لەگـەڵ ڕەشـە بولگارەکـان و هەمیشـە لەگـەڵ کازارەکـان، لـە سـەردەمی ڤیکینەکانـدا بـە یـەکتری ئاشنابوون. سەرەڕای هـەموو مەترسـی و سـەختیەك کـە تووشـیان دەهـات، ڤیکینگـەکان لـەلای مۆڵگـەی بولگاریـەکانی – ڤۆلگـای یـاخود کازارەکـان نەدەمانـەوە، بـەڵکو بـەرەو خـوارووی ناوچـەکانی دەریای خەزەر درێژەیان بە گەشتەکەیان دەدا:

بەشـێکی گـەورە لـە بازرگـانیی نێـوان ولاّتـانی ئیسـلامی و ئـەوروپای بـاکوور ڕاسـتەوخر نـەبوو، بەڵکو لە ناوچەکانی ڕوسیادا ئاڵوگۆڕ دەکراو گەلێك جارێش لە ڕێگای دەستی دووەمەوە دەکرا. بەلاّم لـە ڕاسـتیدا هـەمانکات مـرۆڤ لـە ڕێگـای نووسـراوی سـەربەردەکان و سەرچـاوە فارسـی و عەرەبیـەکان ئـەوەی بـۆ دەردەکـەوێت کـە ڤیکینگـەکان چوونەتە ئـەو ناوچـانەی کـە ئیسـلام ئـاینی سـەرەکی بـووە تیایاندا و پاشان گەڕاونەتەوە بۆ باکوور.

ئـەو هـەموو سـکانەی کـە لەسـەردەمی ڤیکینگەکانـدا هێنـراون بـۆ سـوید، نەتیجـەی پەیوەندیەکانی نێوان باکوور و سێرکلاند بووە. ئەو زانیاریە ئەرکۆلۆگیانەی سەرەوە گەواهی دەدەن بۆ سەرچـاوە نووسـراوەکان. کـات و شـوێنیش بـە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ یەکتری یەکدەگرنەوە. لە دەوروبـەری سـاڵی (1000)دا، کۆتـایی بـەهێنانی سـکەی کـوردی و عەرەبیـەکان بـۆ گۆتلانـد و بـاقی بـاکوور، هێنـراوە. گۆرانکاریـە سیاسـی و ئابووریـەکان بوونەتـە هـۆی پچـڕانی پەیوەندیـە بازرگانیـەکان لەگـەڵ ولاّتـانی ڕۆژهەلاّتـدا. داگیرکاریـەکانی تـورك لـە ناوچـەکە و دۆزینـەوەی ڕێگـای تـازە بوونەتـە هـۆی کەمکردنـەوەی بەرژەوەندی ڤیکینگەکان لە قەفقاسیا و ناوچەکانی دەریای خەزەر.

### یەکەمین پەیوەندی کورد و سوێدی لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا

بە ئیحتیمالێکی زۆر، یەکەمین بەیەکگەیشتنی کـورد و ڤیکینگـەکان لـە هێرشـی ڤیکینگـەکان لـە

ساڵی 943 بۆ سەر شاری (بەردەعە) و داگیرکردنی، کە دەکەوتە ئازربایجانی ئێستاوە لەلای خوارووی ڕۆژئاوای شاری باکۆ وە، ڕویدابێت. ڤیکینگەکان بە دوای ڕووباری ڤۆلگا دەکەوتن کە هێڵی پەیوەندی نێوان ڕۆژهەلآت و باکوور بوو. شاری بەردەعە ناوچەیەکی گرنگ و شارێکی بازرگانی بوو لە پارێزگای ئاران کە دەکەوتە نێوان هەردوو ڕووباری (کورا و ئاراکیس) لە ئازەربایجان. ئەم ناوچانە هەروەك پێشتریش ئاماژەی پێکرا پێی دەوترا سێرکلاند لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا. شاری (*Berdaa*) بەردەعە دەکەوتە نزیك ڕوباری (تێرتێر)ەوە کە ڕوبارێکی لاوەکی (کورا) بوو. لە زەمانی زوودا بە ڕووباری تێرتێریان دەوت (ئاوی– کورد ئەلیم– *Ava Kurd Elem*). بەگوێرەی قسەی مێژوونووسی عەرەب (موقەدەسی) بە یەکێك لە دەرگاکانی شاری (*Berdaa*) یان دەوت (دەرگای کوردان – *Bab al-akrad*). لەم ناوچانەدا کوردیش دەژیان. شاری (*Berdaa*) دارای سەروەت و سامانێکی سروشتی زۆر بوو کە ڤیکینگەکانی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. *C. J Tornberg* دەگێڕێتەوە:

...هەروەك وتمان (*Berdaa*) شارێکی بەناوبانگ بوو. دەکەوتە ناوچەیەکی بەپیت و بەرەکەتەوە و، ناوچەیەکی پانوبەرینی لە خۆی دەگرت. لە تەنیشتیەوە کانی زیو و ئاڵتونی لێ بووە.

بنەماڵەیەکی بەناوبانگی کورد بەناوی شەدادیەکان لە ئاران هەبوو. پایتەختەکەیان (گەنجە) بوو کە دەکەوتە سەر ڕێگای نێوان (*Berdaa*) و (*Tbilisi*)وە. مێژووی ئەم شارە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 859. بناغەدانەری ئەم دیناستیە موحەمەد شەدادی کوڕی کارتو بوو، سەر بە خێڵی ڕەوادی. سەلاحەدینی گەورەی کورد کە ئورشەلیمی (قودسی) داگیرکرد لە ساڵی 1187 لە کاتی هێرشی خاچپەرستەکاندا، باب و باپیرانی سەر بە هەمان خێڵ بوون. بە گوێرەی قسەی ڕۆژهەلآتناس مینۆرسکی، باپیرە گەورەی سەلاحەدین لە گوندێکی نزیکی شاری دڤین لە دایکبووە، کە دەرگایەکی سەرەکی شاری ئاران بووە. دڤین و گەنجیا دوو شاری مێژووی سەردەمی شەدادەکان بوون. شەدادەکان یەکێك لە گەورەترین دیناستیەکانی کورد بوون لە ئاران، لە بەینی ساڵانی 952–1174دا حوکمڕانیان کردووە.

ڤیکینگەکان کە پێشیان دەوترا ڕووس (ناوی ڕوس نابێت لەگەڵ ڕووسەکانی ئێستا تێکەلآو بکرێت) بە چەند هەزار کەسێکەوە چوونە ناو شاری (*Berdaa*) وە ساڵی 943، شارەکەیان تالآن کرد و خەڵکەکەشیان بە دیل گرت. ئەم داگیرکردنە چەند مانگێکی خایاند. (*C. E. Bosworth*) ئەو ڕووسانە بە "ڕووسی سکندەناڤیایی *Rus Scandinavian*" ناوزەد دەکات. مێژوونووس عەرەب (*Ibn Niskawaih*) دەڵێت کە لە کاتی گرتنی شارەکە لەلایەن ڤیکینگەکانەوە، فەرمانداری شاری (*Berdaa*) هەندێك کوردیشی لەگەڵ بوو. مەرزوبان ئیبن موحەمەد نوێنەر و فەرمانداری شارەکە خەڵکی بە دژی ڤیکینگەکان کۆدەکردەوە و سوپایەکی چەند هەزار کەسی پێکەوە نا. بەلآم ئەوان نەیانتوانی خۆیان لەبەر ڤیکینگەکاندا ڕابگرن و شکان. ڤیکینگەکان دوچاری نەخۆشیەکی ساری بوون و ژمارەیان تا دەهات لە کەم بوونەوەدا بوو. لە کۆتاییدا ئەوانەی کە بە ساغی دەرچوون بەرەو ڕووباری (کورا) بە ڕێکەوتن، لەوێ بەلەم چاوەڕێی دەکردن. شاری (*Berdaa*) یان بەجێهێشت. لەگەڵ خۆیان چەندین زیو و سکەی ئاڵتون و شتی گرانبەهایان برد. چەندین ژنیان ڕفاند و لەگەڵ

خۆیان بردنیان و کردنیان بە عەبد و لە بازاری کۆیلەفرۆشەکانی باکووردا فرۆشران. لێکۆڵەرەوەی سویدی (*T. J Arne*) ئەم چەند دێرە دەربارەی شاری (*Berdaa*) و دەوروبەری دەنووسێت:

مەرزوبان ناچاربوو کە لەگەڵ بەشێکی گەورە لە پیاوەکانی شار بەجێ بهێڵێ، بۆ ئەوەی بچێت سەرکوتی ڕاپەڕینێك بکات لە ئازەربایجان، لەگەڵ بەشێك لە فەرماندەکانی خۆی بەتایبەتی 500 دیلیمیتر، 1500 سوارچاکی کورد و 2000یش بە خواستی خۆیان.

ئایا چی بەسەر ئەو 1500 کوردەدا هات کە بەشداریان لە شەڕی بەرگریکردنی شاری (*Berdaa*)دا کرد ساڵی 943؟ هیچ زانیاریەکی دروست دەربارەی چارەنووسیان لەبەردەستدا نییە. (*Ibn Niskawaih*) بەردەوام دەبێت و دەڵێت کە هەموو دانیشتوانی شارەکە جگە لەوانەی ئەسپیان هەبوو، تێکشکێنران. ئەمە بەو مانایە دێت لەبەرئەوەی کوردەکان سوارە بوون، بۆیە بە ئیحتمالێکی زۆر ئەوان زۆر زەرەریان نەدیبێت. مێژوونوس و ئارکیۆلۆگی سویدی (*T. J Arne*) ئەو شەڕە بە هێرشێکی ڤیکینگەکان ناو دەبات.

دۆزینەوە ئەرکۆلۆگیەکان پشتیوانی ئەو بیرۆکەیە دەکەن کە یەکەمین بەیەکگەیشتنی کورد و ڤیکینگەکان لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا، 1000 ساڵ پێش ئێستا ڕوویداوە. لە ساڵی 1929دا لە ناوچەی (گوستاف فرۆیل) لە گۆتلاند، سکەیەکی کوردی دۆزراوەتەوە کە لە شاری (*Berdaa*) لە سەردەمی حوکمڕانی شازادە (دایسن ئیبن ئیبراهیمی کوردی)، لێدراوە. ئەو سکە کوردیە ساڵی 937/936 لێدراوە، چەند ساڵێك پێش داگیرکردنی شارەکە. ئەم سکەیە ئێستا لەگەڵ سکە ڕۆژهەڵاتیەکاندا پارێزراوە لە (*Kungliga Myntkabinettet*) لە ستۆکهۆڵم. سکەیەکی تر کە هەر بە ناوی (دایسام)وە لێدراوە لە شاری (*Berdaa*) ساڵی 937/936 لە ڕوسیا گیرساوەتەوە.

باشە دایسام کوڕی ئیبن ئیبراهیمی کوردی کێیە؟ بنەماڵەی دایسام خەڵکی مووسڵن. کاتێك کە ناکۆکی نێوان گروپە موسڵمانەکان سەرهەڵدەدات لە شاری موسڵ، باوکی دایسام شار بەجێدەهێڵێ و دەچێت بۆ ئازەربایجان ساڵی 897/896، لەوێ کچی میری کوردەکان مارە دەکات و پاشان دایسام دێتە دنیاوە. لە تەمەنێکی گەورەیدا دەسەڵاتی خۆی بەهێزە دەکات و هەوڵی ئەوە دەدات کە هەموو ئازەربایجان داگیر بکات، هەموو پیاوەکانی سوپاکەی کوردبوون. ئەو سکەیەی کە لە ساڵی 953/952 لێدراوە، ئەوە نیشان دەدات کە دایسام خاوەنی دەسەڵاتێکی بەهێز و پیاوێکی بەناوبانگ بووە لەو ساڵانەدا. ئەو لەلایەن دوژمنەکانیەوە لە ساڵی 958/957 کوژراوە.

سکەیەکی تری کوردی کە لە گۆتلاند دۆزراوەتەوە ساڵی 1915، لە شاری ئەردەبیل لێدراوە، ئەردەبیل و شاری (*Berdaa*) کەوتوونەتە ئەو ناوچەیەوە کە شازادەی کورد دایسام حوکمڕانی تێدا کردووە. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە دایسام دەسەڵاتێکی تەواوی کاتی بەسەر هەردوو شاری ئەردەبیل و (*Berdaa*) هەبووە. هەردوو شارەکە کەوتبوونە لای خۆرهەڵاتی کەناری دەریای خەزەرەوە. ئەم سکانە وەکو سکەی کوردی تۆمارکراوون لەو کەتەلۆگە سویدیانەی بۆ سکەی ڕۆژهەڵاتی دروستکراون کە لەناو خاکی سویدیدا دۆزراونەتەوە. تێیدا ساڵی دروستکردن و شوێنی دروستکردن و بەناوی کێوە دروستکراون دەستنیشان کراون بۆ نموونە:

*Kurdish, 341: 952/953, Erdebil, Daysam ibn Ibrahim.*

ئەو سکانە دە ساڵ دوای داگیرکردنی شاری (*Berdaa*) لێدراون واتە لە ساڵی 953/952. ڕەنگە لەلایەن ئەو ڤیکینگانەوە هێنرابێت کە لە هێرشەکانی دوایدا بەشداریان کردبێت؟ سەد ساڵ دوای داگیرکردنی شارەکە ڤیکینگەکان دوو هێرشی تریشیان کردووە واتە ساڵی 1030–1033 و 1041، بۆ سەر ئەو ناوچەیەی کە پێی وتراوە سێرکلاند، هەندێك لە ڤیکینگەکان لەلای ئەمیر دەربەند کاریان پێدرا ساڵی 987. ئەو سکە کوردیەی کە لە گۆتلاند لە ناوچەی (ئێگنس بارلینگبرو) لە ساڵی 1915 دۆزراوەتەوە، پەیوەندیان هەیە لەگەڵ هێرشەکانی دواتری ڤیکینگەکان. یەکێك لەو هێرشە بەناوبانگانەی کە ڤیکینگەکان کردیانە سەر سێرکلاند بە سەرۆکایەتی سەرۆك عەشیرە (*den vittefarne Ingvar*) بوو کە بە موسیبەت کۆتایهات بۆیان ساڵی 1041. (*T. J Arne*) دەگێڕێتەوە: نزیکەی سەد ساڵ دوای داگیرکردنی شاری (*Berdaa*)، جارێکی تر ڤیکینگەکان سەردانی ناوچەکە دەکەنەوە، ئەم جارەیان وەکو دزیی دەریایی، کە لەسەر 20 بەرد زانیاری لەسەر سەرکردەکەیان نووسراوە، ئینگڤار کە کەسێکی بەرجەستەی سۆرملێنینگی بوو. بەداخەوە لەسەر هێرشەکانی پێشوو هیچ زانیاریەکمان لەبەردەستدا نییە.

هەموو عالمەکان لەسەر ئەوە کۆتن کە هەموو ئەو سکانەی کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوینەوە لەلایەن ڤیکینگەکانەوە هێنراون بۆ سوید بە ڕێگای ڕووسیای گەورەدا هاتوون و ماوەیەکی کەم دوای هێنانیان خراونەتە ژێر گڵەوە.

### ڤێرینگەکان لە کوردستان

لەسەرچاوە مێژوویەکاندا هاتووە کە ئەو ڤیکینگانەی کە لە بیزەنت (پێشیان ووتون ڤێرینگەر) خزمەتیان کردووە، لەناو کوردستان خۆشیدا پەیوەندیان لەگەڵ کورد دامەزراندووە. ئەو کەسانە ئەوانە بوون کە سەفەریان دەکرد بۆ کۆنستەنتینپۆل و وەك پاسەوان خزمەتیان دەکرد. لەو کارانەی کە ئەوان پێیان دەسپێردرا پارێزگاریی قەیسەر بوو، گەلێك جاریش لە شەڕەکاندا بەشداریان دەکرد بە دژی موسڵمانەکان لە کاتی شەر لە کوردستاندا. ئەو سکانەی کە لە سەردەمی مەروانیەکاندا لێدرابوون و لە ژێر زەویی سویددا دۆزراونەتەوە، گەواهی ئەوەمان بۆ دەدەن کە ئەو کەسانەی کە لە خزمەتی بێزەنتینەکاندا بوون، هەندێك پەیوەندیان لەگەڵ مەروانیەکاندا کە کورد بوون، پەیداکردبوو. بنکەکەی دیناستیەکە لە باکووری کوردستاندا بوو.

قەیسەری بێزەنتینی (*Basileios II*) گاردێکی پاسەوانی دامەزراند لە کۆتایی ساڵی 900دا کە تەنها لە ڤێرینگەکان پێکدەهات کە خەڵکی وڵاتە جۆراوجۆرەکانی سکەندەناڤیا بوو. ئەم گاردە هەتا سەرەتای ساڵی 1200یش هەر مابوو. دامەزرێنەری ئەم گاردە واتە (*Basileios II*) ئارەزوویەکی زۆری بۆ شەڕ و سیاسەت بوو. ئیمپراتۆری بێزەنتیەکان پەلوپۆی تا قەفقاسیا و دەوروبەری دیجلە و فورات هاویشتبوو. دەسەڵاتداریێتی (*Basileios II*) درێژترین دەسەلات بوو لە مێژووی بێزەنتینیەکاندا کە لە 976 تا 1025ی خایاند.

لەبەینی ساڵی 900 تا 1000 بێزەنتینی و خەلافەتیش بەسەر پارێزگای بچووك بچووکدا دابەشکرابوون. یەکێك لە دیناستیە کوردەکان مەروانیەکان بوون کە کەوتبوونە بەینی بێزەنتینی و

خەلافەتەوە. لە سنوری ڕۆژهەلاتی بێزەنتین شەڕ بە بەردەوامی لە ئارادا بوو. یەکێك لەو شارانەی کە زیانی زۆری لێ کەوتبوو لەو سالانەدا، پایتەختی مەروانیەکان، مایافارقین بوو. بە یۆنانی بە مایفارقینیان دەوت ماتیریۆپۆلیس، پێناسەیە بۆ ڕابردووی تراژیدیای ئەو شارە. هەمانکات لەلایەن ئیمپراتۆریای ڕۆمەکانیشەوە شاری مایافارقین وەك جبەخانەیەك بەکاردەهێنرا بۆ ئەوەی بەرگری لە سنووری ڕۆژهەلاتی خۆیانی پێ بکەن.

جبەخانەیەکی زۆر لەو شارەدا هەیە.لەسەردەمی بێزەنتینیەکاندا گەلێك کاری وەحشیانەیان لە دژی کوردەکان کردووە. بێزەنتینیەکان و سیاسەتە داگیرکاریەکانیان ڕووەو ڕۆژهەلات بووە هۆی لەناوبردنی گەلێك مرۆڤ.

پێش ئەوەی باسی سکە کوردییەکان بکەین کە لەسەردەمی ڤیکینگەکاندا هێنراوون بۆ سوید، چاك وایە لێرەدا پشوویەك بدەین و بە کورتی باسی پەیوەندیە جۆراوجۆرەکانی کورد و پێزەنتینیەکان بکەین. دەولەتی مەروانیەکان کە لە سەردەمی ڤیکینگەکاندا دامەزرا (990–1096)، شارەکانی مایفارقین و جزیر و نسێبین و ئامەدی دەگرتەخۆی. پایتەختەکەیان شاری مایفارقین (مارتلۆپۆلیس، فارکین، سیلڤان). دەولەتی مەروانیەکان بەرەو باکوور تا پارێزگاکانی بتلیس و مانزکیرت پەلی هاویشتبوو. لەمەڕ پەیوەندی نێوان کورد و بێزەنتینیەکان لە سەردەمی (*Basileios II*)دا گەلێك زانیاریی بەنرخمان لە کتێبەکەی ئیبنول ئەزرەك دەستدەکەوێت کە لەسەر دەولەتی مەروانیەکان نووسیویەتی.

لەو سەردەمانەدا هەندێك ناوچەی کوردستان کرابووە ناوچەی دیاریکراوی نێوان خەلافەت و بێزەنتینیەکان. سوپای بێزەنتینیەکان گەلێك جار سنورەکانی دەولەتی مەروانیەکانی دەبەزاند، سالی 993 شەڕێکی بەرجەستە قەوما. دوای شەڕێکی قورس کوردەکان بەسەرکردایەتی ئەمیر ئەبوعەلی ئەلحەسەنی بن مەروان سەرکەوتنیان بەدەستهێناو دوای تێکشکانی بێزەنتینیەکان، هەردوو لایەنی شەڕکەر پەیمانێکی ئاشتییان مۆرکرد.

لەگەلێك لاوە، ئیمپراتۆریای ڕۆژهەلاتی ڕۆم هێرشی کرایەسەر، لە ماوەی سالانی 1000دا. سالی 999، (*Basileios II*) بە خۆی و سوپاکەیەوە هێرشی کردە سەر خەلیفەی میسر کە خەریك بووە شاری حەلەبی داگیردەکرد. دواتر بە خۆی و سوپاکەیەوە بەرەو جۆرجیا کشان تا بەرژەوەندیەکانی خۆی لەو ناوچەیەدا بپارێزێ. لە ماوەی سەفەرەکەیدا سالی 1000 سەردانی ناوچەی مەروانەیەکانی کرد و لەلایەن ئەمیری کورد ئەبو مەنسور سەعید ئیبن مەروانەوە پێشوازیەکی شایستەی لێ کراو گەلێك دیاریشی پێ بەخشی. لە ماوەی سالی 1001دا لە ناوچەکانی ئارارات مایەوە، پاش دوو سال دووربوون لە کۆستەنتینپۆل بە خۆی و پاسەوانە سکەندەناڤێکانیەوە گەڕایەوە بۆ ئەوێ. *H. R. Ellis Davidson* کە لێکۆلینەوەی لەسەر پەیوەندی بێزەنتینی و پاسەوانە سکەندەناڤیەکان کردووە دەگێرێتەوە کە ڤێرینگەکان (پاسەوانەکان) واتە (*varjager, varangin*) لەگەل (*Basileios II*)دا بوون، لە کاتی حەرەکەت کردنیان لە دیاربەکرەوە بەرەو جۆرجیا سالی 1000، (*All this time Vagrangians were with him*)[68]. ئەم پاسەوانانە لە هەموو هێرشەکانی (*Basileios II*) بۆ سەر ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەشداریيان کردووە. بە ئیحتیمالێکی زۆر، ئەم پاسەوانە سکەندەناڤیانە کە پارێزگاریان لە قەیسەر کردووە یاخود وەکو

بەکرێگیراو (جاش) لەو سوپای بێزەنتینیەکاندا خزمەتیان کردووە، لەو ناوچانەدا بە کورد گەیشتوون.

زۆربەی زۆری سکە کوردیەکانی سەردەمی مەروانیەکان کە لەسەردەمی ڤیکینگەکاندا هێنراون بۆ گۆتلاند لەو ساڵانەدا لە شاری مایفارکین لێدراون، کاتێک کە (*Basileios II*) سەردانی کوردستانی کردووە دروست 1000 ساڵ لەمەوپێش. ئەم ڕۆژە مێژووییە گرنگیەکی زۆری هەیە لە پەیوەندی لەگەڵ پەیوەندیەکانی کورد و بێزەنتی و کورد و باکوور (سکەندەناڤیا)دا. بێزەنتینیەکان گەلێک پەیوەندی جۆراوجۆری دیپلۆماتیان لەگەڵ دیناستی مەروانیەکاندا بەستووە. ئەم پەیوەندیانە کە ماوەیەکی زۆر درێژەیان هەبووە، لە شێوەی دانوساندن و پەیمانی ئاشتی و ناردنی نوێنەر و نامە گۆڕینەوە و ناردنی دیاری، کراوون. کاتێک ئەمیری کورد (نەسرودەولە) دەسەڵاتی گرتە دەست ساڵی 1011، قەیسەری بێزەنتی نوێنەری خۆی نارد بۆ پیرۆزبایی کردن لێی. هەمانکات ئەمیری کورد گەلێک دیاریی وەکو ئەسپ و حوشتر و دیاریی گرانبەهای تری پێگەیشت کە لە لایەن قەیسەرەوە نێردرابوون.

کاتێک ساڵی (1021)، (*Basileios II*) شەڕی خۆی لەگەڵ جۆرجیادا دەستپێکرد لە نزیک شاری ئەرزرۆم (*Theodosioupolis*)، بازووی دەسەڵاتی خۆی نیشاندا لە ناوچەکەدا، دانوساندنەکان لەگەڵ نوێنەری بێزەنتەکان بەردەوام بوو لە شاری ئەرزرۆم کە دەکەوێتە کوردستانی ئێستاوە. ژمارەیەکی زۆر (جۆرجی) کە بە هۆی نائارامی ولاتی خۆیانەوە ڕایاندەکرد، پەنایان هینابووە بەر دەوڵەتی مەروانی. بە کورتی دەتوانین ئەوە بڵێین کە دەبێت ئەو پاسەوانانەی (ڤیکینگەکانی سکەندەناڤیا) کە لە سوپای بێزەنتدا خزمەتیان دەکرد وەکو بەکرێگیراو، بە گەلێك شێوە پەیوەندیان لەگەڵ کورددا گرتبێت، لە کاتی هێرشەکانیان بۆ سەر ڕۆژهەلات.

## دوای پەیوەندی لەگەڵ ڤیکینگەکاندا

هەروەها دەبێت کورد و ڤیکینگەکان ساڵی 1071 لە شاری (*Manzikert*) یەکتریان بینیبێ، لە کاتی شەڕی نێوان بیزەنت و سەلجوقیەکاندا. یەکێك لە تێکشکانە هەرە بەرچاوەکانی بیزەنتیەکان لە ساڵی 1071 دا ڕوویدا لە نزیک شاری (*Manziket*) کە دەکەوێتە کوردستانەوە. ئەم شارە لەلایەن کوردەکانەوە پێی دەوترێت مالازگرد. لەم شەڕەدا کە *Romanos IV Diogenes* خۆی سەرپەرشتی دەکرد بە دژی سەلجوقیەکان، تێکشکانێکی گەورە بوو هەم بۆ خۆی و هەمیش بۆ بەکرێگیراوەکانی، ڤێرینگەکان. کوردەکان کە کەوتبوونە بەینی شەرەکەوە ناچاربوون لەگەڵ هەردوولادا هاوپەیمانی ببەستن. مێژوونوسی میسری *Ruvadari* دەڵێت بە تەنیا لە جەبهەی سەلجوقیەکاندا دەیان هەزار کورد بەشداری شەرەکەیان کرد. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ڤێرینگەکان و بەکرێگیراوە کوردەکان لەم شەڕەدا لە دژی یەکتر جەنگاون لە شاری مانزیکێرت ساڵی 1071، لەم شەڕەدا نزیکەی هەموو ڤێرینگەکان کە شوێن قەیسەر کەوتبوون کوژران:

لەم شەڕەدا کە دوای چوار مانگ لە تێکشکاندنەکەی خوارووی ئیتاليا، کە دەبێت کۆمەڵێك ڤێرینگەر تێدا کوژرابن، لێرەدا پرسیار ئەوەیە کە ئاخۆ بە کرێگیراوە باکووریەکانی ناو پێزەنتینیەکان هیچ کاتێک توانیبێتیان خۆیان

بگەییەننە ناو سوپا کۆنەکەیان لە دوای شەڕەکەی *Manzikert*.

هەندێك لێکۆڵەرەوە بەشێك لەو بەردانەی کە هەڵکۆڵراون بەو شەڕە دژوار و تراژدییایەوە کە بەسەر هەردوو لادا هات، گرێدەدەن، کە لە شاری *Manzikert* ڕووی دا لە ساڵی 1071دا. ئەو بەردانەی کە لە سوید دۆزراونەتەوە تەعبیر لەوانە دەکەن کە لە شەڕەکانی ڕۆژهەڵاتدا گیانیان لە دەست داوە، بۆ نموونە نووسراوە "ئەو لە شەڕی یۆنانیەکاندا مرد" یان "لە یۆنان سەری نایەوە". لە نووسینی سەر بەردەکاندا، ئیمپراتۆریایی بێزەنتی بە یۆنان ناوزەد کراوە. ماتس گ. لارشۆن دەڵێت:

...کەئیحتیمالەن تەنها ناوی ئەو سویدیانەی کە تێکشکان بوون، لەسەر ئەو بەردانە هەڵکۆڵرابن، کە هی ساڵی (1000)ن، تەنها ئەوەندە دەڵێن کە لە یۆنان سەریان تیاچووە یان مردوون، هەروەك بۆ نموونە کوڕەکانی ئینگە کە خەڵکی هانستای نزیك ستۆکهۆڵم بووە.

*T. J. Arne* لە یەکێك لە وتارەکانی خۆیدا باسی ئەوە دەکات، کە ئیحتیمالەن تورك و سویدیەکانیش بۆ یەکەم جار لە شاری (*Manziker*) بەیەکگەیشتبن.

دوای تێکشکانەکەی *Manziker*، ژمارەی پاسەوانە ڤێرینگەکان لە کۆنستەنتینپۆڵ بە شێوەیەکی بەرچاو لەکەم بوونەوەدا بوو. سەردەمی ڤیکینگەکان کە نزیکەی 300 ساڵی خایاند، لەو ساڵانەدا، دوا ساتەکانی تەمەنی خۆی دەژمارد.

## تێبینی

فۆرمێکی درێژتری ئەم وتارە لە کتێبی "پەیوەندی کورد و سوێدی لە ماوەی هەزار ساڵدا بە سویدی "*Svensk-kurdiska kontakter under tusen ar*" هەیە کە لە ساڵی 2000 لەلایەن چاپخانەی *APEC* وە بڵاوکراوەتەوە.

# شەخسی و تاکەکەسی

لیوناردۆ مایکڵز
لە فارسییەوە: شەیدا سەلاح

بە داخەوە ئەو شتەی دەمەوێت باسی بکەم کەمێك دووبارەی هەمان شتە کە ئەمڕۆ بەیانییەکەی بیستووتانە. پێویستە ئەمەش بڵێم کە بیستنی ئەو شتەی وترا تا ڕادەیەك بێ تاقەتی کردم چونکە بە جۆرێك لەو شتە دەچوو کە پێویستە بیڵێم و هەروەها لەبەرئەوەیش کە زۆر جوان بوو. بەهەرحاڵ دەمەوێت لێرەوە دەست پێبکەم کە ناوی ئەم وتارە کورتە شەخسی و تاکەکەسییە.

بەپێی بنەما هیچ شتێك نابێ سادەتر لە دوان سەبارەت بەو شێوازانە بێت کە من بە سوود وەرگرتن لێیانەوە دەربارەی خۆم دەنووسم، بەلاّم پەیم بەوە بردووە کە هەرگیز ئەمە سادە نییە. لە ڕاستیدا بەر لە هەر شتێك دەمەوێت بڵێم کە یەکێك لە گرفتە گەورەکانم، کاتێ دەربارەی خۆم دەنووسم، ئەمەیە کە چۆن تەنها وتەنها لەو باسەی خۆمەوە نەنووسم. من بۆ خۆم وا بیر دەکەمەوە کە ئەم گرفتە لە نێوان نووسەرەکاندا زۆر باوە. هەرچەند خۆیان لەوە بێ ئاگابن، چەمکە ڕەگەزە سەرەکییەکانی نووسین — شێواز، ڕێزمان، مۆسیقا، دیمەنە خەیاڵییەکان و ئەو نموونە وەزنیانەن کە ڕستەکانتان دروست دەکەن — لە بارەتانەوە شتی زۆر دەڵێن (چ ئێوە لێی بە ئاگابن و چ نەشبن)، بەم شێوەیە دەشێ ئێوە تەنانەت بەر لەوەی بزانن کە دەتانەوێت دەربارەی خۆتان بنووسن، دەربارەی خۆتان دەنووسن، ئەم ڕەگەزە سەرەکیانە، بە چاوپۆشین لە بابەتەکەتان هەر بە هەمان ڕادە ڕۆڵیان لە نووسینەکەتاندا هەیە کە تایبەتمەندییە بێشومارەکانی زەین هەیانە و دەبنە هۆی ئەوەی خوێنەر بە ڕوونی هەست بە بوونتان بکات وەك ئەوەی دەستنووسەکەتانی لەبەردەستا بێت، دەکرێت بوترێت کە هەرکات دەنووسن بەر لەوەی ژێر نووسینەکە ئیمزا بکەن ناوی خۆتان نووسیبێ.

سپینۆزا کتێبی (ئاکارەکان)ی بە زمانی لاتین نووسی، زمانێك کە چیتر کەمێك قسەی پێ نەدەکردو لە نووسینیدا بۆ بەڵگاندنی سوودی لە شێوازێکی زۆر لۆجیکیانە وەرگرت. دواشت کە ئەو دەیویست هەستکردن بوو بە ئامادەگی خۆی، یان

دەربارەی خۆی بنووسێت. شێوازی ئەو لە نووسینی کتێبی ئاکارەکاندا وەکو شیوازی ژیانی وا بوو، سووربوون لەسەر ئەوەی گومناو بمێنێتەوە، سەر سەخت بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت لە نێو کۆمەڵدا پێناسە شەخسیەکەی ئاشکرا نەبێت. بەم شێوەیە پاکژی ناشەخسی ئاکار جگە لە دەربڕینی خود شتێکی تر نەبوو، ئەو کتێبە لە درێژەی ژیانیدا بڵاو نەبووەوە، هۆکارەکەشی تاڕادەیەك لەبەرئەوەی بوو کە دەزانرا کتێبی ئەوە. ئەو لە گومناوبوونیدا لە ڕادەبەدەر ناسراو بوو.

شکسپیر لە هیچ کام لەنووسینەکانیدا بە شێوەیەکی شەخسی ناناسرێت، لەگەڵ ئەمەشدا هەمووما‌ن بە گشتی ئەمەیمان قبوڵە کە ئێمە ئەو شتە دەناسین کە خودی شکسپیر نووسیوویەتی یان ئەو شتەی کە تەنها دەکرێت کاری ئەو بێت. سۆناتەکانی کە لە ڕیزی شەخسیترین هۆنراوەگەلێکن کە تا ئێستا نووسراوە.. لە بەکارهێنانی چوارینەکان، دوو بەیتی و جیناس و هاودژەکان بونیادێکی بەرچاویان هەیە. بونیادگەلێك کە بە شێوەیەکی ئاشکرا ناشەخسین. ئەم مەسەلەیە پەیوەندییەکی سەیری لەگەڵ ئەمەدا هەیە کە شکسپیر لە ئیمزا جۆراوجۆرەکانی هیچ کات ناوی خۆی دووجار وەکو یەك نەنووسیووە، وەکو بڵێیت وا بیری دەکردەوە کە شوناسە شەخسییەکەی بە هیچ شێوەیەکی تایبەتی پەیوەندی بە سپێڵی ناوەکەیەوە نییە. شێوەیەکی تایبەت و هەمیشە وەکویەك، تەنها دەیتوانی تاکایەتی بێت.

مۆنتنی سەبارەت بە نامەکانی وتوویەتی: "زیاتر لەوەی ئەم کتێبە منی خولقاندبێت، من ئەمخولقاندووە". وا بیر دەکەمەوە مەبەستی ئەمە بووە کە نووسینەکانی ئەویان بۆ خودی خۆی ئاشکرا کردووە و ئەم ئاشکراکردنانە هەمیشە بە هووشیارییەوە هەڵنەبژێردراون. لەوە دەچێت ئەو لە بابەتەکانیدا زۆر جار بێ ئەوەی مەبەستی بێت خۆی دەدۆزێتەوە، هەرچەند دەڵێت کە نامەکانی بۆ بنەماڵەکەی نووسیووە تا یارمەتییان بدات کە ئەو لە ژیاندا چۆن بووە، وا یادی بکەنەوە گشت ئەمانە بەڵگەی ئەوەن کە بنەمای شوناسی شەخسی ئێوە، بە ڕەزامەندی یان بێ ڕەزامەندی خۆتان لە نووسینەکانتاندا ئاشکرا دەبن، وەکو شوێن پەنجە. یان تەنانەت وەکو شتێکی شەخسی تر و دیارتر وەکو سیمای دەموچاو بەپێی وتەی پسپۆران، هەشتا بەش لە روخساری مرۆڤدا هەیە کە دەتوانێ بۆ دیاریکردنی شوناسی تاکە کەس سوودی لێوەربگیردرێت.

سالأنێك لەمەوبەر لە شەوێکی باراناویدا من و یەکێك لە هاوڕیکانم چووینە یانەی مۆسیقای جاز لە بیسین ستریت لە گرینڤیچ ویلچدا، تاکو گوێ لە (کوارنتی لە مایلز دیڤیس) بگرین. ئامادەبووان ژمارەیان کەم و شارەزا بوون. مرۆڤ تێدەگەیشت لەوەی ئامادەبووەکان شارەزان چونکە لە شوێنی دروستدا و لە جێی خۆیدا چەپیان بۆ مۆسیقا ژنەکانیان لێدەدا. مایلزدیڤیس هەر جارێ کە بە تەنها مۆسیقاکەی دەژەند لە ساتێکی تایبەتیدا پشتی لە دانیشتوان دەکرد. نازانم بیری لە چی دەکردەوە کە وایدەکرد، بەڵام کاریگەری کارەکەی لەوەدابوو خۆی لە ئاهەنگەکەدا نەبوو، وەکو بڵێیت: "سەیرم مەکەن، من لێرە نیم. گوێ لە مۆسیقا بگرن". ئەو وانەیەی فێری کردین چێژ وەرگرتن بوو لە مۆسیقا یان چێژ وەرگرتن لە هەموو هونەرێك، وەختێ دیڤیس پشتی لە ئامادەبوان بوو دەتوت مۆسیقا شەخسی تر خۆی دەنواند.

یەکێك لە مامۆستاکانی ماتماتیکی زانکۆی بركلی بۆی باسکردم کە وەختێ لە رۆژنامەدا بابەتێکی سەبارەت بەو کەسەی زنجیرە تەقینەوەکانی زانکۆکانی[1] ئەنجامداوە خوێندوەتەوە لە ناکاو تێگەیشتووە کە ئەو کەسە خوێندکاری خۆی بووە. پاشان ئەو مامۆستایە لای فایل و لاپەڕەی تاقیکردنەوەکانی ماتماتیکی ئەو پیاوەی دۆزیەوە و پێیداچوەوە، وتی: "پانزە — شانزە" ماتماتیکیش بتوانێ یەکێك بێت لە ڕێگاکانی دەربڕین و ئاشکراکردنی خود. یەکێك لەو ڕێگایانەی کە هەمیشە بەکاریدێنین بەلام تەنانەت ئەو تاکە کەسە بە زمانێکی زۆر پووچەڵی فرموولەکان شوناسی خۆی راگەیاندبوو. لە ڕوانگەی ماتماتیکزانێکەوە، 15–16 هەمان ئەو پیاوە بوو. من بۆ خۆم وا بیر دەکەمەوە هەر جار کە دەنووسین، کەم تا زۆر، ناو لە خۆمان دەنێین، هەمیشەیش ئارەزوومان هەیە کە سەبارەت بە خۆمان بنووسین. وەختێ خەڵك لێتان دەپرسن کە بە دەست دەنووسن یان تایپ دەکەن، مەبەستیانە بزانن نووسینەکانتان تا چ رادەیەك شەخسییە. بەلام تەنانەت ئێستاش، لە سەردەمی نووسینی ئەلکترونیدا کە ئیتر پەی بردن بە نهێنیەکانی دەستنووس بە دەگمەن دەبینرێت.

پاشماوەی ئەلکترۆنی تارمایی ئامێزی تاکە کەسەکان کە هێشتا لە وشەی بونیادی رستەکانیاندا ماوەتەوە، کەم تا زۆر قابیلی دۆزینەوەیە، نموونەی ناسراوتری ئەو شتەی دەمەوێت بیڵێم تەلەفوونە. وا بیری لێبکەنەوە کە گوشی تەلەفوونەکەتان هەڵگرتووە و دەنگێك دەبیستن کە ساڵەهایە نەتانبیستووە، دەنگێك کە تەنها ناوتان دەڵێت یان هەر ئەوەندە دەڵێت: (ئەلو)و ئێوە خێرا وەڵام دەدەنەوە: "پووره مولی، ماوەیەکی زۆرە تەلەفوونتان نەکردووە"

تەنزێك هەیە پەیوەندی بەم ئەزموونەوەیە: زەنگی تەلەفوون لێدەدا. مولی لە پشتی هێڵی تەلەفوونەوە دەڵێت: "ئەلو" دەنگی پیاوێك دێت کە وەڵام دەداتەوە "مولی ناسیمیتەوە، دەزانم چیت دەوێت. ئێستا دێم و لەوێ وا دەکەم و وا دەکەم". مولی دەڵێت: "گشت ئەمانەت بە ئەلویەك زانی؟"

لە جۆرێکی تری دۆزینەوەی شەخسی، تابلۆیەك دەبینن کە هەرگیز نەتانبینیووە و دەڵێن: "ئەمە کاری هۆکۆسایییە" یان "گرچینو" یان "کراناچ". بە وتنی ئەو ناوانە ئێوە خەریکن ئەمە رادەگەیەنن کە بوونێکی تاك یان بوونی کەسێکتان دۆزیوەتەوە. بوونی هەر بوونەوەرێکی مرۆڤی یان بوونی تاکە کەسێك ئارەزوومەنەوە خۆی رابگەیەنێت، ئەویش بە ناوێك، ئەمە بۆ پووره مولی نەناسراو و گومناو رێك وەکو ئەو شێوەیە راستە کە بۆ (هۆکۆسایی) بەناوبانگ و بە توانا راستە. داوا لە مرۆ کرا تاکو ناو لە ئاژەڵان دابنێت. بەلام ئەگەر ناوی ئەوان لەپێشدا یان بە ئاماژە لە بوونی تاکەکەسیی ئەواندا نەبووایە، ئەو چۆن چۆنی دەیتوانی ئەو کارە بکات "دیارە کە ئەم ئاژەڵە شێرەو ئەم دانەیەش تەنها دەتوانێ بەراز بێت" تا ئەو رادەیەی کە ئێمە دەزانین بابەتەکە سەبارەت بە ئاژەڵان زیاتر تاکە کەسییە تاکو شەخسی. ئەگەر ئاژەڵ بیتوانیبایە ناوی خۆی حینجە بکات هەمیشە بەیەك شێوە دابەشیدەکرد. دەیوت، کە پێ بەپێی ناوەکە دەجووڵایەوە.

شێواز، رێزمان، دیمەنی خەیاڵ، تۆنی دەنگی تاکە کەس لە تەلەفون، شێوەی ئاژەڵێك و.. ئەگەر شتێك خاوەنی هەر جۆرە بوونێکی هەستی بێت، ناوێك رادەگەیەنرێت، ئەم هەقیقەتە تەنانەت ئەگەر

دیاری نەکرێت. تەنها خودایە کە دەتوانێ بڵێت: "من ئەوەم کە هەم" و بێ ناو بمێنێتەوە و تەنها بەشێوەیەکی نێگەتیڤ وەدەست بێت. هەر بەو شێوەیەی کە سپینۆزا دەڵێت مادە تەنها لە خۆی و لە ڕێی خۆیەوە بەزەیفدا ختووره دەکات، واتە تەنها بە واژەکانی خۆی. بەلاّم سەبارەت بە ئێمەی مرۆڤ یان هەر بوونەوەرێکی تاکە کەسی تر، ئێمە لە نێوان حاڵەتەکانی مادەین و لە ئەنجامدا "لەگەڵ دارو بەردەکان لە خولی شەووڕۆژی زەویدا بە دەوری یەکتریدا دەسووڕێنەوە" ئەم رستە پڕ لە خەمە لە شیعری (ورد زورس)ە کە زۆر زۆر شەخسیە و ناوی "خەو خۆشەویستی بە گیانمدا"، سەبارەت بە ژنێك کە ئەسڵەن ناوی نایەت. لە راستیدا ئەو شتەی ئەم شیعرە و لەبندەرکێشانی دەروونیەکەی وا لێدەکات کە فەراموش نەکرێت ئەمەیە کە بە تەواوی دەربارەی خودی (ورد زورس)ە. ئێمە بمانەوێت و نەمانەوێت، ناوین. ناوهێنان لە هێنری چوارەم یان جۆن سمیسی پێنجەم، وتنی ناوێکە کە بە پێشکەوتوترە لەو بوونەوەرەی کە تێدا ناوەکەی دەهێنین — چوارەمین هێنری، سێیەمین جۆن سمیس.

لەو چیرۆکەدا کە ماوەیەك لەمەوبەر نووسیم بەشێك لە بابەتی یەکێك لە خوێندکارانی قۆناغی یەکەمم هێنابووەوە کە لە پۆلدا پێشکەشکرابوو. ئەو خوێندکارە نووسیبووی: "کارل مارکس، لەوێوەی کە ئەم ناوە، ناوی ئەو بوو.." وەکو ئەوەی کە باوکی مارکس بە ژنەکەی وتبێتی: "من بڕیارم داوە ناوی کوڕەکەمان بنێم کارل". و هاوسەرەکەی وتبێتی: "نا، نا، هەر ناوێك دادەنێی داینێ بەلاّم کارل دامەنێ". و باوك وەلاّمی دابێتەوە: "بەداخەوە چارنییە، لەبەرئەوەی ئەم ناوە، ناوی ئەوە".

لەبەر هۆکارگەلێك کە زۆر سەریان لێ دەرناکەم، هەرچەند دەشێ بۆ هەر کەسێکی دی تا ئەم رادەیە ئاشکرا بێ، هەمیشە نووسین سەبارەت بە خۆم لە نووسین سەبارەت بە هەرشتێکی دی گرانتر بووە. ئەو شتەی لێی دڵنیام ئەوەیە کە نووسین سەبارەت بە خۆم هەمیشە پەیوەستی بەوەیە کە دەربارەی کەسانی دی بنووسم و ئەم ئەگەرەش لە ئارادایە کە تەنانەت وەختێ نییەت و خواستم پاك بێت و هیچ مەبەستێکی تری تێدا نەبێ، کەسێك وەڕز یان شەرمەزار بکات.

یەکێك لە زیرەکترین و خۆشەویسترین خوێندکارەکانم ناوی (کانتربری) بوو. ئەو داوای لێکردم ببمە مامۆستای ڕێنماکەری کۆتایی نامەکەی پێم وت کە بیرۆکەیەکی باش نییە و، پێویستە ئەو داوا لە یەکێك لە هاوکارەکانم کە وەکو پسپۆڕ و ڕەخنەگر بەناوبانگە و خاوەنی دەسەلاّتیشە و دەتوانێ لە دۆزینەوەی کاردا یارمەتی بدات داوا بکات تاکو کارەکەی بۆ ئەنجام بدات. بەلاّم (کانتربری) دەیویست من ڕێنماکەری بم. لە کۆتاییدا قبوڵم کرد. (کانتربری) گەلاّڵەیەکی گشتی زۆر باشی نووسی و پاشان بەشێوەیەکی زۆر سەیر متمانەی بەرامبەر بە دیمەنی نووسینەکە لە ئایندەدا نەما.

پاش دەرچوونی لە زانکۆ چوو بۆ ڤیرجینیای خۆرئاوا (کە ولاّتی دایکی بوو) لەوێدا لە بواری سیاسەتدا ناوێکی وەدەست هێنا. وەکو ئەوە بوو کە ئەویش وەکو (مایلز دیڤیس) پشتی لە جەماوەر کردبێت و هەڵبەتە من جەماوەرەکەی بووم. بەڕای من دەبوایە (کانتربری) لە جیاوازی تاکەکەسی خۆی رزگاری ببوایە تا بە جیاوازی شەخسی بگات. بەر لەوەی بچێتە ڤیرجینیای خۆرئاوایی داوام لێکرد کە ئەگەر دەکرێت جۆرێکی تایبەت لە کەرەستەی کۆن

کە بەدەست دروست کرابێت بۆم بدۆزێتەوە و هەر کات هاتەوە بۆ کالیفۆرنیا بۆم بێنێت. ئەمە هەمان ئامرازە کە لە ڕۆمانی (کە گیانم دەدا) بۆ دروستکردنی تابووت بەکار دەهات. زۆر سوپاسم کرد. شتێك لە پەیوەندی کۆنی مامۆستا و خوێندکار لە نێوماندا نەمابووەوە. ئێمە ئیتر هاوڕێی نزیکی یەکتری بووین.

کاتێ ڕۆمانی (ياریگای پیاوانەم) دەنووسی، وا بیرم کردەوە کە ناوی کانتربری بۆ یەکێك لە کەسێتیەکانی ڕۆمانەکەم ناوێکی گونجاوە. ئەو کەسایەتییە هیچ لە کانتربری راستی نەدەچوو و تایبەتمەندییە ئاکارییەکانیان لە یەك جیاواز بوو، بەڵام کانتربری ڕاستەقینە تووشی شۆك بوو بوو. چۆن توانیم کارێکی وا بکەم. ئەو پێی وتم: "کەواتە تۆ دەربارەم وا بیر دەکەیتەوە".

ئەو زۆر جار بیری دەخستمەوە کە چیم لێکردووە.

نەمدەتوانی پێی بڵێم کە خەریکە گاڵتە دەکات یان بە جیددی دەیڵێت. بە شێوەیەکی گشتی وەختێ دەربارەی خۆم دەنووسم ناوی ئەو کەسانەی کە دەربارەیان دەدوێم دەگۆڕم و هیچ کاتێ سوود لە ناوەڕاستیەکەیان وەرناگرم. هەندێ جار وەختێ دەمەوێت شتێك بڵێم کە بێ زیانە یان پڕ سۆزە، بۆ سوود وەرگرتن لە ناو یان مۆڵەتیان لێوەردەگرم. یەکێك لە هاوڕێ نووسەرەکانم کە ئەویش خوێندکاری پێشوومە تێگەیشت وەختێ خەریکە سەبارەت بە خۆی دەنووسێ بەشێوەیەکی پڕ نهێنی ناتوانێ سوود لە ناوەڕاستیەکان وەرگرێت، هەرچەند ئەم کارە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر چۆنیەتی یان فرۆشتنی کتێبەکەی نەبوو. ئەم خانمە تەنها نەیدەتوانی خۆی بەوە قایل بکات کە ناوەکان بگۆڕێت. بەرئەنجامەکەشی بوو بەمەی

کە خەڵکانی دەوروبەری لێی زیزبوون و پەیوەندییە خێزانییەکانی بەشێوەیەك تووشی زیان بوو کە جێی قەرەبوو کردنەوە نەبوو. زۆر سامناکە کە مرۆڤ ناوی خۆی بە چاپکراوی ببینێت. بۆ هەندێکمان ئەو کارە ناخۆشە و زیزمان دەکات وەختێ وێنەمان بە چاپکراویی دەبینین. من تەنانەت وەختێ دەربارەی خۆیشم دەنووسم خۆم لەوە بە دوور دەگرم کە ناوی خۆم لە رستەیەکدا بهێنمەوە، تەنها لە کاتێکدا ئەو کارە دەکەم کە هیچ چارێکم نەبێت. لە نووسینی ناوی "لیونارد" یان "لینی" لەشم مووچڕکی پێدا دێت.

دەمەوێت بزانم بۆچی ئەو خوێندکارەم نەیدەتوانی واز لە ناوەڕاستیەکان بهێنێت، لە حاڵێکدا کە ئەو کارە پەیوەندییەکانی خێزانیی بەرەو پێش دەبرد ئەزموونی خودی من لەم کارە ئەمەیە وەختێ دەربارەی خۆم دەنووسم لەو ساتەی خەریکم ناوی مرۆڤە راستییەکانی ژیانم دەگۆڕم وەکو بڵێیت ئەوان گرنگایەتی خۆیان لەدەست دەدەن و پاشان چیتر ناتوانم خۆم لەو هەستە رزگار بکەم و وردە وردە هەموو شتێك وەکو درۆ و شتێکی ساختەی لێ دێت، هەرچەند هەموو شتەکان جگە لە چەند دانەناو، بە تەواوی ڕاست و حەقیقین. ئارەزووی ئێمە بەرامبەر بە راستی لە ناوماندا رێك بەو شێوەیە پێك دێت کە شێوەی چاوان لە جینەکانماندا دروست دەبێت و حەقیقەت "وەکو کوشتن" دەیەوێت بوونێکی دەرەکی پەیدا بکات. هەڵبەت چەند جۆرێك هەقیقەت هەیە. هاوڕێیەکەم دەبوایە ناوی هەقیقی مرۆڤەکانی لە ناو کتێبەکەیدا بگۆڕیبایە، بەڵام ئەو نەیتوانی ئەو کارە بکات. جۆرێك چاکەکاری شەیتانیانە ناخی داگیر کردبوو. "من هەقیقەت دەنووسم نە شتێکی دی، ئەمانە ناوی راستەقینەن". خەڵك زۆر جار وەختێ لۆمە

دەکرێن لەبەرئەوەی بوختانیان کردووە یان لە کاتی خۆیدا لە شوێنێکدا ئامادە نەبوون، دەڵێن: "بەڵام ئەمە ڕاستە" لەوە دەچێت بەوە کارەکەیان ئاراستە بکەن. هەقیقەت لە دڵی بێژەردایە.

هۆکارێکی تری وەڕزیم وەختێ سەبارەت بە خۆم دەنووسم ئەمەیە کە جگە لەوەی دەبێ سەبارەت بە مرۆڤەکانی دی بنووسم پەیوەندی بە خودی نووسینەکەوەیە. بە وتەی فرۆید: "نووسین جێگیرکردنی دۆخی کەسێکە کە لەوێدا نییە".

ئەمە پوختەی وتەکەی سوکراتە سەبارەت بە نەنووسین. ئەو وتی ئەگەر ئێوە شتێکتان بۆ وتن هەیە بیڵێن، پێویستە بۆ پرسیاری ئەو کەسەی دەپرسێت وەڵامتان هەبێت، چونکە هەقیقەت تەنها لە کرداری دیالێکتیک یان جەدەلدا شاراوەیە، کە هەڵبەتە گەیشتن بەو حەقیقەتە یان ئەزموونەکەی کارێکی زۆر گرانە. کە ڕوودەدات وەکو ئاگرێکی لەناکاوە.

ئەفلاتوون لەنامەی حەوتەمدا لە بارەی ئەو گەلۆریەوە کە بە ناچاری لە نووسیندا هەیە دەڵێت هەر کەسێك هەوڵبدات هەقیقەتی ڕووت بنووسێت بەو شێوەیەی کە خۆی ناسیوویەتی، دەبێ شێت بێ پێناسەیەکی چاکتر لەمە بۆ شێتیەتی نییە.

شێوازی فرۆید بۆ دەربڕینی لە ڕای سوکرات، واتە "جێگیرکردنی دۆخی کەسی غایب" زۆر دەلالەت کەرە.

ئەگەر لە کاتی نووسیندا لەوێ نەبێت، دەبێ لەو کاتەی سەبارەت بە خۆتان دەنووسن دوو ئەوەندە غایب بن. ئێستا کاتی ئەوەیەکە دان بەمەدا بنێم کە من هەوڵدەدەم بیری بوون لە نووسین لەگەڵ بیری غیابدا پێکەوە ئاشت بکەمەوە و لە کۆتاییدا پێویستە سەبارەت بە نووسین دەربارەی خۆم ئەمە ڕابگەیەنم کە ئەو ئاشتکردنەوەیە هەمان کارە کە دەمەوێت ئەنجامی بدەم. حەزدەکەم سەرەتا نوکتەیەکی تەنزتان بۆ بگێڕمەوە کە پەیوەندی هەر بەم ئاڵۆزییەی بوون و غیابەوە هەیە.

پاشا و دەربارەکانی بۆ ڕاوی کەڵەکێوی چوونەتە ناو جەنگەڵی شا، ڕاوچیەك کە بێ مۆڵەت لەوێدایە وەختێ دەبینێ ئەوان خەریکن نزیکی دەبنەوە دەترسێت و لە پشتی دارەکانەوە دێتە دەرێ و هاوار دەکات: "من کەڵەکێوی نیم" پاشا خێرا تەقەی لێدەکات. یەکێك لە هاوڕێیانی پێی دەڵێت: "بەڵام پاشا ئەو وتی کە من کەڵەکێوی نیم" پاشا لە ناوچەوانی خۆی دەدات و دەڵێت: "من وامزانی دەڵێت کە کەڵەکێویم"

هەر جار کە شتێك دەنووسم بوون و نەبوونی من لە کێشمەکێشێکی بەردەوامدان بە تایبەت وەختێ سەبارەت بە خۆم دەنووسم. ئەو شتەی کە کارەکەم لا گرانتر دەکات ئەوەیە کە بەهۆی ئەو کێشمەکێشە پڕ ئازارە، هەمیشە وا هەستدەکەم زۆر کۆنم، چونکە هەنووکە ئەمە لە نێوان نووسەرەکاندا باوە کە لە نووسینەکانیاندا – چ دەربارەی خۆیان بێت یان نا – لە ڕادەبەدەر ئامادەگیان هەیە، تەنانەت ئەگەریش پێیان بکرێت بەشێوەیەکی ناماقووڵ ئامادەگیان هەیە. هەندێ لە نووسەرەکان جگە لە ئامادەگییەکی تەواو کامڵ ڕێگایەکی دی نازانن، ئاوا ڕاستگۆییەکی ڕادەبەدەر پێشتر بوونی نەبووە. دەکرێت کاریگەری ئەم تایبەتمەندییە لەگەڵ هەرزە نووسیندا بەراورد بکرێت نەك بەهۆی ناوەڕۆکی ڕووتی بێ پەردە، بەڵکو بە هۆی ئەو ڕاستگۆییەی کە بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر ناشەخسین.

بەداخەوە ئەو شێوازەی کە من بە سوود وەرگرتن لێی دەربارەی خۆم دەنووسم، شەخسیە و هیچی تر نییە. ئەمەش بەم مانایەیە کە من هەمیشە

پێویستە فۆرمێکی گونجاو بدۆزمەوە. تاقە پەیوەندی نێوان شەخسی بوون و دۆزینەوەی فۆرمی گونجاو دەتوانرێت لە مەنەلۆژی هاملێتدا ببینرێت لەوێدا کە بیر لە خۆکوشتن دەکاتەوە. ئەو دەڵێت: "بەڵێ پێویستە ئەنجامی وا بێت" لەبەرامبەر هاملێتدا مرۆی سەردەم کە دەڵێت: "جێی بڕوا پێکردن نییە" یان شتێك وەکو ئەوە و ئەمەی کە هەستی "من" بوونی رابگەیەنێت.

جیاوازی نێوان بێژەری سەردەم و هاملێت تەنها لە نەبوونی وتنە دەربەستیەکەدا نییە ، بەڵکو لە نەبوونی فۆرمێکی بەرجەستە لە نێوان بێژەر و کەسی بەرامبەردا هەیە. کاتێ هاملێت دەڵێت: "بەڵێ پێویستە ئەنجامەکەی وا بێت" لەو هێزە سامناکە دەرەکییانە بە ئاگادێت کە بەرەو رووی دێن. هێزێك یەکسان نییە. ئەویتر زەرورەتە. فۆرمێکی رێزمانی، واتە "سیفەی ئیلتیزامی" ئەم ئەگەرە بۆ خوێنەر و هاملێت دەستەبەر دەکات کە پێکەوە لە هەلومەرجی شەخسی ئەودا بیر بکەنەوە. ئەم پێکەوە بیرکردنەوەیە ئەزموونی شەخسی بوونە. هاملێت بۆ ئەوەی ئەو حاڵەتە دروست ببێت وەکو مایلزدیڤیس کە پشت لە بینەران دەکات، خۆی لە رستەدا نوقم دەکات. دەشێ ئێوە بڵێن کە هاملێت سوود لە "سیفەتی ئیلتیزامی" نابینێت. ئەو راستییەك رادەگەیەنێت" ئێدی وتەکەی کاریگەری گوزارشتێکی هەیە.

من رێزماننووس نیم. بەڵام تا ئەو رادەیەی کە پەیوەندی بە وتەی هاملێتەوە هەبێت دەزانم کە دەکرا ئەو رستەیە بە شێوەیەکی تریش بوترایە، ئەو بە شێوەیەکی شەخسی و زۆر ناسك سوود لە وتنە دەربەستییەکە "سیفەتی ئیلتیزامی" وەردەگرێت. وەختێ بێژەری سەردەم دەڵێت: "جێی بڕوا پێکردن نییە" ناهێڵێت پێکەوە بیری لێبکەینەوە و ئێمە ناچار دەبین تەنها خەریکی تایبەتمەندییە هەستیەکان بین، خەریکی تێکڕای ئەو هەستە بین کە لە ناو هاواری "جێی بڕوا پێکردن نییە" زیندانی بووە. ئەو جۆرە دەربڕینە کە تەواوی مانا و هەستەکان لە ناویدا بە یەکجار زۆر بە ئاپوورەییەوە دەردەکەون و لە هەمان کاتیشدا ئەسڵەن مرۆڤ لێیان تێناگات، هەمان شتێکە کە من بە روخساری نووسینی سەردەم و زیاتر شتەکانی تری سەردەمی دەزانم و باوەڕم وایە کە لە چاوچنۆکی دەچێت. ئەم دیاردەیە بە گریمانەی زۆر پەیوەندی بە کەلتووری سەرمایەدارییەوە هەیە، کەلتوورێك کە ئێمە هەمیشە بەردەوام بینەری شەڕکردنی دیمەنگەلێکین کە دەیانەوێت سەرنجمان بەلای ئەو شتانەوە راکێشن کە نیمانە، گرنگترینیان روخسار و لەش و جەستەی جوانە، بەڵام زۆر شتی تر هەن وەکو: سەروەت و سامانی زۆر، ناوبانگ، دەسەڵات، عەشق و تارادەیەك هەر شتێك کە دەشێ خەڵك داوای بکات.

هایکۆ، شیعرێك کە سێ دێڕ و حەڤدە بەشی هەیە و زۆر جار دەربارەی سروشتە، فۆرمێك پێشکەش دەکات کە تێدا نووسەر و خوێنەر پێکەوە دادەنیشن، من ناتوانم هایکو بنووسم. بەڵام وەختێ دەربارەی خۆم دەنووسم، وا هەست دەکەم کە دەمەوێت بە هەمان شێوەی کورت و بەسوودەی هایکو بنووسم. ئەم حاڵەتە لە یەکێك لە کتێبەکانمدا ئاشکرایە کە ناوی "کاتی بەدەر لە زەین"ە.

ئەم کتێبە هەڵبژاردەیەکە لە یاداشتە رۆژانەکانم کە لە درێژەی زیاتر لە سی ساڵ نووسراون. لەم یاداشتانە من زۆر شەخسی تر لە هەر شوێنی تر دەربارەی خۆم دەدوێم، و لەلایەکی ترەوە کەمتر لە هەر شوێنی دی، چونکە ئەم

یاداشتانە زیاتر تێبینین تاکو شیکردنەوە. بۆ نموونە من لە ڕۆژی دوانزەی دیسەمبەری ساڵی 1993ز دا ئەمەم نووسیوە:

دەنگی باڵندەکان هەڵم دەستێنیٚ، دەنگێك وەکو ناوەکان
وەکو دارەکان
کە خۆیان لە تەمی سەر لە بەیانیدا دووبارە دەکەنەوە
هەرکامەیان لە شوێنی خۆیدا دانیشتووە، لە چاوەڕوانی ئەمەی بناسرێن،
وەکو ناوەکان

ئێدی زەمینەی ئەم یاداشتانە لابراوە. خوێنەر دەتوانیٚ لەو شتانەوە لێی تێبگات کە لە یاداشتەکانی تردا هاتووە، هەرچەندە زۆربەی وردەکاریگەلێك کە دەشیٚ بە کەڵکی نامەنووس یان پڕوپاگەندە خوازەکان بێت پێشکەش نەکراوە. لەم نووسینەدا من ناڵێم کە لەخەو هەستابووم لە ماڵێکدا لە تەنیشت کچە هاوڕێکەمدا ڕاکشابووم و ناڵێم کە بەلایەنی کەمەوە ماوەی سیٚ ساڵ پێکەوە بووین. ماوەیەکی نە ئەوەندە دوور پاش ئەو ساتە ئەو بەجێیهێشتم. من ناڵێم کە دەمزانی بەجێمدێڵێت و هیچ شتێك دەربارەی ئەم راستیە ناڵێم کە ئەو تەمەنی (27) ساڵ لە من منداڵتر بوو. من ناڵێم کە جیاوازی تەمەنمان یەکێك بوو لە ئاڵۆزییەکانی فیکر و زەینی، یان ناڵێم بەهەرحاڵ کە ئەو جیاوازییە لای من ئازاردەر نەبوو. من ناڵێم کە ئەو چێژی لەو وتارانە وەرنەدەگرت کە پسپۆڕەکان لە برکلیدا دەیانخوێندەوە، و برکلی شوێنێك بوو کە ئێمە سیٚ ساڵ تێدا ژیاین، یان ناڵێم کە ئەو لە میوانەکانی شێوانی برکلی بێزار بوو کە لە بۆنەکانی زانکۆ یان ئەدەبیدا ساز دەدرا. من ناڵێم کە شێتی بووبووم و ناڵێم کە دەمتوانی بە خۆشحاڵییەوە نەچمە میوانیەکانی شێوان و لەلای لە ماڵەوە بمێنمەوە و بەرنامەی دووگۆڵی شەوی دووشەممە سەیر بکەم. یان ئەگەر سووربوایە لەسەر ئەوەی تەنانەت بڕۆم بۆ بولینگ. من ناڵێم کە ئەو شتەی لای ئەو سەرنج راکێش بوو لای من نەبوو وەکو بەڕێوەبردنی کاروباری بازرگانی بچووك، سەرمایەگوزاری بانکی و بەڕێوەبردنی کاروباری دارایی و فەرمانبەرانی کۆمپانیایەك. من ناڵێم کە هەوڵم دەدا حەزم لەو شتانە ببێت و دەربارەی کارەکەی لێم دەپرسیەوە، بەڵام لە کۆتاییدا وا هەستم دەکرد زیاد لە سنووری خۆم خۆم تێهەڵقورتاندووە. پەیوەندییە دەروونییەکانی ژیانی بازرگانی، و تەواوی پانتایی کارکردنی بازرگانی و پارە هیچ کاتیٚ بۆ زەینم واتایەکی نەبووە. من ناڵێم کە جارێکیان پاش وتار خوێندنی بەڕێوەبەری گروپی ئینگلیزی زانکۆی هارڤارد لە برکلی دا ووتی: "ئێمە هەر لە بنەڕەتەوە لەیەك جیاوازین. تۆ گوێت لە وتارەکە دەگرت و من بیرم لەمە دەکردەوە کە زانکۆ چەندێك بۆ رووناکی و رێکخستنی ئەم شوێنە پارەی خەرج کردووە تا ئەم وتار خوێندنەوەیە رێك بخات. ئێستا تۆ دەتەوێت سەبارەت بە وتارەکە بدوێت، بەڵام من هێشتا لە بیری پاراستنی بیناکەم، هەموو شووشەکان دەبیٚ شۆرابێتن و کاشییەکانی پاك کرابێتنەوە. پێویستە کەسێکیان دانابیٚ بۆ ئەوەی ئەرکی پاراستنی باخچەی دەرەوە و دەورووبەر بگرێتە ئەستۆ" من ناڵێم کە لە خەو هەستام لە حاڵێکدا کە لەلای کچە هاوڕێکەم بووم کە (27) ساڵ لە من بچووکتر بوو زۆر زوو بە جێیهێشتم. ناڵێم کە ئەوم نەدەزانی، هەرچەند نەمدەزانی کە بەبۆنەی بازرگانێك بەجێیهێشتم.

مـن و کچـە هاوڕێکـەم چـووبووینە هـاوایی، کـەناری یونـا لـە بـیگ ئیلنـد. لەگـەڵ کۆمـەڵێك لـە هونەرمەندە شێوەکارەکان لە یەکێك لە خانووە کۆنە بـەڵام جوانەکانـدا بـووین و مـن و ئـەو ژوورێکـی بچـووکمان گرتبـوو. خانووەکـە پەنجـەرەی نـەبوو. مـرۆڤ دەیتـوانی هەسـت بـە سـەر سـەوزی و ژیـانی شکۆمەندی دەرەوە بکات، دارەکان، هەوا، ڕۆشنایی و ئۆقیانووس.

لە ژوورێکـی تـر سـێ پیـاو بـوون کـە یـەکێکیان سەرانسـەری شـەو دەکـۆکی. هـەروەها چـەند پیـاوی تـر لـەو کۆمەڵـە کەسـە نەخۆشـی ئایـدزیان هـەبوو. دیواری نێـوان ژوورەکانمـان تۆیـەکی ناسـکی داریـن بوو.

گوێگرتن لە کۆکەی ئەو پیاوە و زانینی ئەوەی کە کچە هاوڕێکەم بە جێمدێڵێت فاکتەری نووسـینی منن و دەشـێ خوێنـەر لـە پاشـماوەی نووسـینەکاندا هەستی پێبکات بەڵام ئەوە دووپات نەکراوەتەوە.

من ناڵێم کە گەنجییـەتی ئـەو بـوو بـوو بـە هـۆی ئـەوە مـن هەسـت بـە گـەنجی بکـەم، بـەڵکو زیـاتر بـە پێچەوانەوە بوو، و من ناڵێم کە ئەو کۆکەیـە تـەواوی شـەو پـڕ لـە خـەم و ئـازار بـوو و نـاڵێم ئـەو کۆکەیـە خەمەکـەمی تونـدتر دەکـردەوە، خـەمی ئـەوەی کـە دەمزانــی مــن زۆرتــرێکم لــەوەی کچــە هاوڕێکــەم بـەجێمبهێڵێت و ئـەو بـەم زوانـە بەجێمـدێڵێت. مـن نــــاڵێم کــــە لــــە ســــەرەتای پەیوەندییــــە خۆشەویستیەکەمان ئـەو وتبـووی کـە هـیچ وەختـێ بــەجێمناهێڵێت. مــن نــاڵێم کــە دڵــم بــۆ خــۆم نەدەسـووتا. هەسـتم بـە خەمۆکییـەکی زۆر دەکـرد.

وشـەیەکم بـۆ دەربـڕینی ئـەو هەسـتە بـە زمـانی ئینگلیـزی نییـە. وا بزانم لـە ئەڵمانیـدا پێـی دەڵـێن: "*weltschmerz*". من تەنها دەڵێم کە دەنگی باڵنـدە و دارەکـان وەکـو ناوەکـان بـوون. سـەیری دارەکـانم دەکرد کە لە ناو تەمـەوە دەهاتنـە دەرەوە و گـوێم لـە دەنگی باڵندەکان دەگرت.

کەوتمــە ژێــر کاریگــەری دووبارەبوونــەوەی شـتەکان و کەوتمـە ژێـر کاریگـەری ئـەو دۆخـە زۆر ناخۆشـە و پـڕ داخـەی دروسـت بووبـوو. هـەر بـەو شــێوەیەی کــە بــوونی تاکەکەســێك هەمیشــە دەردەکەوێت و ناوی بە دەنگی بەرز دەڵێتەوە، وەکو بڵێت خۆی لە زیـاد بـوون و کۆبوونـەوەی بـێ ڕۆحـی ژیانی جیا دەکاتەوە.

من لە یاداشتدا شتێکی وا زۆر لەو شتانە باس ناکەم، من وەختێ دەربارەی خۆم دەنووسم تێدەگـەم کـە زیـاتر ئـارەزووم لـە بـەهای دەربـڕینی فـۆرم و پەیوەندییان بە لایەنە شەخسیەکانەوە هەیە تاکو بە درکاندنی نهێنییە تایبەتیەکانی ژیـانی تاکـە کەسـی خۆم.

## پەراوێز

1-ئاماژەیـە بـە تیـودور کاچینسـکی کـە لـە نێـوان سـاڵانی 1978-1995دا نـارنجۆکی لـە نێـو زانکۆکانـدا دادەنا و لەوانە زانکۆی برکلی و زانکۆی ییسل.

## سەرچاوە

گۆڤاری کارنامە ژمارە (44) ل 49-52.

# گفتوگۆ

## دیمانە لەگەڵ فەیلەسوف

-پیتەر زلۆتەردایک-

لە ئەڵمانییەوە: بەکر عەلی

-گفتوگۆ لەگەڵ "کارل مارکس"دا-

لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

# دیمانە لەگەڵ فەیلەسوف پیتەر زلۆتەردایك

لە ئەڵمانییەوە: بەکر عەلی

**کۆمەڵگا گەورەترین ناونیشانی تەمومژاویە**

پیتەر زلۆتەردایك لە دیارترین و چالاکترین فەیلەسوفی نوێکاتی ئەڵمانیایە، بەر لە چەند مانگێك کۆتایی بە -تریلۆگی- سێینەکاری کتێبی (کایەکان) لە پتر لە دوو هەزار و پێنج سەد لاپەڕەدا هێنا. بە بۆنەی کۆتاهاتنی ساڵی 2004 ڕۆژنامەی -دی ڤێلت-ی ئەڵمانی لە مانگی دیسێمبەردا دیدارێکی درێژی لەگەڵدا سازداوە، کە سەبارەت زۆر مەسەلەی گرنگی ڕابوردوو، هەنووکە وەداهاتوو دوواوە، وەك تیرۆر، ئیسلام، ئەمریکا، ئەوروپا، دەوڵەت، شۆڕش، دەوڵەمەندی، سیاسەت وە هەندێکی تر. لەبەر گرنگی راوبۆچوونەکانی ئەم بیریارە مەزنە بە کوردیکردنیمان بە هەوڵێکی سوودبەخش دانا.

**پرسیار: وا ساڵی 2004 بەرەو کۆتایی مل دەنێت، ئێوەی فیلۆسۆف ئەو ساڵە بە چیدا دەناسنەوە؟**

زلۆتەردایك: بەر لە هەر شت بە ڕوودانی ئەو سێ مەرگە پاییزیەی کە دەشێت پێکەوە حاڵەتی هەماهەنگیەکی هاوکات چێ بکەن. سەرەتا مەرگی جاك دێریدا: دواهەمین گەورەی بواری مادەی فەلسەفە، ئەو بۆ من هاوکارێکی دوور بوو بەڵام وەك دۆستێك، وەك ویژدانێك لە منەوە نزیکە.

کە ڕۆژی شەممە لە پێشانگای کتێبی فرانکفۆرت هەواڵەکە لە پاریسەوە هات، ئێمە لە خانەی چاپ و بلاوکردنەوەی - سورکامپ- وەها خامۆش بووین، هەر وەك ئەوەی بڵێی زەمەن ڕاوەستا بێت. دوای چەند هەفتەیەکی کەم: ململانێی مردنی یاسر عەرەفاتی نیمچە مردوو دەستی پێکرد، کە لە نەخۆشخانەیەکی سەربازی فەرەنسی وەك لاشەیەکی زیندووی مێشك مردوو ڕاکشابوو، بەڵام هێشتا نەدەبوو بە شێوەی ئۆفیسیال مەرگی ڕابگەیەنرێت. لەسەر عەرەفات وا پێویستی دەکرد کە هەر وەك سەرەك دەوڵەتێك ئەرکی خۆی ڕاپەڕێنێت، لە کاتێکدا ملیۆنەها کەس لەسەر نیمچە - لاشەکەی و پۆستی فەرمانگەکانی دانوستان دەکەن. هەڵبەت ئەمەش ئەفسانەی -ئەل

سیدی– سەدەی ناوەڕاستمان دێنێتەوە یاد، کە بە مردوویی بەسەر پشتی ئەسپێکەوە دەبەسترا تاوەکو سوپاکەی بەرەو کوشتار بەرێت. پرسیاریش ئەوەیە: داخۆ لەم ڕۆژگارەدا لاشەی عەرەفات سواری پشتی کام ئەسپ بووە؟ پاش چەند ڕۆژێکی تر مەرگی سێیەم دێت: کوشتنی دەرهێنەرێکی بەهرە ئاسایی بەڵام بەناو گەورە، بە شێوازێك لەسەر شەقامێکی گشتیدا سەر دەبڕدرێت کە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کەوا کێشەکە لێرەدا سەبارەت لەناوبردن نییە، بەڵکو سەبارەت بە لە کەنیسە دەرکردنە -ئێکسکۆ میونیکاسیۆن– سەبارەت دەرپەڕاندنی مرۆڤە بۆ نێو ئەو ولاَخانەی سەر دەبڕدرێن. نووسینی کەسێکی دانپێدانەر پتر تووڕەیی باوەڕی زامداربوو پێشان دەدات وەك لە دەستنووسی تیرۆرێك.

**پرسیار: ئەم سێ ڕووداوی مەرگە چ شتێکی هاوبەشیان پێکەوە هەیە؟**

زلۆتەردایك: هەرسێکیان پێکەوە جۆرێك لە مێزگردێکی وتووێژ دروست دەکەن کە تیایدا هەندێك شت سەبارەت بە نموونەی جۆرەکانی مردن لەم سەردەمەماندا دەڵێن.

فەیلەسوف پاش دابڕانێکی درێژی چێبووی هۆشیارییەکی بەرز لە بەڵای پۆستمۆدێرنەی مرۆڤایەتی، بە شێرپەنجەیەك، بە هێڵنجێکی بەد دەمرێت کە هیچ ڕۆشنگەرییەك و هیچ لێك -هەڵوەشاندنەوەیەك تیشکی نەخستووەتە سەر. یاسر عەرەفات وەك ئایکۆنێك و وەك زۆمبییەك دەمرێت و تیۆڤان گۆخیش وەك قوربانی فاناتیزم، چونکە ئەم هەوڵیدا بانگی شەڕەکەی ڤۆڵتێر دژی کەنیسەی داپڵۆسێنەر بابداتە سەر ئیسلام.

**پرسیار: کام مەرگەیان ئێوەی توند سەرقاڵکردووە؟**

زلۆتەردایك: لە ئاستی کەسێتییەوە، بێگومان ئەوەی دێریدا، بەڵام وەکو هێمایەك بۆ دۆخی جیهان کۆتاییەکەی عەرافات شتێکە ناکرێت بەسەریدا تێپەڕین. ئەو وەك دوژمنی ژمارەگەلێك و وەك پەناگەیەکی پارێزەری نەفرەتی ملیۆنەهایەك مرد، بۆ هەندێکی تریش ئەو ڕابەرێك بوو کە هەموو هیوایەکیان تیا دەبینییەوە. گەر ئێتنۆلۆگیانەش بدوێین ئەو بزمار چییەك بوو لە هاوشێوەی ئەو مەعبودە کۆنگۆلییانەی تیایاندا بە بزمار نەفرەتەکان لە مێشکدا دادەکوتن.

ئەو بەشێوەیەکی بێوێنە مرۆڤێکی مەعبودی دوا چارەکی سەدەی پێشوو بوو.

**پرسیار: لە کۆتاییشدا ئەو بووکۆکەیەکی مردووی ژنەکەی بوو – ئەمەش نوکتەیەکی جوانی تەنزاویە دژ بەو ڕێزلێنەگرتنە شاراوەیەی لە ئیسلامدا بۆ ئافرەت هەیە؟**

زلۆتەردایك: تۆڵەی ژن ئەو کاتە دەستی پێکرد، کە شووی بەوکرد. نیتچە بەو بۆنەیەوە گوتوویەتی: فەیلەسوفێك ژنی هێنابێت ئەوە سەر بە کۆمیدیایە. کەواتە ئەی تیرۆریستێك ژنی هێنابێت سەر بە چی دەبێت؟ شتی وەها تەنها بۆ ئەو دیمەنە ساتیرییەی خۆرهەڵاتی نێزیك دەگونجێت. وەکوتریش ئەو تاکە پیاوی دەوڵەت بوو لەم سەردەمەماندا، کە ناوی "تیرۆریست"ی وەك ناونیشانی شەرەف هەڵگرتبوو، لە دوای چەرچلەوە هیچ کەس ئەمەی نەکردووە.

**پرسیار: چەرچڵ؟**

زلۆتەردایك: بێگومان چەرچڵ. کاتێك ئەو فەرمانی شەڕی بۆمببارانکردنی دژی ئەڵمانیا دەرکرد ئەو خۆی وەك تیرۆریستێك ناوزەرد کرد. ئەوسا مێژووی وشەکە کراوەتر بوو وەك لەمڕۆ، وە لەبەرئەوەی چەرچڵ زۆرباش زانیویەتی چی دەکات

ئـــەوا دانیشـــیناوە بـــەو دەســـتوێژەی خۆیـــدا و سەلماندیشی.

**پرسیار: ئایا ئەو وشەیە زووتر نەبووە؟**

زلۆتــەردایك: بــە دڵنیاییــەوە هــەبووە، بــەڵام تــیرۆری مۆدێرنــە مێژوویــەكی درێــژتری هــەبووە و دەگەڕێتەوە بۆ لای بەكارهێنانی گیلۆتین – مەقسەڵە – لە لایەن یاكۆبیەكانەوە. لە ئیتالیای سەدەی 19دا بـــە گروپێكـــی بـــۆمبی ئەنارشیســـتیان دەووت "دینامیتـاریۆ"، ئـەوەی لـە نیشـانە جوانـەكانی ئـەم پیشـەیەدایە ئەوەیـە كـە بـە ئاقـاری تـەواوی تەنـە ڕەقـەكان – هـاردوێر– *Hard ware*– چـوو. كەچـی ئەمڕۆ چەمكی تیرۆر زۆر ڕۆحی زەمەنی پێوە دیارە. واتە جەخت لە تەنە نەرمـەكان – سۆفت وێـر – *Soft Ware*– دەكاتــەوە و بــە شــێوەیەكی گشــتی بـیر لــە كاریگەرییـــە ئێســـتاتیكییەكان دەكاتـــەوە. بـــە ڕێبازەكەی چەرچڵدا ئەوە دەناسینەوە كـەوا ئەوسـا مێــژووی وشــەكە هێشــتا ســاغ نــەبووبووەوە. گــەر تۆقانــدن هۆكــار و دەســتوێژێك بێــت بــۆ زاڵبــوون بەسەر هیتلەردا، ئەوا دەبێت مـرۆ ئـەوە بسـەلمێنێت و دانیش بەوەدا بنێت كە نازناوی تیرۆریسـت وەكو نیشـانێك بەخۆیـەوە بنێـت. چەرچـڵ ئەمـەی كـرد، بەڵام عەرەفات لەمەدا ئیدیەی تری هەبوو.

**پرسیار: كەواتە دەشێت تیرۆر لە ڕاستیدا بـەم مانایـە ببێتە هۆكارێكی یـان ڕوویـەكی سیاسـەت. وە بـە مانـای بەرگریكردنی دەوڵەتێكی دەستووری ئەو پەیوەست دەبێـت بە پاوانكردنی توندوتیژییەكەیەوە.**

زلۆتــەردایك: ئــەوە تــەواو ڕاســتە. سیاســەت هەمیشــە بریتیــە لــە ڕێچــكەیەك – مۆدوسـێك–، كـە دەوڵــەت دەركــەوتنی خــۆی لــە بــەردەم گەلــدا پــێ ڕێكدەخاتــەوە. دەوڵـــەتی زلـــدیار (یـــان زلهێـــز – وەرگێڕ) پێویستە خۆی ئەو تۆقاندنە ببات بەڕێوە كــە بــەهرە بــەخۆی دەدات. ئــەو بەرپرســیارە لــەو شەبەنگەی كـە چـوار دەوری – بـە گووتـەی نیتچـە – ئەو "ساردترین هەژدیها"–یەی تەنیوە. كەواتـە ئـەو نابێــت تــەنیا هێماكــانی شــكۆی خــۆی بپارێزێــت، بــەڵكو ئــەو بــۆ بــەڕێوەبردنی هێــز و توندوتیژیەكـەی خـۆی بۆنـەی خـۆ دەرخستنیشـی هەیە. بە نموونە ئێوە بڕواننە نمایشی سەربازیانەی 14ی گەلاوێژ. كارل شمیت لـە ڕستەیەكدا دەڵێت: ســەروەر ئــەو كەســەیە كــە بڕیــار لەســەر دۆخــی نائاســایی بــدات. دۆخێكــی لــەو جــۆرە كاتێــك دەردەكــەوێت كــە هۆكــاری شــاراوەی تۆقانــدن لــە پڕێكــدا دێتــە ئــاراوە. كەواتــە مــرۆی ســەروەر و باڵادەســت ئــەو كەســەیە كــە توانــای ئــەوەی هــەبێت هەڕەشە لە ئەگەر و گریمانەكان بكات.

**پرسیار: كەواتە ئایا دەشێت سیاسەتكاری دیمـوكراتی جۆرێك بێت لە تیرۆریستێكی خەسێنراو؟**

زلۆتەردایك: دیمـوكراتی واتـە چیتر پێویسـتت بە تـیرۆر نابێت. ڕەوتـی ژیـانی كاسترۆ و عـەرەفات، هەروەها هی مێنـاخیم بێگن ڕێگـای تیرۆر دەبەنـەوە سەر بە ڕەوایەتیكردنی تـیرۆر. نازنـاوی تیرۆریسـتی خەســێنراو تــەواو لەســەر كارەكتــەری كاســترۆ و عـــەرەفات گونجـــاوە، ئەگەرچـــی كـــەمتر بـــەلای خەساندندا دەچێت وەك بەلای خامۆشیەوە.

**پرسیار: عەرەفات زیرەكترین مەكیاڤیللیست بوو؟**

زلۆتــەردایك: لــە پــەلاماری فەلەســتینیەكان لــە ســاڵی 1972دا بــۆ ســەر ئــەو گونــدە ئۆلەمپییــەی منشــن –میــونخ– كــرا، ژمــارەی ئــەو وەرزشــەوانە ئیسـرائیلیانەی كـوژران كـەم نـەبوون، عـەرەفات ئـەو كات سەرۆكی ڕێكخراوی ڕزگـاریخوازی فەلەستینی بــوو. هــەر لــەو دەمــەوە ئــەو بــەهرەی خــۆی وەك سیاسـەتكارێكی میـدیایی پیشـاندا. چـونكە ئـەوەی بتوانێــت ســـەركەوتووانە یارییـــە ئۆلەمپییـــەكان بشێوێنێت، ئەوە دەبێتە ئەستێرەیەكی جیهـانی. لـە

نۆڤێمبەری 1974 عەرەفات لە بەردەم ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان وتاریدا و بەمەش سەرکەوتنێکی شایستەی گەورەی بۆ ڕێکخراوەکەی بەدەستهێنا. ئیدی لەگەڵ دراماکەی منشن دا قۆناغی گەرمی هاوپەیمانێتی نێوان تیرۆر و میدیا دەستی پێکرد. ئەوە بریتی بوو لە کاتژمێری سفری تۆقاندنی میدیایی. کە چیتر چ پەیوەندیەکی بە پشکنینەکانی هیگڵ و بە تیرۆری نیمچە ڕەوای شۆڕشی فەرەنسیەوە نییە، هەر وەك چۆن چ پەیوەندیەکیشی بەو نیهیلیستە دڵسۆزانەیەشەوە نییە کە پەلاماری ڕێکخراوانەیان دەکردە سەر قەیسەرەکان. وەك دەزانین دانەری "فینۆمینۆلۆگیای گیان" تاوانی یاکۆبییەکانی وەك خودگەراییەکی ئەبستراکتی شێتانە ناوزەدکردووە، کاتێك هەر شتێك لەسەر ڕێی خەباتە پووچەکەیان بووایە بۆ ئازادی ڕاپاندەماڵی.

**پرسیار: ئایا ئەوە هیگڵی تۆقاندبوو؟**

زلۆتەردایك: من پێموانیە. چونکە هیگڵ خوێنسارد بوو، یان بە هەمان مەبەست بڵێم، ئەو لە هەموو شتەکان تێگەیشت بوو. ئەو پێی وابوو تیرۆر خەلاتێکە بۆ پرۆسەی فێربوون کەوا پێویست دەکات مۆدێرنەکان بیچێژن، بەر لەوەی بتوانن وەکو هاولاتی لە دەوڵەتی دەستووردا بژین. تیرۆری ویژدانی پەتی بریتیە لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ئەو کاروانەی بەرەو دەوڵەتی مۆدێرن ڕەوت دەکات: سەرەتا لە ڕێی ئەوەوە ڕۆحی ئازادی ئەبستراکتی رووت دەناسرێت، ئەو چۆن دەڕوانێتە خۆی، ئاوا فێری تێگەیشتن لەو مافەش دەبێت کە دەستبەرداربوون لێی مەحاڵە. ئەم قۆناغە دەبێت بگوزەرێنرێت، چونکە کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەتەکەی یەکەمجار لە قۆناغی پۆست - تیرۆریزمدا خۆی دەچەسپێنێت. گەر بە مانای قۆناغە گەورەکانی فێرکردن بدوێین ئەوا: تیرۆر بریتییە لە ئەپیسۆدەیەك - ئەڵقەیەك لە شەهادەی پێشینی تاقیکردنەوەی ئامادەیی مرۆڤایەتی.

**پرسیار: ئایا لەبەر ئەوەیە دەوڵەتە دەستوریەکان وا خێرا بە ڕووی تیرۆردا دەچنەوە، چونکە ئەوان بەودا ژیانی پێشینەی خۆیان دەناسنەوە؟**

زلۆتەردایك: دەشێت وا بێت. ئەوان بەودا ئەوە دەناسنەوە کەوا دەستبەرداری چ شتێك بوون. بەلام لە بنەڕەتدا تیرۆری هەنووکە شتێکی تەواو ڕۆمانتیکیە. ئەو بە شێوازی قارەمانپەرستی دانراوە و دەیەوێت لە ڕێی ئەکتەری بەجۆشی توندوتیژییەوە کۆمەڵگایەکی نوێ دابمەزرێنێت.

**پرسیار: بەلام ئەمە لەگەڵ بن لادن دا چۆن دەکەوێتەوە؟ خۆ بەشێکی گەورەی جەنگاوەرانی ئەلقاعیدە لە 11ی سێپتێمبەردا سعودی بوون؟**

زلۆتەردایك: بن لادن ئەکتیڤیستێکی خەونی سێهەمە. ئەو لە پاڵ خەونی ئەمەریکی و خەونی سعودیدا خەونێکی ئیسلامی هەیە.

**پرسیار: سعودیەکان چ خەونێکیان هەیە؟**

زلۆتەردایك: لە پاڵ ئەمریکییەکاندا هۆزی بالادەستی سعودی بەخۆیان و ئایینە بەربلاوەکەیانەوە بریتین لە گەورەترین ئێسکاپیستەکانی (ئێسکاپیستەکان واتە ئەوانەی لە واقیع هەڵدێن و پەنا دەبەنە بەر خەون و ئەندێشە - وەرگێڕ.) ئەم سەردەمەمان. لەبەر ئەوەی ئەوان پارەکانیان هەر لە تەواوبوون نایەت بەمەش دەتوانن لە جیهانێکی ڕەهای خەون دا بژین و لەوێشدا سەر پشك دەبن وەکو کەسێك کە بەدەم خەوەوە بڕوات، لە نێوان سەدەکاندا بێن و بچن. ئەوان لە هەنوکەوە بەرەو ڕابوردوو هەڵدێن و لەوێشەوە دیسانەوە دەگەڕێنەوە. جارێك خۆیان لە سەدەی 7 دا دەبیننەوە و بە سواری وشترەوە لە پاڵ محەمەدا

بیابانەکان تەی دەکەن و بەسەرێکی پڕ لە پلانەوە لە پڕێکدا خۆیان دەکەن بە سەدەی 18 و 19 دا و دەستلەملانی ئایینزای وەهابی دەکەن. پاشان ڕۆدەچنە ناو سەدەی 21 ەوە و خۆیان بە میهرەبانی جیهانی لیبرال مەست دەکەن. ئەم سەردەمی هەستی ژیانی - عەرەبۆ- دیزنی-یەی کە ناکرێت چاوپۆشی لێ بکرێت، ئەوان دەتوانن رایپەڕێنن و خۆشیان لە جیهانێکی تەواو ڕاستیدا ڕێکبخەن.

**پرسیار: ئایا بن لادن شتێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەم دیزنی - عەرەبەدا نییە؟**

زلۆتەردایك: بن لادن مەخلوقێکی ئێسکاپیزمی سەعودیە، بەلاّم لە هەمانکاتیشدا ئەو مورتەدێکی سەعودیە. ئامانجی ئەوەیە ئەو هاوپەیمانێتیە شازەی لەناو مێژووی جیهاندا هەیە، واتە ئەو ڕێکەوتنە دۆستانەیەی نێوان ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و سەعودیەی عەرەبی تێك بشکێنێت. هەردوو ئەم زلهێزە ئێسکاپیزمەی جیهان بەم هاوپەیمانێتیەوە پێوەندی یەکتر دەبن. نابێت ئەوەشمان لە یاد بچێت، کەوا ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە شێوازی خۆی بەرجەستەی نەتەوەیەکی ئێسکاپیستی دەکات، گەر تەماشای دنیای کۆن بکرێت بە ئاسانی هۆی ئەوە دەناسرێتەوە.

دانیشتوانی ئەو ولاّتە بە زۆری لەو مرۆڤانە پێکهاتوون کە لە پەیوەندیە وەڕسکەرەکان قووتار بوون و داماڵراون تاوەکو لە جێیەکی تردا سەر لە نوێ دەست پێبکەنەوە. ئەو ولاّتە لەسەر هەڵهاتن بەرەو بەخت خۆی هەڵچنیوە. ئەو خەڵکە لە جەوهەردا پەناهەندەیەکی ڕووتن و لەبەر کوێرەوەری ولاّتەکەیان لە خراپەوە بەرەو باشتر و لە چاکیشەوە بەرەو فانتازیا هەڵهاتوون. شێوە ژیانی ئەمریکی لە ڕێی ئەو هۆگرییە نائاساییەی بۆ نەوت هەیەتی هەر پێوەند دەبێت بە ناوچەی کەنداوەوە: بەم شێوەیە هەردوو جەمسەرە ئێسکاپیزمیە گەورەکەی زەوی بە شێوەیەکی ئیرۆنی گاڵتەجاڕانە پێکەوە گرێدراون. واتە خەونی سەعودی و ئەمریکی پشتیوانی یەکتر دەکەن.

هەڵبەت ئەو جۆرە ولاّتانە هاوشێوەی فابریکی خەونەکانی خۆیان بەرهەم دەهێننەوە. ئیدی عەرەبەکانیش گەیشتن بە قۆناغی ئەفسانە ئەفراندنی خۆیان و دەستیشیان کردووە بە خەیالاّویکردنی خۆیان، ئێستا ئەوان لەوەدان بۆ خۆیان وەکیلێك بۆ حیکایەتێکی گەورە دابهێنن. هەوا تژی بووە لە ئەفسانەکان و لە داستانە ئیمپریالیەکان و لە دوژمنایەتییە داستانئامێزەکان، بەبێ ئەوانە چ حیکایەتێکی گەورە نییە. گەنجان خۆیان بە پارانۆیای -شێتی- ئەفسانەی پاڵەوانێتی تەواو بارگاوی دەکەن و پاشان لە ماڵەوە لەگەڵ دوژمنە نزیکەکەدا و لەودیوی ئۆقیانوسی ئەتڵەنتیکیشەوە لەگەڵ دوژمنە دوورەکەدا بەشەڕ دێن. لەبەرئەوە بن لادن زۆر گرنگە، چونکە ئەو ڕۆحی ئەو هاوپەیمانێتیە ئەفسووناوێزییەی تەقاندەوە کە لە نێوان ئەو دوو هێزە ئێسکاپیزمیەدا هەبوو. ئەو دەرکی بەوە کردووە کەوا لە دژی فابریکەی خەونسازکەردا دەشێت تەنیا فابریکەی خەونسازکەری ئەلتەرناتیڤ یارمەتی بدات.

هاولاّتیانی دەستەلاّتی ئێسکاپیزمی ڕاستەقینە چیتر پێویست ناکات سەرقاڵ بن بە بەرگرییەکانی دوێنێوە. دیارە ئێسکاپیزم بریتییە لە نموونەیەك لەو بزووتنەوەیەی کە تیایدا مرۆ بە بەرگری ژیان دەگوزەرێنێت. هەڵبەت مرۆ خۆی بە بەردەوامی لەگەڵ کۆسپەکاندا سەرقاڵ کردووە، ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوە بووە چونکە ڕەنگە

بەدکاریـە کۆنەکـە بـۆ هەوارگـەی نوێـت شـوێنت کـەوێت. وە لەبەرئـەوەی تـۆ لـە جیهـانی کۆنـەوە هەڵهاتوویت و هەموو بێزارییەکت لە دوای خۆتەوە بەجێهێشتووەو ئێستا دەرک بە خۆت دەکەیت کە چیت بەجێهێشتووە. بەڵام باشترین شتی دروست بەرامبەر ئەوە بکرێت بریتیە لەوەی ئەو بەدکارێتیە هەر لە سەرچاوەوە کوێر بکەیتەوە.

**پرسیار: کەواتە مێژووی بەرپابوونی ئـەمریکا سـەرەتا بە هەڵهاتنی ئەوروپییەکان بۆ جێیەك کە نامەزرۆ بوون بـۆی بناغەی داناوە. ئەمەش هەر لـە کـەنارەکانی ڕۆژهەڵاتـەوە دەستپێدەکات و درێـژ دەبێتـەوە بـۆ ڕۆژئـاوا تـا دەگاتـە ئۆقیانووسی ئارام –پاسـیفیك-. لـەوێ هۆلیوودێـك بـەرپا دەبێت کە تیایدا مرۆڤ لە ڕووی دەروونییەوە هەڵهاتن دەکاتە شتێکی ناماتریال و بەردەوام بیری تری لێدەکاتەوە.**

زلۆتەردایك: لە ڕاستیدا کۆڕەو بەرەو ڕۆژئاوا بریتیـە لـە بناغـەدانانی بـەرپابوونی هـەر هـەموو مۆدێرنـە: لـە ئـەوروپاوە بەسـەر ئەتڵەنتیکـدا و لـە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو کەنارەکانی ڕۆژئاوا. بـەڵام ئـەو هاوڕەوکردنـە ئێسکاپیستیە گەورەیـە لـە مێـژ نییـە بەمـە کۆتـایی هاتبێـت. بـەڵکو لـە پـاڵ دیوارەکـەی پاسـیفیکدا وزەکـانی هـەڵهاتن خۆیـان کۆدەکەنەوە زۆر دەبن تا بۆ سەرەوە هەڵبزنێن. بەم جۆرە کالیفۆرنیا وەکو یەکەمین وڵاتی: بەرزبە، ئارام بە، دەوڵەمەندبە وە بەناوبانگ بە بەرپا دەبێت. لە هـەموو ئەمانـەدا هـەمان دینامیـك و هـەمان هێـزی جووڵە هەیە وە بریتیشە لە هەمان هەڵهاتن بەرەو ژیـانێکی سـادە و بـەرز و هەڵکـەوتوو. مـرۆڤیش هەمیشە دەخوازێت دەستەڵاتە کۆنەکانی خەمۆکی و هەڵاوسـان بـە خاکەناسـێك ڕابماڵێـت، ئەمریکیەکانیش هەست بەوە دەکەن شتێك لە پشت ئێمـەوە دزە دەکـات، کـە ئێمـە بـە تـەواوی نـەمان توانیوە کزی بکەین. زۆر کەس لەو هەڵهاتنە ماندوو دەبـن و دەکەونـە مەترسـی ئەوەشـەوە ڕاکردنەکـە نائومێدوو شکستیان بکات.

داخـۆ ئـەوە دەبێـت ڕێکـەوت بێـت کـە وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا بـریتی بێت لـە بەهەشـتی بەرهەمهێنـەرانی دەرمـانی دەروونـی؟ وە دۆزەخـیش بێت بۆ ئەوانـەی کێشـیان زۆرە و کێشـانەکە پێیـان دەڵێت" ئەوە بۆ فیتنێسی هەڵهاتنەکەتان باش نییە.

**پرسیار: پاشان ڕەنگە نەتەوە دروستکردن و بیرۆکەی دیموکراتی لە حاڵەتی پێویستیدا بە توندوتیژی چـەکداریەوە بنێردرێنە دەرەوە و بەم ئێسکاپیزمەدا ڕۆ بچێت؟**

زلۆتـەردایك: نەتـەوە دروسـتکردن بریتیەلـە هـەوڵی ئارامکردنـەوەی ڕەدووکـەوتووە شـیاوەکان لەو شوێنەدا.

**پرسیار: ئێوە باوەڕتان بەوە هەیە؟**

زلۆتـەردایك: بێگومـان نـا، نـا، چـونکە مـن نەمویسـتووە متمانـە بـە ئەمریکیـەکان بکـەم و ئومێدی سـەرکەوتنی کارەکانیـان بخـوازم. بـەڵکو بـە پێچـەوانەوە، مـرۆ ئەوپـەڕی چاکە بـۆ پرۆگرامێکـی لـەو جـۆرە بەوپێیـەی کـە پرۆگرامـە ئومێـد دەکـات. بەڵام وەك ئەوروپییەك دەرك بەو چەند شتە دەکەم کـە دڵنیـایی ئێمـە لـە ئەندازەسـازی سیاسـەتدا دەشـێوێنێت. نەتـەوە دروسـتکردن بـۆ خـۆی چـەمکێکی گێلانـە نییـە. بـەڵکو ڕەنگـە ئێمـە بـەوە بکـارین بەشـێکی باشـی ئـەو ڕووداوانـەی لـە کـاتی ناپۆلیۆنـەوە ڕوویـداوە کـورت بکەینـەوە. بـەر لـە هـەموو شـتێك ئـەو چـەمکە کارەکتـەری سیاسـەتی فەرەنسـی بـۆ جیهـان لـە قۆنـاغێکی شـەڕانگێزانەی دوای شۆڕشـــی 1789دا دەکـــات. ئـــەو فریادرەســـخوازییە – مێســـیانیزم – دیموکراتیـــە فەرەنسـیەی لـە ناپۆلیۆنـدا بەرجەسـتە بووبـوو بـە دڵنیاییـــەوە دەشـــێت بـــەراورد بکرێـــت لەگـــەڵ ئـــەوەی ئەمریکییـــەکانی ئـــەمرۆدا و دەرك بـــە

ئەنجامەکانیشــی بکرێــت. دوا پاشماوەکـانی ئـەم سیاسـەتە تـوانرا 150 سـاڵ دوای مردنـی ناپۆلیۆن بە ئەنجام بگەیەنرێت.

**پرسیار: دەشێت نمونەیەك بهێنەوە؟**

زلۆتــەردایك: بــا حاڵەتــەکانی ئیســپانیا و ئـەڵمانیا بهێنینـەوە، هـەردووکیان بابـەتی نەتـەوە دروستکردنی ناپۆلیۆنین. لە ئیسپانیادا ئەنجامەکان تا مردنی فرانکۆ لە 1976 درێژ دەبنـەوە. ناپۆلیۆن سـاڵی 1808 بەلەشـکرێکی سێسـەدهەزار پیـاوەوە چـــووە مەدریـــد، بێگومـــان وەکـــو ڕزگارکـــەر و ڕاگەیەنەری مافەکانی مرۆڤ. ئیسپانیە بەدبەختـەکان توانییـان بەیـەك لێـدان بەشـداری دەسـتکەوتەکانی شۆڕشی فەرەنسی بکـەن و، ئیمتیـازی نـەبیلزادەکان لەناوبـەرن، چەوسـانەوەی گـەل لـەڕێی قەشـەیەکی کاتۆلیکی مشەخۆرەوە کۆتـایی پـێ بێت. بەرامبـەر بـەوە لەوێـدا چ وشـەیەکی هەڵــە لــە لاپــەڕەکانی داگیرکـەرەوە نەکەوتـەوە. چـی ڕوویـدا؟ جووتیـارە کۆیلــە ئیســپانییەکان، هـــەژارترینی هـــەژارەکان، خۆیان گرد دەکەنەوە و خۆیان لە لەشکری ڕزگاری گەنجانەوە دەردەهێنن و بەوپەڕی ڕقەوە پێڤاژۆیـەك سەردەبڕن کە مرۆ هەر جارێك ناوی گـەریلا بهێنێت ئەوی بیر دەکەوێتەوە. ئیسپانیا دواتر پێویسـتی بە نزیکەی 170 ساڵێك بوو تاوەکو ڕێگەی خۆی بەرەو دیمـوکراتی دۆزیـەوە. لـە ئـەڵمانیادا شـتەکان زۆر باشتر ڕەوتیـان نـەکرد، چـونکە لـە ڕێـی هەڵچـوونی ڕەوتـی دژە فەرەنسـەییەوە ئـەوەش هاتـە سـەری کـە بیرۆکـەی بزووتنـەوەی نەتـەوەیی ئـەڵمانی خـۆی لـە بزووتنەوەی ڕۆشنگەری دابڕێنێت، ئەنجامەکانیشی ئەوە بوو کە ساڵی 1945ی لێکەوتەوە.

بـە کـورتی" ئەوروپیــەکان دەزانــن و دەبێــت بشـــزانن هەڵوێســـتیان لـــە ڕزگـــاری هـــاوردن و دیمـوکراتی هـاوردن لـە دەرەوە چـییە. دەشـێت لـە باشــترین حاڵەتــدا دیکتــاتۆری ڕووپۆشــکراو بــە دیمـوکراتی لەگـەڵ ژێرخـانی ئـابووری بازاڕمـان بـۆ بێت.

**پرسیار: ئەمە وەها دەزرنگێتەوە، وەك ئەوەی ئەوە بۆ ئێمەش بشێت؟**

زلۆتــەردایك: ڕایشــەکەی (ئیمپراتۆریەکــەی) ڤیلهێلم بە دوور لەم وەهمە تەندروست بوو. بەڵام ئەڵمانیای فیدراڵی بەختی هەبوو وە لەو هەڵچوونەدا دژی ڕزگارکـەران ئاقـاری وەرگــرت. بــەڵام ئەمــە حاڵــەتێکی تاکانــەی مێژووییــە، کــە لــە لایــەن پڕوپاگەندەچیانی هەنوکەی نەتەوە دروستکردنەوە بە نادروستی دەبێتە خستنەڕووی مۆدێلێك.

لــە بــارە ئەڵمانیەکــەدا مــرۆ ناکارێــت چ شــتێك داتاشــێت. جیهــان لــە ســەدەی 21دا بەوپــەڕی گریمانــەوە دەنگــی خــۆی دواتــر بــۆ کاپیتــالیزمێکی بالادەســتی گلۆبــال دەگۆڕێــت. ئەمریکیەکان بە شەڕی دژە تیرۆر و ئیسلامیستەکان بـــە جیهـــادی ڕۆمانتیکیانـــە وایـــان کـــردووە کاپیتالیزمی جەنگ نزیك بێتەوە لێمان. دۆخەکان بە جـۆرێکن، مـرۆ وای لێـدێت دواتـر بوێرێـت زۆر نادیموکراتی بێت.

**پرسیار: ئایا ئیدی ئـەرکی ڕۆشـنبیران لەوێدایـە کـە دیموکراتی بە ڕیشە تایبەتیەکانی خۆی بهێننەوە یادمان؟**

زلۆتـەردایك: لـە بنەڕەتـدا وایـە. بـەڵام چـیتر ڕۆشنبیران خۆیان تەواو نازانن ئەو ڕیشانە دەکەونە کوێوە.

**پرسیار: ئەمە بـەرەو ئـەم پرسـیارە دەڕوات: ئێمـەی ئـەڵمان کـێین؟ مـن وا هەسـت دەکـەم، خۆشـگوزەرانی بەلامانەوە گرنگتر بێت وەك لە ئازادی. لە خانۆچـکەیەکی بچووکدا بە گەرمی بژین لامان پەسەندترە وەك لەوەی لـە شوێنێکی زلی بەستێنەردا بین. ئێمە نیمـای ئۆبلۆمـۆڤ، ئـەو**

**پاڵەوانە ڕوسییەی سەدەی 19ین کە تەواوی ژیانی زیاتر لەسەر قەنەفەیەک بەسەر برد.**

زلۆتەردایک: هاولاتییە روسیەکە بەرەو خودی هەمان بابەت دەڕوات. مەبەستمە بڵێم کەوا ئەڵمانە مۆدێرنەکان لە ڕاستیدا پتر ڕوسین وەک لەوەی کە خۆیان دەزانن. ئێمە نیمای کلێشە ڕۆمانتیکیە روسەکانی ئەدەبیاتی سەدەی 19 ین. لەوانەیە لە کاتی شەڕی سارددا جۆرێک لە دۆنایدۆن – تناسخ الارواح – کرابێتە بەرمان. جیاوازیەکەش تەنیا ئەوەیە کەوا ئەڵمانەکان بە شێوازێکی تەواو جودا ئاسوودەن وەک لە ئامۆزا ڕۆژهەلاتییەکانیان. ئەوان نکولی لەو بنەمایانە دەکەن کە دەڵێن خۆشگوزەرانی ئەوان لە ڕێی کارکردنەوە بە گونجاوی دەمێنێتەوە. ئامادەیی توانا پیشاندانی ئەڵمانەکان مادامەکی فەرمانێکی داخوازی بەهێزی تێدایە ئەوا بریتیە لە بەهایەکی نەگۆڕی چەسپاو. لەبەر ئەوەیە ئەڵمانەکان نایانەوێت خۆبەخشانە هاوکاری بکەن بەڵکو دەیانەوێت ناچار بکرێن.

**پرسیار: پێویستە ئەوان جارێک بەر زەمینەی ڕەقی زەرورەت بکەون.**

زلۆتەردایک: گەر ئەو زەمینەیە ئەوانی دواندبێت ئەوا ئەوان توانای هەموو شتێکیان دەبێت.

**پرسیار: ئێمە لە کوێین؟ ئایا ئێمە دراوین بەو زەمینەدا یاخود شتەکە هەروا بەردەوام دەبێت؟**

زلۆتەردایک: من مەبەستمە بڵێم، ماشینەکانی سەرکەوتنی تایبەت بە وڵاتمان زۆر چاک ڕێکخراون وەک لەوەی ئێمە بتوانین زۆر دوورتری بخەینەوە. ئابوری ناردنە دەرەوەی ئەڵمانی، زانستی ئەڵمانی، سیستەمی مافی ئەڵمانی، کۆمەڵئارایی ئەڵمانی، ئەمانە هەموو بە ڕۆتینێکی پۆزەتیڤانە بناغە دادەنێن ئەگەر تاکەکان خەریکی پاشەکەوت و کۆکردنەوە بن.

**پرسیار: ئەی ئازادیەکان؟**

زلۆتەردایک: زۆربەی ئامانجەکانی ئازادی لەو نێوەندەدا بە ئامانجێکی نا سیاسی یاخود پۆست سیاسی پێناس دەکرێن.

**پرسیار: لە ئەڵمانیا شتگەلێکی سەرنجڕاکێش ڕوودەدەن: خەڵکانێک ئێشی ڕەش دەکەن جنێویش دەدەن کەوا شوێنی کاریان نییە. ئەوان دەناڵێنن بە دەست خراپبوونی باری ناوەوەی شارەکان کەچی بۆ بازاڕکردن تا سەنتەرەکانی بەردەم شار دەچن. ئەوان سەرزەنشتی ڕاگواستنی شوێنی کارەکان بۆ دەرەوەی ئەڵمانیا دەکەن کەچی بۆ پاشەکەوتکردن دەچن لە پۆڵۆنیا بازاڕ دەکەن. ئایا چیتر زۆری ئەڵمان بازرگانیە تایبەتەکەی خۆی و بەرئەنجامەکانی دەستناکەوێتەوە؟**

زلۆتەردایک: زۆربەی خەڵکی هێندە بەهێزنین لە تێگەیشتنی پەیوەندیەکانی نێوان (ئەگەر – ئەوا)، کە من نامەوێت ئەمە تەنیا لە جوغزی ئەڵمانیادا قەتیس بکەم. بەلام لای ئێمە بە تێکڕا ئارەزوویەکی مشەخۆریانەی کەشی کۆمەلایەتیشی دەچێتە سەر.

نموونەی ئەو جیابوونەوە ڕادیکالانەیە لە ڕەفتاری تایبەت بەخود و لە هوشیاری پەیڕەوکردن، ژێرخانی کولتوری دەرمانە سرکەرەکان دەگوێزێتەوە و بەمەش کۆمەڵگای کراوەی بەکاربەری (کۆنسومی – ئیستیهلاکی) شتی هاوبەشی زۆری دەبێت. سرکەر بەکاربەر فێری ئەوە بووە لە ڕووی فیزیکی و مۆرالیەوە بیر لە دەرئەنجامەکانی هۆگربوون بەو دەرمانانە نەکاتەوە، ئەو گوێ بە تیاچوون و مایەپووچبوونی خۆی نادات: ئێوە تەماشای ئەمە بکەن، کە چۆن ئێوە بە خۆتێکشکاندنی من لەناو دەچن. "ئێوە" مەبەستە

لە کۆلێکتیڤێکی ناڕاستەقینەی قەشەنگی ئەوانیتر، کە لە هەموو شتەکاندا گوناهبار و بەرپرسیارن. ئەم کۆلێکتیڤە -کۆگەلییە- هەروەها ئەو شتەش دەگرێتە خۆی کە بە کۆمەڵگا ناو دەبرێت، کۆمەڵگا گەورەترین ناونیشانی تەمومژاوییە. کۆمەڵگا زۆر باش خۆی وەکو وەرگرێکی خەیالاوی بۆ ئەونێردراوانەی کە چ ناونیشانێك وەرناگرن ساز دەکات. لە ڕاستیدا من پێموایە بەشێکی باشی نیشتمانە خۆشەویستەکەمان لە هونەرمەندانی پەیام ڕەوانەکردن پێکهاتووە. خەڵکانێك هەن زەوقی بەدیان ڕەوانەی باری ئابوری دەکەن و، خەڵکانێکی تر هەن ڕەفتاری بەکاربەریەکەی خۆیان ڕەوانەی وێرانبوونی ناوشارەکان دەکەن.

**پرسیار: سیاسەت لەوێدا چی پێدەکرێت؟ ئایا ئەو خۆی دروست بریتی نییە لە گەورەترین مۆتۆڕی ئەم مشەخۆرێتییە؟**

زلۆتەردایك: سیاسەتی کۆمەلآیەتی – *sozialpolitik*– بریتیە لە کردەی وەلانانی حاڵەتی پێویستەکان. ئەو دەبێت گفتی ئەوە بدات، وە پێویستیشە لەسەری ئەو گفتە بدات کەوا هیچ کەسێك تیا ناچێت وە ئەو هەر خۆی هەڵدەستێت بە ڕێگرتنی کەم ئەزموونی سەرانسەریانە. ئەمەش شتێکی زۆر مرۆڤانە و دروستە. بەلأم ئەنجامێکی لاوەکی هەیە ئەویش ناواقیعکردنی پێشکەوتنخوازییە. لە کەشی ناواقیعیدا حوکمە پێشوەختیەکان چیتر ناگەن بە ئەنجامە پاشوەختەکانیان، شتەپڕاکتیکی و لۆگیکیەکان دەخوازن پابەندی یەکتر بن. دوو جار دوو تەنیا لە ولأتە هەژارەکاندا دەکاتە چوار.

**پرسیار: کەواتە سیاسەت ئەوسا دەتوانێت وانەی ماتماتیك بداتەوە؟**

زلۆتەردایك: نەخێر، ئەوەی پێ ناکرێت. بەڵکو دەشێت مانای ئەوە بگەیەنێت، وا بکات ماتماتیك لەسەر مافەکانی مرۆڤ بگونجێنێت. ئەو لۆگێکی ڕەق و توندی سیاسەتی لەبەردەستدا نییە. دەوڵەت بۆ جارێکیش ناتوانێت کاروباری ماڵداری خۆی هاوتا بکاتەوە. چونکە فەرماندانی ناواقیعی بەهێزتر دەردەکەوێت وەك لە بیانووی دارایی. دەوڵەتی ئەڵمانی لە دوای 1945ەوە، کە هێشتا دانیشتوانەکەی هەژار بوو، وە هێشتا پێویستی بەوە نەدەکرد چەمکە بنەڕەتیەکانی ڕەقێتی بزانێت و پیشان بدات، ئاسانتر بەوە گەیشتووە. ئەو لەوەدا ماتەریالێکی هاوبیری بینییەوە و توانیشی بۆ پرۆژەکەی خۆی دەست بگرێت بەسەر بنەڕەتی ڕەقییەکەی ئەودا. دوای پەنجا ساڵ کۆرسی چڕی بەکاربەرێتی چیتر ئەوە شتێکە شیاوی بیرلێکردنەوە نییە. بەلأم دەوڵەتی ئەمڕۆ بە دڵنیاییەوە توانیوێتی لای هاولأتیان پێویستی بە جۆرە عەقڵیەتێکی تر بێت، کە یاخود بە مانای بارگرانکردن بۆ کۆرسی پاشەکەوتکردن یان بە مانای سەپاندنی هێزی نوێی پرۆژەکاری دێت. ئەو ناتوانێت هەردووئەم ئەگەرە لە هێزە تایبەتەکەی خۆیەوە دەربهێنێت، مادامەکی دەستەی کارگەرەکەی شوێن دینامیکێکی تەواو جیاواز دەکەوێت.

ئەو بارودۆخە نیمای ئەو خێزانەیە کە لەسەر نیوەڕێی خۆشگوزەرانیدایە و منداڵەکانی دڵنیا دەکاتەوە کەوا ئەوان هەر چۆنێك ڕەفتار بکەن لە تۆڕی گرێچنی خێزان بەرنابنەوە. ئەمڕۆ منداڵانی چینی ناوەڕاست لە بنەڕەتدا وەها نەرمونیان کراون کە چیان بوێت دەتوانن بیکەن بەبێ ئەوەی پێویست بکات ترسێکی دروستیان بەرامبەر لەناوچوونی چینەکەیان هەبێت. ئێمە لێرەدا هیچ سەبارەت بە

ئـەرك سـووككردنی ئـەو چـینە باڵایـە دواتـر دێـت نــادوێین. کەواتـــە دەوڵـــەتی ئـــەمڕۆ لـــە بـــارێکی دژواردایە، چونکە ئەوەی ئەوسا بۆی دەلوا لەگەڵ هاولاٚتیانیدا بەگەڕی بخات چیتر ئەمڕۆ بە ئاسانی بۆی نالوێت. بەر لە هەموو شتێکیش ئەو ناتوانێت هـــیچ فـــەرمانێك بـــدات و بۆیشـــی نالوێـــت وەکـــو ڕاهێنـەری مەرجـەکان دەربکـەوێت. وەکـو باویشـە دەوڵەت بەو مانایە خەسڵەتی ڕاهێنەری هەیە کەوا ئەو بانگەشە بدات لـە پێناوی: پێویستی ڕاهێنانی جۆرێك لە شەڕی ململانێ و جۆرێك لە ئەرك سپاردن بـــە گروهـــە جیاوازەکـــانی گـــەل، و ئینجـــا لـــەو یاریگایانەدا بخرێنە گەڕ، ئەمڕۆ دەوڵەت دەتوانێت لـە ڕێـی دەمـی سـەرۆکەکەیەوە، بـۆ خـودی خـۆی و لەلایـــەن خـــودی خۆیشـــیەوە، هاولاٚتیـــانی خـــۆی بدوێنێت و شتی زۆریشیان بۆ بکات.

**پرسیار: لێکجوداکردنەوەی کۆمەڵگا دەرئـەنجامێکی ترسناکی هەیە: نوخبەی (ئەلیتـەی) بەرهـەمهێنان هەمیشـە دەبێت زۆرتر کار بکەن و بۆ ئەمەش گاڵتەیان پێ دەکرێت. ئیدی دەمی مقەستی هەژاری و دەوڵەمەندی والاٚ دەبێـت: و دەبێت بە کردەی دابەشکردن بچێتەوە یـەك. خـەڵکی بـە ڕاشـــــکاوی لـــــەو باوەڕەدایـــــە کـــــە وا هـــــەموو لێکجوداکردنەوەیەکی لەو جۆرە هەمیشە ئەنجامی نـاڕەوای دەبێت.**

زلۆتەردایك: ڕەنگە وا پێویست بکات ئێمە جار ناجارێـــك نووســـینەکانی لومـــان بهێنینـــەوە بەردەستمان، کە دیارترینیـان بریتیـە لـە وتـاری "لـە سـەرەتادا نـاڕەوا نـەبوو". بـەلاٚم ئـەوەی ئـەمڕۆ ڕوو دەدات ئـەو هەسـتەش تێدەپـەڕێنێت کـە پرسـیار لـە ڕەوایـی دەکـات. مەبەسـت لەوەیـە کـەوا لەبەریـەك هەڵوەشـــــاندنەوەیەکی ســـــایکۆلۆگی هەســـــت پێدەکرێت، کە دەگاتە شوێنێکی قووڵتر وەك لـەوەی دادڕانـی چینایەتیە باوەکـە پێـی دەگـات. ئەمـەش پەیوەنـدی بـەوەوە هەیـە کـەوا ئەوانـەی بەرهـەمیان هەیە و هەفتانە 60 بۆ 80 کاتژمێر کاردەکەن پێیان دژوارە بتوانن بەشداری ڕاڤەکردنی هەقیقەت بکەن لەگەڵ ئەوانەی کەمتر کار دەکەن.

**پرسیار: ئەی ڕقلێبوونەوە لە ئەلیتەکان -نوخبـەکان- لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟**

زلۆتەردایك: بۆ ئەوەی لەوە تێبگەین، لە پاڵ ســـایکۆلۆگیەکی هەمیشـــەییدا بـــۆ نـــەفرت - ڕیزەنتیمێنـــت- یادهێنانـــەوەی ســـیمەنتیکێکی (ئامازەناســـی) مێـــژوویش یارمـــەتیمان دەدات. هەنـدێك جـار مێـژووی وشـەکەش سیاسـەتێکی گەورەیـە. لـە دەسـتپێکی ڕق لێبوونـەوەی ئەلیتـەی مۆدێرنـدا هەڵچـوونێکی دژە - ئەریسـتۆکراتی لای چینی خەڵکە گشتیەکەی شۆڕشی فەرەنسی هەیە. هاولاٚتی و چەمکی خەڵکە گشتییەکە ئەوسا پێکەوە نـەیانتوانی بـەو چارەسـەرکردنە ئاسـاییەی گـەل لـە ڕێی ئەریستۆکراتییەکی مشەخۆرەوە و هـەروەها لـە ڕێـی قەشـەی کلیرۆسـی کاتۆلیکـەوە چیتر بـەردەوام بـن. سـاڵی 1789 بـەم نرخاندنـە دروسـتکرا. لـەو کاتەوە خەڵکی لە ئەوروپادا تاوەکو 1917 و بگرە بەشـێوەیەکی ناوخۆیانـەش تـاوەکو 1968یـش وشـــەی چەوســـاندنەو یـــاخود بـــەکارهێنان - ئیســـتیغلال-ی بـــۆ ڕاڤـــەکردنی پەیوەندیـــە زۆر ناهاوتاکـانی داهـات بـەکاردەهێنا. ئـەم گوزارەیـە بـۆ سـەردەمی بـەر لـە 1789 ڕوون و ئاشـکرابوو: لـە ڕاسـتیدا نـۆبلزادە (نەجیبزادە)یـەك هـەبوو وە هاوتـا کلیریکیەکەشـی هـەبوو (کلیریکـی واتـای قەشـەی کاتۆلیکیـە - وەرگێـر)، کەدەسـتی گرتبـوو بەسـەر زێدە بەرهـەمی نەتـەوەی فەرەنسیدا، تـاوەکو بیبـات بـــەرەو هـــەموو ناچـــیزەییەکی -تواضـــع- ژیـــانی ئاغاکـــەی و، لـــەودیو توانـــای خۆشـــیەوە، بـــەڵکو لەســەرووی ئەوەشــەوە، ســەرایەکی مشــەخۆری لــە

ڕادەبەدەری نایەوە تاوەکو بەفیڕۆدانەکەی خۆی لە پێشدەم گەلدا دەربخات. دەبێت بە وریاییشەوە بڵێین کەوا لە دۆخێکی لەو جۆرەدا دژوارییەکان بەرپا دەبن و، لە پاڵ ئەمانەشدا وێنەی هاوشێوەی مۆرالی هاولاتیانە گیراوەتەوە. پرۆلیتاریەکان و هاولاتیان لەم ڕژێمەدا بەوپەڕی ژیرییەوە خۆیان بە چەوساوە / بەکارهێنراو دادەنا و سەرداریيە کۆنەکەش بە چەوسێنەر/ بەکارهێنەر. کاتێکیش هاولاتی و پرۆلیتاری لە دوای شۆڕشەوە ئاوێتەی یەکدی بوون، ئیدی نازناوی چەوسێنەر گۆڕدرا بۆ خاوەنکار، ئەم نازناوە تازەیەش لە پاڵ هەبوونی توخمێکی ڕاستی تیایدا، ئاماژەیەکی ناتەواویشی بەکاریگەریەکی دووری ترسناکەوە تێدایە. هەنووکە 200 ساڵ تێپەڕیوەو، هێشتاکە مرۆ بە کردەوە ئەوەی نەسەلماندووە، کەوا دەوڵەمەند کە خۆی کار دەکات و هەمیشەش لە کەسانی تر زۆرتر کاردەکات، وە لەگەڵ ئەودا فیگورێکی تەواو نوێ دێتە سەر سەکۆی مێژووی جیهان. ئەم چەشنە هێشتا شوێنی خۆی لەناو زانینی کۆگەلدا/ کۆلێکتیڤدا و لەناو گەنجینەی زماندا نەدۆزیوەتەوە. ڕەنگە شتەکەش لەوەدا بێت کەوا ئەوە دواهەمین بیرۆکەی خودا بووە. شتەکە هێندە ڕێ تێنەچووە، مرۆ بە نیازێکی باشیشەوە هێشتا دوو دڵە لە تێگەیشتنی. خۆشگوزەران بیت و لەم پێناوەشدا زۆربەی شتەکان خۆت هەستی پێی: ئەمە بۆ زۆر کەس، ئەگەر نەڵێین زۆرینە خەڵك، هەردەم شتێکی تەواو تەواو ناوازەیە. لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕووی چەندایەتی و جۆرایەتییەوە ئەوە دیاردەیەکی سەرسامکەرە. بەبێ کارکردنی دەوڵەمەندان، دەوڵەتێکی مۆدێرن کە کار بۆ بەرژەوەندی گشتی بکات نەدەهاتە ئاراوە. ئەو دەوڵەمەندە سەیر و سەمەرانەی باشتر قازانج دەکەن و بە زەحمەتیش پتر لە 10٪ی خەڵکی دەگرنەوە، ئەوان نزیکەی 50٪ی دەستکەوتی باجی نەتەوەیی پیکدەهێنن.

**پرسیار: بەلام تابویەك دەمێنێتەوە کە بریتیە لە بەتێماکردنی خود بەرپرسیارێتی لاوازیەکانی سۆسیال.**

زلۆتەردایك: من باوەڕم بە تابوەکان نییە، بەڵکو بە تێما شپرزەهێنەکان هەیە.

شپرزەکەرترین تێماش ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆری هەژاران هەن کە ئەوانە بێگومان ناچەوسێنرێنەوە، ئەوانە کەسانێکن کە کەس شتی لێ زەوت نەکردوون، بەڵکو ئەوانە لەو شانسانەی هەیانە زانیویانە شتێکی کەم ساز بکەن، ئەمەش بەرلەهەر شتێك لەبەرئەوەیە چونکە ئەوانە چ تاسە و جۆشێکی ئەوەیان نەبینیوەتەوە تاوەکو ئەو دۆخەی خۆیان تێپەڕێنن. بێگومان مرۆڤگەلێکی زۆریش هەن کە لە بارێکی ناشایستەدان و دیارە پێویستە لەسەر مرۆ یارمەتی ئەوانە بدات. لە ڕووی ڕاستیە هەنوکەییەکانیشدا ڕایەکی گۆڕاویش لەسەر بالی چەپدا شێوەگیر دەبێت، کە چیتر ناتوانێت لەسەرزەنشتکردنی چەوسانەوەو لە هاوکاریکردنێکی لەو جۆرەی چینەکاندا خۆی قوتار بکات و دوورەپەرێز ڕاوەستێت، بەڵکو دەشێت بگەڕێنەوە دواوە بەرەو چەمکە مۆدێل کۆنەکانی وەك هاوسۆزی و هاوبەرپرسیارێتی بوون لە پێناوی لاوازەکاندا.

**پرسیار: وەك کۆنزێرڤاتیڤە بەسۆزەکان - کە مۆدێلێکی سەرکەوتووی کۆماریخوازەکانن لە *USA*.**

زلۆتەردایك: ڕێگای ئەورووپی بەجۆرێکی تر دەبێت، لەبەرئەوەی ئێمە چەوساندنەوەی سیاسیانە بە هەستی ئاینی نانرخێنین. بەلام با چەند وتەیەکی تر سەبارەت بە دۆخی چەوساندنەوە بڵێم: "چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە" (گەر ئەم

هاوكێشـــەیەی ســـانت ســـیمۆن بهێنینـــەوە یـــاد) بەڕادەیـــــەكی بـــــەرفراوان بادراوەتــــە ســــەر چەوساندنەوەی سروشت لەلایەن مرۆڤەوە. ئێمە لە دۆخێكـدا دەژیـن كـە تەنانـەت هـەژارترین كـەس باوەڕی وایە كە ئەویش مافی ئەوەی هەیە پشكێكی ئەو بەكارهێنانە نوێیەی سروشتی بەربكەوێت. ئەمە كتومت تەبایە بۆ ئەو ژوورۆكە گەرمەی بەڕێزتان پێش كەمێك باستانكرد. بۆ نموونە بەرزكردنەوەی پلەی گەرمای ژوورەكان ئەمڕۆ جۆرێكە لە دزیكردن لە سروشت، هەروەك چۆن دزیكردنیشە لە مێژووی دێرینی زەوی.

مرۆ هەر زۆر بە ئاسانی ئەوە لە بیر دەكات كـەوا، ئـەو وزە هـەڵگرە بەردینیـە (واتـە زەوی – وەرگێڕ)، كە ڕۆحێكی مەزنی سەردەمەكەمانە، لەم دووسەد ساڵەی دواییدا شتی زۆرتری لە تێكڕای هـەموو فاكتـەرە كولتورییـەكانی تـر بـۆ گـۆڕینی مەرجـەكانی ژیـانی مـرۆڤ بـە ئـەنجام گەیانـدووە. پێویســـتە مـــرۆ ڕۆبچـــێتە نـــاو ئـــەو ڕســـتە بەرەنگاركەرەوە، تا لەوە تێبگات كە ئەمڕۆ چەندێك زۆر زۆربەی خەڵكی بەو هزرانەی چ پارەیەكیان پێ نـەدراوە دەژیـن. خـەڵكی دەڵـێن كولتـور، كەچـی ناشزانن ئەمە لە كوێوە دێت.

**پرسیار: دیارە گرفتەكە ڕیشەیە. كەواتـە بـا بپرسـین ئەمڕۆ كێ كۆنزێرڤاتیڤە و كێش پێشكەوتنخوازە: نەقابەكان یاخود پارتیە مەدەنیەكان؟ یان ئەوەتا ئەو چـەمكانە پـووچ بوونەتەوە؟**

زلۆتەردایك: بەبێ هیچ گومانێك ئەمڕۆ نەقابەی كاركەران بریتین لە گەرمترین ناوكی كۆنزێرڤاتیزم – پارێزخوازی–، لە پاڵ ئەوانەدا پارتییەكانی وەكو – ســی ئــێس یــو– بــریتین لــە ســۆڤیەتێكی ڕووت. بــەلام بــەبێ كۆنزێرڤاتیڤــەكان چ ســەركەوتنێكی كولتوری نییە.

**پرسیار: ئەی پارتی یەكێتی دیموكراتی كریستیان – سی دی یو؟**

زلۆتـەردایك: ئـەم وەك هـەر پارتییـەكی گـەورە هـــــەر دوو توخمەكـــــەی، پـــــارێزخوازی و پێشـــــكەوتنخوازی لـــــە خۆیـــــدا هـــــەڵگرتوو. سۆسیالدیموكراتە كۆنەكە بەشێوەیەكی زۆر سـەیر بـریتی بـوو لـە پەیمانگایـەكی پـارێزخوازی كـە بەدەسـتكەوتە كۆنزێرڤاتیڤـەكان خـۆی ئـاوەدان دەكاتـەوە. بەشێوەیەكی گشتی دەشێت بگووترێت كـەوا هەمیشـە نائـارامی بریتیـە لـە دەرهاویشـتەی فێربـوون وە مـرۆش تـەنیا ئـەو سـاتە دەتوانێـت و پێویسـتیش دەكـات فێـر بێـت كـە لەسـەر دەسـەلات دەبێـت. كڵـۆڵی –ئـێس پـی دی– لـەوەوە دێـت كـەوا لەناویـدا خـەڵكانێك هـەن كـە بەڕاسـتی دەخـوازن فـەرمانڕەوایی بكـەن. ئەگـەر پارتیـەك لـەو جـۆرە فیگورانـــەی نـــەبێت ئـــەوا دەشـــێت خـــۆی بـــە ئۆپۆزیســـیۆنێكی خەیاڵپلاوانـــەی ئاســـوودە ڕازی بكـات و خـۆی بـۆ فێركـردن لـە پێنـاوی جیهانـدا پاشـەكەوت بكـات. كەواتـە وەك وتم، مـرۆ تـەنیا ئـەو سـاتە فێـر دەبێـت گـەر پاشـەكەوتێكی پـارێزراوی – احتیـاط– مسـۆگەر بـە نابەرپرسـیارێتی بەجێهێشـت بێت.

**پرسیار: لە خۆرهەلاتی ئـەوروپادا، لـە مزگـەوتـەكانی فوندامێنتالیزمدا، ئیرادەی ئازادی لە خۆڕاگەیاندندایە. ئایـا لە ئۆكراینەكانەوە فێری ئەوە ببین، كەوا ئێمە دەبێت چـۆن بین و لە ئیسلامگەرەكانی ئەڵمانیاشەوە كەوا ئێمـە دەبێـت چۆن نەبین؟**

زلۆتـەردایك: لەوێـدا هەسـت بـە دوو سـنوور دەكرێت، كە سنوری جێۆگرافی نین، بەڵكو سنووری عەقڵیـەتی سیاسـین. یـەكێكیان بـە ڕق و نـەفرەت دەكێشرێت و ئـەوی تریـان بـە ئیدیالیزەكردن و بـە چـــاوەڕوانكردنی فریادڕەســـێك دەكێشـــرێت.

ئەوروپییەکان دەشێت هەموو ئەو هۆیانەیان هەبێت کەوا وەکو شانسێکی زل دەرك پێبکرێن. لە ڕووی ئەم ڕاستیەدا مرۆ دەبێت دۆخی ڕاستەقینەی ئەوروپا بە هاوچەرخ بکات. نەتەوە ڕابەرەکانی ئەوروپا، بەبێ جیاوازی، بریتین لە وێنەی جێگرەوەی ئیمپراتۆرە شکاوەکان. گەر مرۆ بڕوانێتە مێژووی عەقلیەتی نیوەی دووەمی سەدەی بیست، ئەوا مرۆ بە هەموو لایەکدا پاتۆلۆگیای ڕاگوزەریانەی زلهێزە لابراوەکانی دنیا دەبینێتەوە. ئەم فێنۆمێنانە زەمەنی خۆیان هەبوو، بەلاَم ئێستا ئەرێکردنێکی نوێی ئەوروپی لە ئارادایە. لەم دۆخەشدا پێویستە ئێمە ئەفسانە ئەوروپییەکان وەها دووبارە بگێڕینەوە کە گوێگرەکان لەو چیرۆکە وەها تێبگەن کە مەسەلەکە لەبەرخاتری شتێکی مەزنە، و مایەی شانازیشە بەشداری ئەوە بکرێت. ئەمە بەو مەرجەی کەوا ئێمە لە جوانترین ئەفسانەکانمانەوە لای ئەمریکیەکان بهێنینەوە، ئەو ئەفسانانەی ئەوان لەگەڵ خۆیاندا بەسەر ئۆکیانووسدا لێمانیان برد.

**پرسیار: کام ئەفسانانە؟**

زلۆتەردایك: چیرۆکی هەڵهاتنی ئاینیاس، ئەوەی فیرجیل دەیگێڕێتەوە. هەر کەسێك ئەو چیرۆکە ببیستێت دەستبەجێ تێدەگات کە ئەوروپا دەکەوێتە کوێوە: ئەوروپا ئەو شوێنەیە کەلەسەر کارتی هیوادایە و تیایدا مرۆڤە سەرکەوتووەکان شانسی تریان بۆ دێت. ئەوەی ئەوسا هەڵپەی ئێسکاپیزمی ئەمریکی دەرهاویشت، دەبێت ئێستا ببێتە ناوکی هۆشیاریی ئەوروپی. چیرۆکەکە بەشێوەیەکی حەتمی لەگەڵ سووتانی ترۆیا – تەروادە– دەستی پێکرد و لە ئاینیاسەوە دۆڕاوترین کەسەکان هەڵدێن، باوك لەسەر پشت و پێناتەکان (خودای پاراستنی ماڵ و خێزان لە ڕۆمای کۆندا – وەرگێڕ). لەناو بوخچەدا، بە نیازی ئەوەی لە ئیتالیا دەست بکەن بە هەوڵدان بۆ ژیانێکی تر. بێگومان چیرۆکی تریش هەن. من پێموایە، مرۆ دەبێت ئەم دەستپێکە نا ئیمپریالیانەی ئاینیاس وەکو ئەفسانەی دامەزراندنی ئەوروپای هەنووکە پتەو بکات و دواجاریش واز لەوە بهێنێت ئەم چیرۆکە بەربادە پووچە لە ئەوروپای کیژۆڵە و ئەوروپای (گا)وە دووبارە بکاتەوە. ئەم چیرۆکەی وەك ڕێنومایەك هێنامانەوە، زۆر بە ڕوونی ئەمە دەڵێت: ئەوروپا ئەو ولاَتەیە کە تیایدا مرۆڤە سەرکەوتووەکان دووبارە لەسەر قاچی خۆیان ڕادەوەستنەوە. ئەمریکیەکان ئەم چیرۆکەیان بە مسۆگەرییەکی غەریزی بلیمەتانەوە لێ ڕفاندین، بەلاَم ئەوروپییەکانیش، بخوازن یان نەخوازن، دەبێت ئەو ئەفسانەیە بۆ خۆیان بهێننەوە. ئەگەر نا لە حاڵەتێکی تردا ئەوان دەبنە کۆگەلێکی – ناسیۆنالیستە گەنیوەکان و ئەوساش ئەوان ناتوانن گرفتی ئەو هاولاَتیە نوێ بێشومارانە چارەسەر بکەن، کە بەبێ ئەو هاولاَتیانە ئەمان ناکرێت بەزیندوویی بمێننەوە. ئێمە پێویستمان بە هاوکێشەیەکی نوێ هەیە بۆ میوانداری و ئامێزەبوون، کەپێشتر فێرجیل وەبەرهەمی هێناون.

**پرسیار: ئەگەر ئێمە ئەفسانەی ئەمریکیەکان بەین، ئەوسا چی بەسەر ئەواندا دێت؟**

زلۆتەردایك: ئەمریکیەکان خۆیان خەونەکانی خۆیان خستووەتە بەر گەمە و مەترسیەوە، بەبێ ئەوەی پێویست بکات ئەوروپییەکان شتێکیان لێ ببەن. سەرنجێکی وەها هەیە کەوا ئەوان لە ڕووی سایکۆلۆگیای سیاسییەوە پەکیان کەوتووە و بەرامبەر بەو گیانی تۆڵەیەی کە پەلاماریدان بێ بەرگری دەردەکەون. ئەوان ڕازین بەو ڕاستییەی

کەوا خەڵکی هێندە چارەی ئەوانی ناوێت، کە چۆن مەبەستیان بووە ئەوان بەدەست بهێنن. لەم هەستیاریە نارسیسەوە ناکرێت هیچ شتێکی چاك بێتە ئاراوە. ئەوروپییەکان دەتوانن مت بن، ئەوان توانستی مەزنیان هەیە، بەر لە هەر شت، خۆبەستنەوەی تاکانە لە کولتوری ئازادی و لە شێوە ژیانی - ژیرییەوە، کە ئەمەش شتێکە، لە ڕەنگی ئەو تەنیا لە دنیای کۆندا هەیە. ئەوروپا بریتییە لە ماتریکسێکی (خانەیەکی) گەورەی هونەری ژیان. من تازە لە کۆریا گەڕاومەتەوە، شتێکی زۆر سەرنجڕاکێشی ئەم نەتەوەیە ئەوەیە ئەو ئەمڕۆ نیمای ئەو سەرسامییە ئابورییەی سالأنی 60 و 70کانی ئەڵمانیا دەژی، کۆریا ولأتێکە لە هەڵپەی بەرهەمهێناندایە. مرۆ لەوێ تێبینی ئەوە دەکات، کەوا لە خۆرهەلأتی ئاسیادا کاپیتالیزمێکی کۆگەلی هەیە، کە بەرامبەر بەشێوە ژیانی تاکگەرایی پتەوی ئێمە ئەو گەورە دەردەکەوێت. لەوێ مرۆ ئەوروپێتی خۆی وەبیردێتەوە. من پێموابوو، مرۆ دەبێت بۆ هەموو خولەکێکی ژیانی خۆی سوپاسگوزار بێت کە بۆی هەیە لەم کەرتەی جیهاندا بژی.

**پرسیار: ئایا سوپاسگوزاری، (وەك هەستێك کەوا لە مرۆ دەکات خۆی بەختەوەر بنرخێنێت)، بە ئازادی بزر بووە؟**

زلۆتەردایك: "بەختەوەر خۆنرخاندن"، ئایا ئەمە بەشێوەیەکی گشتی بریتی نییە لە یەکێك لە گوزارە هەرە جوانەکانی زمانی ئەڵمانی؟ من وای بۆ دەچم کەوا ئێوە یەکەم کەسن، کە دوای چەندین ساڵ ئەم گوزارەیە لە پێکبەستنەوەیەکی پڕ مانادا بەکاردەهێننەوە. ئەمە گوزارەیەکی فانتازی مانابەخشی تەواوە کەچی لە بنەڕەتدا زۆر نائەڵمانییە. واتە باشترین ئەڵمانییە بۆ هێماکردنی هەستێکی تەواو نائەڵمانی.

**پرسیار: ئەمرۆ خەڵکی لەبەردەم بەختدا پاشەکشە دەکەن، من وای دەبینم ئەمە بزووتنەوەیەکی ئەڵمانییە؟**

زلۆتەردایك: من دەپرسم، ئایا ئەوە هی سەرجەم میزاجی کولتوری خۆرئاوا نییە. خەڵکی لە هەموو لایەکەوە مەشقکردنی ئەوەی دەخرێتە پێشدەم کەوا ژیانی تایبەتی خۆی لەبەر تیشکی تۆڵەسەندنەوەی زیانێکدا بەرجەستە بکات. مرۆ باوەڕی وایە، کەوا مرۆ سەرنجێکی زۆر چێ دەکات کاتێك ئەو خۆی وەك قوربانی هێرشێك پیشاندەدات. مرۆ بە بەردەوامی فۆرمولاری نادیار لەسەر قەرەبووکردنەوەی زیانەکان پڕ دەکاتەوە و لە تەمتومانێکدا لای فەرمانگەیەك بەرزی دەکاتەوە.

من پێموایە، شتەکە بەو جۆرەیە کە دۆخی کوێرەوەریە ناسراوە ئەڵمانییەکەی تێدایە. بەلأم ئەگەریش ئەدەبیاتی ئەڵمانی ئەو کوێرەوەرییەی لە ئامێزگرت و لێکۆڵینەوەی لەدیاردەکە گرت، ئەوا "کوێرەوەری" لە ڕاستیدا بریتییە لە گوتەزایەکی مۆزیکی یان لە گوتەزایەکی کتێبی پیرۆز (بیبل)، بەو پێیەی کەوا مرۆ بیر لە جێرمیا (پێغەمبەری سکالأ لە دەست کوێرەوەری، سروودی سکالأ و کڵۆڵی/ لە کتێبی بیبل دا - وەرگێڕ)، دەکاتەوە.

ئەوەی ئێمە ئێستا لە بارەیەوە دەدوێین، چ شتێکی بەسەر ڕێچکەی موزیکانەی لامێنتۆوە نییە. (لامێنتۆ بریتیە لە پارچە موزیکی کارەکتەری ئازارو سوێ - وەرگێڕ). لە ڕاستیدا کوێرەوەرییەکەی ئێمە بریتییە لە پڕکردنەوەی فۆرمولاری بارە داراییە بەدەکان.

ئەگەر مرۆ ئەوە ئیمزا و مۆر بکات، ئەوا ئەو دەتوانێت دڵنیا بێت لەوەی کەوا لەو پێناوەدا لە جێیەکەوە شتی بۆ دێت..

# گفتوگۆ لەگەڵ (کارل مارکس)دا

لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

لەماڵێکی بچوک لە (هۆراستۆك هێل)ی باکوری خۆرئاوای لەندەندا، کارل مارکسی بنیاتنەری سۆشیالیزمی مۆدێرن دەژی. ئەو لەساڵی (1844)دا بەهۆی بانگەشەی تیۆرە شۆڕشگێڕییەکانیەوە لەزادگاکەی -ئەڵمانیا- دوورخرایەوە. لەساڵی (1848)دا بۆ ئەڵمانیا گەڕایەوە، بەڵام دوای چەند مانگێك دووبارە دوورخرایەوەو لەپاریس نیشتەجێ بوو. بەڵام تیۆرییە شۆڕشگێڕییەکانی ئەو، بووبەمایەی ئەوەی کە لەساڵی (1849)دا لەو شارە دووربخرێتەوە. لەو ساڵەوە بۆ دواتر، نوسینگەی ناوەندی ئەو لە لەندەندا کرایەوە. پابەندێتی بەبیروباوەڕەکانییەوە هەر لەسەرەتاوە کێشەی بۆ دروست کردووە زۆری بۆ هێنایە ئاراوە. هەر لە ڕووخساری ماڵەکەیەوە دەردەکەوێ کە بیروباوەڕەکانی هیچ خۆشگوزەرانییەکیان بۆ بەدینەهێناوە. بێگومان مارکس بەدرێژایی ئەو ساڵانەی بەجدی خۆی بۆ بیروباوەڕەکانی تەرخانکردووە (کە بێگومان لەبیروباوەڕی قوڵییەوە بەو بیروباوەڕانە سەرچاوە دەگرێ)، و هەرچەندە کە ئێمە بانگەشەکانی بەبێ نرخ دابنێین، بەڵام ناتوانین ڕێز بۆ ئەو کەسە دانەنێین کە هەنوکە دوورخراوەیەکی بەنرخەو خۆی بۆ بیروباوەڕەکانی تەرخانکردووە.

هەواڵنێرەکە دوو یا سێ جار بۆ لای ئەو بانگهێشتی کردین‌و هەرجارەی کە لە کتێبخانەکەیدا دیدارم لەگەڵ دکتۆردا کرد، کتێبێکی بەدەستێکییەوەو جگەرەیەکیشی بەدەستەکەی ترییەوە بوو، ئەو زیاتر لە (70) ساڵ دەبێت (مارکس لەو کاتەدا 60 ساڵە بوو)، فیزیکی جەستەی" باڵابەرزو قەڵەوە. ئەو پێشڕەوی ڕووناکبیریی‌و نمونەی جولەکەیەکی بیرمەندە. سەروڕیشی درێژو خۆڵەمێشییە. ڕەنگی چاوەکانی، لەژێر برۆ پڕەکانییەوە لەڕەش دەچوو. لەبەرامبەر نامۆدا، زۆر خۆپارێزە. بەگشتی، بەیانی دەتوانێ مۆڵەتی دیدارێك وەربگرێت. بەڵام (هیلین دمۆرت)ی ژنە ئەڵمانی کە بەرپرسی ڕێکخستنی

دیدارەکانییەتی، فەرمانی پێدراوە کە مۆڵەتی دیدار بەهیچ کەس نەدات مەگەر ئەوەی کە ناسنامە بهێنێت. کاتێك کە دەچیتە کتێبخانەکەیەوە، چاویلکە یەکچاوەکەی دەخاتەچاوی، تا قوڵی رووناکبیریتان هەڵبسەنگێنێتو دوای ئەوە بدوێت. دوای ئەوەیە کە لەبەرامبەر تۆدا، زانستی ئەم پیاوە دەردەکەوێت.

دەنگی گفتوگۆی ئەو یەك ریتم نییە، بەڵکو بەئەندازەی ژمارەی رەفەکانی کتێبخانەکەی" دەگۆرێت. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانرێ مرۆڤێك لەرێگەی ئەو کتێبانە بناسی کە دەیخوێنێتەوەو کاتێك دەڵێم من لەکتێبخانەی ئەم پیاوەدا بەرهەمەکانی شکسپیر، دیکنز، مۆلێر، بیکن، گۆتە، ڤۆڵتێر، پین، کتێبەکانی بەریتانیا، ئەمریکا، فەرەنساو بەرهەمی سیاسی- فەلسەفی رووسیا، ئەڵمانیا، ئیسپانیا، ئیتاڵیاو..هتدت بینی، دەتوانن خۆتان سەبارەت بەم پیاوە ئەنجام وەربگرن.

بەدرێژایی گفتوگۆکردنەکە لەگەڵیداو لەو پرسیارانەدا کە پەیوەندی بەئەمریکاوە هەبوو، لەو زانیاریانەی سەبارەت بەئەمریکا هەیبوو، حەپەسام کە لەم (20) ساڵەی دوایدا جێگەیەکی تایبەتیان هەبووە.

زانیارییەکانی لەبارەی ئەمریکاو وردبینییەکانی کە هاوکات دیدێکی رەخنەگرانە بوو بۆ سیستمێکی یاسایی ویلایەتو نەتەوەییەکانی ئێمە، بەتوندی کاری تێکردم. بەجۆرێك کە هەستم کرد دەبێ زانیارییەکانی لەسەرچاوە ناوخۆییەکانەوە بەدەستهێنابێت، بەڵام بەراستی زانیارییەکانی هەر لە ئەمریکادا قەتیس ناخوات، بەڵکو سەرتاسەری ئەوروپای لەخۆگرتووە. کاتێك کە قسە لەسەر گەرمییەکەی -سۆشیالیزم- دەکرێت، ناکەوێتە روئیای میلۆدراماتیکییەوە کە بەشێوەیەکی گشتی دەدرێتەپاڵ ئەو. بەڵام سەبارەت بەپرۆژە یۆتۆپیاییەکانی خۆی کە (رزگارکردنی نەژادی مرۆڤ)ە بەسەرنجراکێشانو شێلگیرییەکی تایبەتییەوە (کە بەڵگەیە لەسەر ریالیستێتی تیۆرەکەی ئەو، ئەگەر لەم سەدەیەشدا نەبێت، لایەنی کەم لەسەدەی ئایندەدایە) درێژەی پێدەدات.

رەنگە، دکتۆر کارل مارکس لەئەمریکا وەك نوسەری (کاپیتاڵ)و بنیاتنەری (کۆمەڵگای ئینتەرناسیۆنال) بناسن، لەو وتوێژەی لەژێرەوەدا دێت، تۆ دەبینیت ئەو لە (کۆمەڵگا)ی ئێستا دەدوێت.

تا ئەو کاتەی دیدارەکەم لەگەڵ کارل مارکسدا دەستی پێکرد، خۆم بە راپۆرتی رەسمی (پلیت فۆرم)ی (بانکرانت دیڤیس)ی ساڵی (1877)وە سەرقاڵ کرد، کە بەتێروانینی من روونترینو کورتترین مانفێستی سۆشیالیستییە کە بینیومە. مارکس وتی کە ئەوەی لەراپۆرتی کۆمەڵەی سۆشیالیستەکانی گۆتا، لەئەڵمانیا لەساڵی (1875)دا بەدەستهێناوە. بەوتەی ئەو، وەرگێرانی ئەم راپۆرتە هەڵەبووەو ئەو راستیکردۆتەوە کە من راستکراوەی ئەم دەقە دەهێنمەوە:

1- مافی دەنگدانی راستەوخۆ، نهێنیانەو جیهانیانە بۆ تەواوی پیاوانی سەروو (20) ساڵ بۆ تەواوی هەڵبژاردنەکان بەشارەوانیو دەوڵەتەوە.

2- یاسادانانی راستەوخۆ لەلایەن خەڵکەوە، شەرو ئاشتی بەدەنگی راستەوخۆی خەڵك.

3- هەڵوەشاندنەوەی سوپای یەدەگ.

4–هەڵوەشـاندنەوەی تـەواوی یاسـاو بڕیـارە تایبەتییەکانی پەیوەندیدار بەیاساکانی چاپەمەنیو کۆبوونەوەی گشتی.

5–چارەسەری جیهانی.

6– فێرکردنی خۆڕاییو گشتی، ئازادی زانستو ئایین.

7–لابردنـی سـەرجەم باجـە ناڕاسـتەوخۆکان. بودجـەی دەوڵـەتو شـارەوانی بـەهۆی بـاج لەسـەر داهاتی ڕاستەوخۆو پێشکەوتووەوە دابین بکرێت.

8–ئـازادی بەشـداریکردن لـەنێوان چـینە کرێکارییەکاندا.

9–ناسـاندنی ڕۆژی یاسـای کـار. سـنوردارکردنی کاری ژنانو هەڵوەشاندنەوەی کاری منداڵان.

10–یاسا تەندروستییەکان بۆ پشتیوانی لەژیانو تەندروستی کرێکاران.

11–بڕیارگـەلێکی گونجـاو بەرەچـاوکردنی کـار لەزیندانەکاندا.

لـە ڕاپـۆرتی (بانکرافـت دیڤـیس)دا، بڕگـەی دوانزدەهەم کە گرنگترین بەش–ی بوو، هاتووە کە: ((کۆمەڵـە دەوڵـەتیو ئیعتبارییـەکان بـۆ کۆمـەڵگا پیشەسازییەکان بۆ پشتیوانی دیموکراسیانە). من لـە دکتـۆر کـارل مارکسم پرسـی کـە بۆچـی ئـەو ئـەم بڕگەیەکی لابردووەو ئەو وەڵامی دایەوە: (کاتێك کە یەکێتییەك لە گۆتا لە ساڵی 1875دا پێکهات، لەناو سۆشـیالدیموکراتەکاندا دووبـەرەکی هـەبوو. باڵێـك لایـەنگری (لاسـال) بـوو و باڵەکـەیتر سـەرجەم بەرنامەی ڕێکخراوی (ئەنتەرناسیۆنال) یان پەسـەند کردبـوو و بـە حیزبـی (ئـەیزانخ) نـاونران. بڕگـەی دوانزەهەم لە (پلێت فۆرم) دا نـەبوو، بـەڵام لەلایـەن پـاوەنخوازانو لایـەنگرانی (لاسـال) لەپێشـەکیدا دانـرا. دوای ئـەوە، هـەرگیز قسـەی لەسـەرنەکرا. مسـتەر دیڤـیس ناڵێـت ئـەو بڕگەیـەی وەك ئاشـتبوونەوەیەك کـە گرنگییـەکی تایبەتیشـی نییـە لەبەرنامەکـەدا خزێنـدراوە، بـەڵام ئـەوی وەك یـەکێك لـەگرنگترین ڕێبـازی بەرنامەکـە تێخزاند.

من وتم: (بەڵام سۆشیالیستەکان بەگشتی وەك لوتکەی بزووتنەوەکە دەنۆڕنە گواستنەوەی ئامرازی کار بۆ موڵکایەتی گشتی کۆمەڵگا).

بەڵـێ، ئێمـە دەڵـێین کـە ئەمـە بەرهـەمی بزووتنەوەکە دەبێت، بەڵام ئەمە بۆ کات، فێرکردنو ئەو ناوەندانـەی پێگـەی کۆمەڵایـەتی باڵایـان هەیـە" دەگەڕێتەوە.

من وەبیرم هێنایـەوە کـە ئـەم ڕاپۆرتـە ڕەسمییـە (پلێت فۆرمە) تەنها بۆ ئەڵمانیاو یەك یا دوو وڵاتی تر کارایە.

ئـەو وەڵامـی دایـەوە: ئـەها! ئەگـەر تـۆ ئەنجامەکەتان لەشتێکی جگە لەمەوە وەردەگریت، ئـەوا (دەبـێ بڵـێم) تـۆ شـتێکی ئـەوتۆ لەهەڵسـوڕانی حیزبی نازانیت.

زۆرێـك لـەم ماددانـە لـەدەرەوەی ئـەڵمانیادا، گرنگیـان نییـە. ئیسـپانیا، ڕووسـیا، بـەریتانیاو ئـەمریکا بـەگونجان لەگـەڵ کێشـەکانی خۆیانـدا، ڕاپـۆرتی ڕەسمـی (پلێـت فۆرم)یـان هەیـە. تـەنها بابـەتی هاوشـێوەی نێوانیـان، ئامانجێکـە کـە دەبـێ وەدەست بهێنرێت.

***ئەوەش فەرمانڕەوایی کرێکارە؟**

– ئەوە ڕزگاربوونی کرێکارە.

***ئایا سۆشیالیستە ئەوروپییەکان وەك بزووتنەوەیەکی زۆر شێلگیرانە دەنۆڕنە بزووتنەوەی ئەمریکا؟**

-بەڵێ، ئەوە دەرئەنجامی سروشتی گەشەی وڵاتە. دەوترێت کە بزووتنەوەکە لەلایەن بیانییەکانەوە هێنراوە. پەنجا ساڵ لەمەوپێش کاتێك بزووتنەوە کرێکارییەکان لەبەریتانیا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا، هەمان ئەو شتگەلانە دەوتران و ئەوەش زۆر بەرلەوەبوو کە قسە لەسۆشیالیزم بکرێت. لەساڵی (1857) لەئەمریکا، تەنها بزووتنەوەی کرێکارییە کە بەرچاو دەکەوێت. یەکەمجار یەکێتییە بازرگانییەکان گەشەی کرد، دوای ئەوە کۆمەڵە بازرگانییەکان پێکهاتن کە تیایدا کرێکارانی پیشەسازییە جۆربەجۆرەکان یەکیانگرت و دوای ئەوە یەکێتییەکانی کاری میللی پێکهێنرا. ئەگەر تۆ لەم پرۆسیسی پێشکەوتنەکە بکۆڵیتەوە، دەبینیت کە سۆشیالیزم لەو وڵاتەدا بەبێ یارمەتی بیانییەکان هاتەئاراو لەبنەڕەتیشدا فاکتەرەکەی چڕبوونەوەی سەرمایەو پەیوەندییە گۆڕاوەکانی نێوان کرێکاران و خاوەنکارەکان بووە).

***کەوابوو تاهەنوکە سۆشیالیزم چ کاریگەری ئەنجام داوە؟**

-دوو شت. سۆشیالیستەکان بزووتنەوەی جیهانی نێوان کارو سەرمایە لەیەك وشەدا جیاکردنەوەی جیهانیان نیشانداو سەرئەنجام هەوڵیانداوە کە تێگەیشتنێك لەنێوان کرێکاران و وڵاتە جۆربەجۆرەکاندا دروست بکەن کە ئەم کارە هاوکاتە لەگەڵ ئەوەی کە سەرمایەداران لەخستنەکاری وزەی کاردا جیهانیتر کاردەکەن و سود لە وزە بیانییەکان وەردەگرن دژ بەکرێکارانی خۆماڵی و نەك تەنها لەئەمریکا، بەڵکو لەبەریتانیا، فەرەنساو ئەڵمانیاشدا. زۆر بەزەرووری دێتە بەرچاو ئەو پەیوەندییە نێودەوڵەتیانەی کە کاتێك لەنێوان کرێکارانی سێ وڵاتی جۆراوجۆردا دروست بوو، دەریخست کە سۆشیالیزم لەبنەڕەتدا کێشەیەکی لۆکاڵی نییە بەڵکو مەسەلەیەکی نێودەوڵەتییە کە لەلایەن کاردانەوە نێودەوڵەتییەکانی کرێکارانەوە چارەسەر دەبێت. چینەکانی کرێکار هاوکات دەبزوێن، بەبێ ئەوەی کە بزانن کۆتایی بزووتنەوەکە چی دەبێت. سۆشیالیستەکان بزووتنەوەکە ناخولقێنن، بەڵکو لەبنەڕەتیدا بەکرێکارەکان دەڵێن خەسڵەتی بزووتنەوەکە چییەو کۆتاییەکەشی چی دەبێت، دیارە بزووتنەوە چییەو کۆتاییەکەشی چی دەبێت.

***بەمانای سەرەنگونکردنی سیستەمی هەنوکەی کۆمەڵایەتییە؟**

-ئێمە دەڵێین ئەم سیستەمەی زەوی و سەرمایەی بەدەستی خاوەنکارەوە لەلایەکەوەو هێزی کار بەدەستی کرێکاراندا بۆ فرۆشی کاڵایەك لەلایەکی ترەوە" قۆناغێکی مێژووییە کە تێدەپەڕێت و بەهەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی باڵاتر دەگات. ئێمە لەهەموو شوێنێك، کۆمەڵگایەکی دابەشکراو دەبینین.

دژایەتی دوو چین هاوکات لەگەڵ گەشەی سەرچاوە پیشەسازییەکانی وڵاتانی مۆدێرندا بەرەوپێش دەچێت. لەڕوانگەی سۆشیالیستییەوە بەنزیکەیی ئامرازەکانی شۆڕشکردن، قۆناغێکی مێژوویی هەنوکەیی هەیە. لەزۆربەی وڵاتان بەهۆی یەکێتییە بازرگانییەکانەوە، ڕێکخراوە سیاسییەکان دروست کراون. لەئەمریکا پێویستبوونی حیزبێکی سەربەخۆی کرێکاریی وەدەرکەوتووە. ئەوان ئیتر

لەمە زیاتر ناتوانن متمانەیان بەسیاسەتمەداران هەبێت. زنجیرەو کۆبوونەوەو کۆڕەکان، یاسادانانی ئەوێیان بەدەستەوە گرتووەو سیاسەت بۆتە بازرگانی. بەڵام ئەمریکا لەم بوارەدا تەنها نییەو تەنها خەڵکی ئەوێ شێلگیرترن لەئەوروپییەکان. لەوێ دووڕوویی‌و درۆکردن کەمتر لەم لایەنەوەیە.

من لێم پرسی هۆکاری گەشەی خێرای حیزبی سۆشیالیست لەئەڵمانیا چییە، ئەو وەڵامی دایەوە: ((حیزبی نوێی سۆشیالیست (ئەڵمانیا) دوای دامەزراندنی حیزبە سۆشیالیستەکانی‌تر فۆرمەڵە بوو. ئەوان بەدوای پرۆژەگەلێکی یۆتۆپیاییەوە نین کە لەبەریتانیاو فەرەنسادا هەیە. ئەڵمانییەکان زیاتر لەهەوڵی تیۆریزەکردندان.

ئەڵمانییەکان لەئەزموونەکانی پێشووی خۆیانەوە لەوەگەیشتن کە بەکردەوە کارەکانیان ببەنەپێشەوە.

ئەم سیستەمە سەرمایەدارییە مۆدێرنە لەئەڵمانیا بەبەراورد لەگەڵ وڵاتەکانی تردا تازەو نوێیە. ئەوان بەگشتی لەدەستپێکی گەشەی پیشەسازی مۆدێرنەوە، حیزبێکی سەربەخۆیان پێکهێنا. ئەوان نوێنەرانی خۆشیان لەپەرلەمانی ئەڵمانیادا هەیە.

لەوێدا هیچ حیزبێک کە ئۆپۆزسیۆنی سیاسەتەکانی دەوڵەت بێت" نەبوو. و ئەم (ئۆپۆزسیۆنە) کەوتە ئەستۆی ئەوانەوە. پێکهێنانی حیزب و کاریگەردانانی، ماوەیەکی زۆر درێژە دەکێشێت، بەڵام من دەبێ ئەمە بڵێم کە ئەگەر چینی ناوەندی ئەڵمانیا، دانیشتوانێکی زۆریان لەناوخۆیاندا نەبێت، ئەو شتەی کە ئەوان لەچینەکانی ناوەندی ئەمریکاو بەریتانیا جیاکاتەوە، لەم بارەدا تەواوی کارە سیاسییەکانی دژ بەدەوڵەت دەبوایە ئەوان (حیزبی سۆشیالیست) ئەنجامیان بدایە)).

من دەربارەی گەشەی کەمی لایەنگرانی (لاسال) لەڕیزە (ئینتەرناسیۆنالەکان)دا لێم پرسی.

ئەو وتی: (حیزبی لاسال بوونی نییە هەڵبەتە، ژمارەیەک لایەنگر لەڕیزەکانی ئێمەدا هەیە، بەڵام ژمارەیان زۆر کەمە. لاسال بنەما هەمەکییەکانی دەستەبەرکردبوو.

کاتێک لاسال، ئەو جوڵانەوە دواکەوتووەی ساڵی (1848)ی دەستپێکرد، ئەو گومانەی لادروست بوو کە دەتوانێ بزووتنەوەیەک بەهاوکاری کرێکارانی یەکە پیشەسازییەکان بەتەواوەتی ببوژێنێتەوە. ئەوان بڕێک گێرەشێوێنیان کرد. ئەو خۆی ئامانجی کۆتایی بزووتنەوەکەی دەزانی. من لەم بوارەدا نامەی ئەوم لایە).

***تۆ ئەوت بە ئاسۆی متمانە ناو برد؟**

–(بەڵێ). ئەو چوو بۆلای بسمارک‌و پێی گوت کە چ پرۆژەگەلێکت هەیەو بسمارکیش بەهەموو شێوەیەک ئەوی هاندا.

***ئامانجی ئەو چی بوو؟**

–ئەو دەیویست کە سود لەچینی کرێکار وەربگرێت دژبە چینی ناوەند کە ببوونەهۆکاری کێشەکانی ساڵی (1848).

*** ئاغای دکتۆر، دەوترێ کە ئێوە سەرۆک‌و پێشڕەوی سۆشیالیزمن، و لەڤێلاکەتانەوە لێرە تەواوی ئەو ئەنجومەن و شۆڕشانەی کە بەردەوامن" کۆنترۆڵ دەکەیت. لەمبارەیەوە چی دەڵێیت؟**

–پیرەی کۆنەکار بزەیەکی کرد "من ئەوە دەزانم. زۆر ئازاردەرە. لەگەڵ ئەمەشدا رووخسارێکی کۆمیدیشی هەیە. نزیکەی دوومانگ بەرلە هەوڵەکانی (هۆدڵ)، بسمارك لەرۆژنامەی (نۆرس جێرمان)ی خۆیدا بانگەشەی کرد کە من لە گرووپی (فادربیك)دا رێبەری بزووتنەوەی جولەکە بووم و ئێمە بەدوای ئەوەوە بوین کە بزووتنەوەی سۆشیالیست بەجۆرێك بپارێزین کە ئەو نەتوانێ کاری پێوە بکات".

***بەلام کۆمەڵگای ئینتەرناسیۆنالیزمەکەی تۆ، رێبەری بزووتنەوە دەکات؟**

– ئینتەرناسیۆنالیزم سوودمەندبوونی لەدەستداوەو ئیتر بوونی نییە. ئەو کاتەی کە هەبوو، رێبەری بزووتنەوەکەی دەکرد، بەلام لەم سالانەی دوایدا گەشەی سۆشیالیزم ئەوەندە زۆر بووە کە ئیتر پێویستی بەبوونی ئینتەرناسیۆنالیزم نییە. رۆژنامەکان لە ولاتە جۆرەبەجۆرەکاندا دەست بەکاربوون. ئەوان هەمیشە لەمامەڵەدان. ئەمە تەنها رێگای پەیوەندی حیزبەکانە لەگەڵ یەکتردا لە ولاتە جۆربەجۆرەکاندا. فەلسەفەی بوونی ئینتەرناسیۆنالیزم ، بەپلەی یەکەم ئەمە بوو کە کرێکاران لەیەکتر نزیك بکەنەوەو بەرژەوەندی کاریگەردانانی رێکخراو لەنێوان نەتەوە جۆربەجۆرەکاندا نیشانبدەن. بەرژەوەندییەکانی هەر حیزبێك لە ولاتە جۆربەجۆرەکاندا، هاوشێوەی یەکتر نییە. ئەوەی رۆحی (نێودەولەتیخوازەکان) لە لەندەندا هەیە، تەنها داهێنانێکی خودییە (زەینییە). ئەوە راستە کاتێك کە لەسەرەتادا رێکخراوی (نێودەولەتیخوازان) پێکهات، ئێمە رێنمایمان بە ئەنجومەنە بیانییەکان دەدا. ئێمە ناچاربووین کە هەندێ لە ئەنجومەنەکان لەنیویۆرك کە لەنێوانیاندا (مادام ڤۆدهال) بەناوبانگ بوو، جیابکەینەوە. ئەوە لە سالی (1871)دا بوو. لەئەمریکا چەندین سیاسەتمەداری ئەمریکی هەن – کە نامەوێت ناویان بهێنم– حەز دەکەن لە بزووتنەوەکەدا بەشداری بکەن. ئەوان لای سۆشیالیستە ئەمریکییەکانەوە بەتەواوەتی ناسراون).

***دکتۆر مارکس، لایەنگرانتان بەتوندی دژ بە ئایین دەدوێن، بێگومان تۆ حەز دەکەیت کە گشت سیستەمەکە (ئێستا) لەرەگ وریشەوە لەناوببرێت.**

ئەو دوای ساتێك رامان، وەلامی دایەوە: (ئێمە دەزانین کە هەنگاوی توندوتیژی دژ بە ئایین، بێسوودە. بەلام ئەمە دیدگایەکە کە هاوکات لەگەڵ گەشەی سۆشیالیزمدا ئایینیش بەپەراوێز دەبێت. پەراوێزبوونی دەبێ لەگەڵ گەشەی کۆمەلایەتیدا رووبدات کە تیایدا پێویستە فێرکردن رۆلێکی گرنگ بگێرێت.

- **تۆ جۆزیف کۆك دەناسی..؟**

–ناویم بیستووە، ئەو کەسێکە کە سەبارەت بەمەسەلەی سۆشیالیزم زانیاری نادروستی هەیە؟.

*** ئەو لە وتارێژییەکدا کە لەم دواییەدا رەخساندوییەتی، وتویەتی "کارل مارکس هەوڵیداوە بەوتنی ئەوەی کە ریفۆرمی کرێکاری لەئەمریکا، بەریتانیای مەزن و رەنگە فەرەنساش بەبێ شۆرشی خوێناوی بێت، بەلام لەئەلمانیا، رووسیا، ئیتالیا و نەمسا ئەم هەنگاوە خوێنرێژی لەگەلدا دەبێت" متمانەیەك بەدەست بهێنێت".

دکتـۆر بەزەردەخەنەیەکـەوە وەبیریهێنایـەوە: هیچ سۆشیالیستێك پێویستی بەم پێشبینییە نییە کـە شـۆڕش لەڕووسـیا، ئـەڵمانیا، نەمسـاو ڕەنگـە لـەئیتاڵیا شۆڕشـێکی خوێنـاوی دەبێـت. جـولآنی شۆڕشـی فەرەنسـا لـەو ولآتانـەدا ڕەنگـە دووبـارە ڕووبـدات. ئەمـە بـۆ هـەر خوێنـدکارێکی سیاسـی" ئاشـکرایە. بـەڵام ئـەو شۆڕشـانە لەلایـەن زۆرینـەوە ڕوودەدات. هـیچ حیزبێـك ناتوانێـت شـۆڕش بکـات، مەگەر نەتەوەیەك.

مـن وەبـیرم هێنایـەوە" جۆزیـف کـوك بەشـێکی ئەو نامـەی دەرهێنـاوە کـە گوایـە ئێوە بـۆ کۆمۆنـەی پـاریس لەسـاڵی (1871)دا نوسـیوتانە، کـە تیایـدا هاتووە: ئێمە هەنوکە (30) ملیـۆن کەسین. لـە (20) ساڵی ئاینـدەدا ڕەنگـە لـەنێوان (50 تـا 100) ملیـۆن بین. لەو بارەدا تەواوی دنیا دەبێتە هی ئێمەو تـەنها پـاریس، لیـۆن، مارسـێل کـە دژ بەسـەرمایەی گـەوج ڕاپـەڕیون" بەتـەنیا نابێـت. بـەڵکو بـەرلین، مـونیخ، دۆرسدن، لەنـدەن، لیڤـەرپوڵ، مانچسـتەر، برۆکسل، سـان پـترس بـۆرگ (لینینگـراد —و.ك)، نیویـۆرك، بەشـێوەیەکی کـورت هـەموو دنیـا پێـوەی وابەسـتە دەبێت. بەر لەم ڕاپەڕینە نوێیە، کە مێژوو لەیادی نییـە، ڕابـردوو وەك کابوسـێکی نهێنـی ون دەبێـت" ئـاگری تـوڕەیی خـەڵك هاوکات لـە (100) شـوێنەوە بڵێسـە دەکـات کـە تەنانـەت یادەکانیشـیان لەناودەبات.

***دکتۆر ئایا تۆ جەخت لەم بابەتە دەکەیتەوە؟**

—مـن هـەرگیز وشـەیەکم دەربـارەی نەنوسـیوە. مـن هـەرگیز بابـەتێکی وا میلۆدرامـاتیکی بێسـوود نانووسـم. مـن سـەبارەت بـەوەی کـە دەینوسـم، زۆر ووردم. ئەوکاتـەی ئـەم نامەیـە بـەواژۆی مـن لـە فیگـارۆدا چـاپ کرابـوو. سـەدەها نامـەی وەك ئـەوە هەیـە. مـن لەهـەمان ئەوکاتـەدا بـۆ تـایمز لەنـدەن نوسیمو بانگەشـەم کـرد کـە ئەوانـە سـاختەن. ئەگـەر من ویستبێتم سەبارەت بەوەی کە بەناو و وتەی من بڵاودەکرێتەوە، بەدرۆ بخەمەوە، پێویستم بەچەندین خزمەتکار هەیە.

***بەڵام تۆ بۆ لایەنگریی لەکۆمۆنەی پـاریس، بابـەتت نوسیوە؟**

– بەدڵنیاییـەوە مـن ئـەم کـارەم کـردووەو بەسودی ئەوان بابەتم نوسی، بەڵام ڕۆژنامەنووسانی پاریسی لەڕۆژنامە ئینگلیزییەکاندا بەتەواوەتی ئەم کامڵییـەیان هەیـە تـا چـاپکراوە هەڵـەکان لەنوسـینەکاندا بەدرۆبخەنـەوە. کۆمۆنـە تـەنها نزیکـەی (60)کەسـیان کوشـت، مارشـال مـەك ماهـانو سـوپا تاوانکارەکـەی پـتر لـە (60) هـەزار کەسـیان کوشـت. هـیچ بزووتنەوەیـەك بەئەنـدازەی کۆمۆنـە بـەم شـێوەیە نەبۆتـە جێـی تۆمـەتو درۆ بـۆ هەڵبەستن.

***باشـە لـەم بـارەدا ئایـا هـەڵگرانی بـڕوای سۆشـیالیزم بـۆ جێبـەجێکردنی ڕێبازەکـەی، ڕوو ناکاتـە تیرۆرو خوێنڕێژی؟**

کـارل وەڵامـی دایـەوە: (هـیچ بزووتنەوەیـەکی مـەزن هـەرگیز بـەبێ خوێنڕێـژیی سـەرنەکەوتووە. سـەربەخۆی ئـەمریکا بەخوێنڕشـتن بەدەسـتهات، نـاپلیۆن فەرەنسـای لەڕێگـەی پرۆسـەی خوێنڕشتنەوە دیـل کـردو خـودی ئـەویش بەهـەمان ڕێبـاز لەناوچوو. ئیتاڵیـا، بـەریتانیا، ئـەڵمانیاو هـەر ولآتـێکیتر ئـەم بانگەشـەیە دەسـەلمێنێت، هـەروەها ئـەم کـارە بـۆ تیرۆریـش دەسـەلمێت). ئـەو درێـژەی پێدا: ئەمە شتێکی نوێ نییەو پێویست ناکات ئەوە

بڵێم. (ئاوریسین) هەوڵیدا ناپلیۆن بکوژێت، پادشایان بەرلەهەموو کەسانیتر خەڵکیان کوشتووە. ئەم کارانە بەرلە بەرهەمهێنانی سۆشیالیزم ئەنجام دراون‌و یا هەوڵ بۆ ئەنجامدانی دراوە. هەرچەندە کە لەئێستادا هەر هەوڵێك کە بەناوی پادشایەتی یا دەوڵەتەوە دەدرێت، دەدرێتە پاڵ سۆشیالیزم؟

***کە ئەو دەربارەی بسمارك چۆن بیردەکاتەوە؟.**

–ناپلیۆنیان تا کاتی شکستی، هەر بە بلیمەت دادەنا. دوای شکستخواردنی، بەگەمژە ناوزەدیان کرد. بسماركیش درێژە بەهەمان چارەنووسی ناپلیۆن دەدات. ئەو لەژێرناوی یەکێتیدا، دەستی بەتۆتالیتارێتی کرد. دواجولانی ئەو شتێك نییە جگە لەئەنجامدانی کودەتایەك، بەلام ئەویش شکست دەخوات. سۆشیالیستەکانی ئەڵمانیا بەئەندازەی سۆشیالیستەکانی فەرەنسا لەگەڵ جەنگی (1870) دا وەك جەنگێکی لەبنەچەدا پادشایی" ناکۆك بوون. ئەوان بەیاننامەی جۆراوجۆریان دەرکردو بەخەڵکی ئەڵمانیایان وت کە ئەگەر رێگە بدەن جەنگی بەرگری ئەوان وەرگۆڕێت بۆ جەنگێکی دەستدرێژیکەرانە، ڕووبەڕووی تۆتالیتارێتی سەربازی‌و سەرکوتکردنی بێبەزەییانەی چینە بەرهەمهێنەرەکان دەبنەوە. هەر لەبەر ئەمە حیزبی سۆشیال– دیموکراتی ئەڵمانیا بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتییەکی شەرافەتمەند لەگەڵ فەرەنسا کە کاتێك لەلایەن دەوڵەتی پروس‌و زۆربەی ڕێبەرە زیندانیکراوەکانەوە پشتیوانی لێدەکرا، کۆڕو کۆبوونەوەیان بەڕێوەبردو بەیاننامەیان بلاوکردەوە. تەنها نوێنەرانی ئەوان لە (رایشتاغ)ی ئەڵمانیادا بوو کە جورئەتی سەرپێچیان کرد لە بە پاشکۆبوونی ناچاریانەی پارێزگاکانی فەرەنسا.

هەرچەندە کە بسمارك سیاسەتەکانی بەزۆرەملێ دەبردەپێش‌و خەڵك لەبلیمەتی بسمارك دەدوان. ئەو جەنگە، شەڕێك بوو و کاتێك کە ئەو نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، ئایدیا سەرەتاییەکانی دەرکەوتن‌و نیشانیدا کە شکستی خواردووە. خەڵك متمانەیان بە ئەو لەدەست دەدەن. جەماوەریبوونی ئەو لەدەستدەچێت. ئەو و دەوڵەتی ئەڵمانیا پێویستیان بەدراو هەیە. ئەو لەژێر سایەی دەستوردا بۆ سوپاو پرۆژەگەلە یەکێتییەکانی، باجی خستەسەر خەڵك‌و لەژێر ئەم یاسایەدا، ئیتر زیاتر لەمە نەیدەتوانی باج وەربگرێت. هەنوکە ئەو بەبێ ئەم یاسایە بەدوای وەرگرتنی باجەوەیە. بەم هۆیەوە، ئەو ڕۆحی سۆشیالیزمی بەرز کردۆتەوەو بۆ بنیادنانی یەکێتییەکی مەزن، هەر کارێك کە لەتوانایدا بێت ئەنجامی دەدات.

***ئایا هەنوکە لەبەرلینەوە ڕاوێژ بەتۆ دەکرێت؟**

–بەڵێ، هاوڕێکانم من بەباشی ئاگادار دەکەنەوە. لەوێ هەلومەرجێکی ئارام هەیەو بسماركیش نائومێدە. ئەو (48) کەسی لەپیاوانی ناسراو و بەناوبانگ کە لەنێوانیاندا نوێنەرانی هاسلمەن و فەرتیچە و راکۆ، باومان و ئەدلەری تیادابوون، دوورخستۆتەوە. ئەو هەروەها دەیزانی کە (75) هەزار کرێکار لەشارەکەدان کە لە لێواری برسییەتیدان. ئەو دڵنیا بوو کە ئەم چینانە ڕاپەرین دەکەن‌و ئەمەش دەکرێ نیشانەیەك بێ بۆ کەرنەڤاڵی کوشتارو جینۆساید.

پاشان ئەم ڕووداوە دەکرێ بۆ گشت ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانیا بەرفرە

بکرێــت، تیــۆری خــوێن‌و ئاســنی ئــەو، دوای ئــــەوە دەتوانـــێ هەڵکشـــان‌و داکشـــانێکی تـــەواوی هـــەبێت و بـــاج وەرگرتنیشـــی بـــۆ هـــەموو بوارەکـــان گەشـــەپێدا. تـــا هەنوکـــە هـــیچ یەکێتییـــەکی مـــەزن ڕووی نـــەداوەو ئـــەو ئـــــــەمڕۆش لـــــــەبارودۆخێکی گێـــــــژاودا ڕاوەستاوە.

## سەرچاوە

سایتی/ انقلاب کمونیستی.

## تێبینی

بۆیەکـەمجار ئـەم گفتوگۆیـەی کـارل مـارکس، لـە ژمارەی رۆژی (5) کانوونی دووەمی 1879 لەرۆژنامەی (شیکاگۆ تریبۆن)دا بڵاوبۆتەوە.

# لە ئەدەبی گەلانەوە

- ئاسکەکە

بیرتن شولمان

لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

- ڕەنگە ببێت بە خوازبێنی

ئارسکینی کاڵدوێڵ

لە سویدییەوە: عەبدوڵا قادر دانساز

- چەند نامەیەك لە نیخیڵەوە

ڤیلاس سارانگ

لە ئینگلیزییەوە: تۆفیق عەبدول

# ئاسکەکە

## بێرتن شولمان

لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

بەرە بەیانەو کازیوەی دەدا، تەمی هێڵێکی سووربەوی سارد لە ئاسۆدا، هەوا شێدار.. واهی کە هەموو شتێك ئازارم بدات: دەستەکانم ئەو کاتەی کۆڵەپشتەکەم بەرز کردەوە، زەندەی دەستم کە چەقیبووە سەر تفەنگەکەی باوکم، ئەو تفەنگەی کە ڕەوای پێ دەکرد، ڕوومەتەکانم کە لە پاڵتۆکەی دەخشا. کاتێکی چ خەراپ بوو: مانگێك بوو لەسەر ئیش دەرکرابوو —

من لەو بەیانییەدا گەرەکم نەبوو لەگەڵ ئەودا بچمە ڕاو، بە تایبەتی لە دوای ئەو شتانەی کە شەوێك پێشووتر ڕوویاندا. بەڵام چووم.. چونکە لە دارستانەکاندا شتی وای فێر دەکردم کە زۆر بە کەڵکتر بوون لە هەر شتێکی دیکە کە لە شوێنانی تردا فێری دەبووم. سەبارەت بە ماسیگرتن، خێوەت داکوتان.. بگرە مانەوە و ژیان.

لە دوای ئێمەوە دەرگا تەلبەندەکە زرمەیەکی بەرزی لێ هەڵسا. من دەمزانی دایکم بە بێ دەنگی لەوێدا وەستاوە، نەمدەتوانی سەیری بکەم، چونکە ئەوەیان وای لێ دەکردم کە حەز بکەم باوکم بڕواو جێم بێڵێ. دەست لەسەر دەست دەموچاو گرژ و سارد.

لە پەنجەرەی (ماشێن)ەکەوە دووکەڵ دەهاتە ژووریٚ وایدەکرد بکۆکم، کە تۆزێك دوور کەوتینەوە جارێکی تر گوێم لە تەققەی دەرگاکە بۆوە. سەرم هەڵبڕی.. دایکە چوو بۆوە ژووریٚ.

شەوی پێشووتر باوکم پێی وتم — "من لە تەمەنی تۆدا بووم کە بۆ یەکەمجار منیان بردە ڕاوە ئاسك، لە ڕاستیدا تەمەنم چواردە ساڵ بوو، هەر لە هەمان شوێندا. تەنها ئەوەیە ئەوسا باخچە نەبوو."

جارێکیان بەیەکەوە چووینە "باخچەی رایمان" بۆ ماسیگرتن. ڕاوکردن قەدەغە بوو، بەلام ئەم بەو شێوەیە بۆمی شیکردەوە: لەو باخچەیەدا ژمارەیەکی زۆر لە ئاسك دەلەوەڕا. فەرمانبەرەکانی دەوڵەتی دەیانزانی، ژینگەپارێزان دەیانزانی، پاسەوانەکانی باخچەکە دەیانزانی،

بەلاّم لە ڕووی ڕەسمییەوە هیچیان نەکرد. هەر بۆیە لە وەرزی هەر زستانێکدا پاسەوانەکان خۆیان نەبان دەکرد. شتێك بوو هەر هەموو لایەك لەسەری ڕێك بوون.

دایکم کتلییەکی خستبووە سەر زۆپاکە.

"من پێم وتی من نامەوێ باوکت کاری وا بکات. ئەمەیان مەترسیدارە."

لەوەتەی دەرکرابوو.. هەموو ئێواران لە مووبەقەکەدا دادەنیشت و ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، بە دیار (بیرە) یەك و جگەرەیەکەوە، بێ ئەوەی زار هەڵبێنێ یان سەیری من یا وەخود دایکم بکات. وەك خووش بێ ئێمە سەیری ئەومان نەدەکرد. ئەو کاتەی دەیخواردەوە، وا چاك بوو لێی بگەڕێین.

"من نازانم تۆ بیر لە چی دەکەیتەوە و بە تەمای چیت. ئێرە "ئالاسکا"یەو نەك "ئەستۆریا". تۆ دەبێ بە دوای کارێکدا بگەڕێی، نەك بە تەنیا سەربڕینی ئاژەڵەکان."

لەرەلەری دەنگی دایکە شێتگیری دەکردم. باوکە سەیری دەستەکانی خۆی دەکرد، چەند جارێك دەیکردنەوە و دایدەخستنەوە.

"بۆچی دەتەوێ وای بنوێنی کە من گێژ و حۆڵ بەم ناوەدا دەسووڕێمەوە؟"

پاشان وتی — "من بە دوای ئیشدا گەڕاوم. تۆ دەزانی من گەڕاوم."

"لە ڕۆژنامەی ئەمڕۆدا شەش لاپەڕەی تیایە بۆ ئەوانەی بە دوای کاردا وێڵن. ڕۆژانی بێ کاری بەسەرچوو. ناکرێ بەم چکەچکەیە بژین"

من نەمدەزانی بۆچی وا هەنووکە سەری کرۆدتە سەری، لەو وەختەی کە دەخواتەوە، ڕووە و دەستشۆرەکە ملی نا، پشتی لە هەردووکمان کرد.

دایکە وتی — "من داوای کۆبونی خۆراکم کردووە." باوکە بە گرژییەوە سەیری کرد، کەمێك دەنگی بەرزکردەوە وەك ئەوەی دایکە لێی دوورکەوتبێتەوە.

"ئەوە تۆ دەڵێی چی؟"

دایکە هیچی نەوت، باوکە چاوەکانی خۆی هەڵگلۆفی.

"تۆ لە بەردەم کوڕەکەمدا چیم پێ دەڵێی؟"

دایکە وتی — "ئەو وەختە بەسەرچوو."

باوکە سوور هەڵگەڕا، پاشان وتی:

"ئێمە قسەمان لەسەر ئەوە کرد، لەسەر ئەوە ڕێکەوتین."

یەکە یەکە لە شتەکان ورد بوومەوە: مێزی فۆرمیکای خۆڵەمێشی، کورسییە قاچ کرۆمییەکان، بەفرخەرە سپییەکە، ڕاخەرە بێجییەکە، دەمویست بزانم هەریەکەیان لە خەیاڵی من چی دەنوێنێ، لە سەرووی دەستشۆرەکەوە پەنچەرەیەك بەسەر دیواری خانووەکەی ئەوبەرەوە کرابۆوە.

"کەس تۆی بینی؟"

دایکە وەلاّمی نەدایەوە.

ڕووەو ژووری میوان ملی نا. باوکە کەوتە دوای. پاشان کێشای بە پشتی سەریدا، وەك کەسێك بیەوێ مێشێك بکوژێ، هەرگیز نەمدیبوو باوکە ئاواهی دەست لە دایکە بکاتەوە، بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ، جووڵەیەکی کورت، بەلاّم ڕاستەقینە. ئەو زرمەیەی لەو لێدانەوە هات بێزەوەر بوو، بێ تام، کەللەسەری دایکە ڕاتەکی وەك سەری منالێك کە بەر لەوەی بگری بە ئاستەم ڕادەتەکێ. بەلاّم ئەوەیان بە تەنها هەڵەیەك بوو، هێدمە گرتی بوو، چونکە لەوە دەچوو ویستبێتی دەست بدا

لەسەری و بەس. بۆ ساتێك دەستی بە خۆیدا شۆڕ كـردەوە وەك ئـەوەی خۆزگـە بخـوازێ لێیبكەوێتـە خوارێ. دایكە نەگریا، بگرە ئاوڕیشی نەدایەوە. من بە چواردەوری خۆمدا بۆ شتێك دەگەڕام، دارێك یان هەتا كورسییەك، لە حاڵێكدا باوكە بۆ جاری دووەم پـەلاماری بداتــەوە. لـە نـاوەوە گـرێ گـرێ بـووم، نەمدەتوانی ڕووخساری ببینم، بەلاَم دەمزانی چاوە شــین و مەیلــە و خۆڵەمێشــییەكانی ســاردن وەك زسـتان. هــەر ڕێـی دەكـرد و نەدەوەسـتا. بـۆ كـوێ دەچێت.. بیرم لێ دەكردەوە.

باوكــە بەســـەرما قیژانـــدی –"چــییە لــەوێ وەسـتاوی.. شـتێك نییــە لـەوە باشـتر كـە بتـوانی بیكەیت؟"

نـاو ماشـێنەكە ساردبوو.. مـن هەڵدەلـەرزیم. چڕی ماشێنەكان ئێمەی بەسەر پردەكەوە وەستاند. ڕووخسـاری باوكـە وا ڕێ ڕێ ببـوو هـەر دەتـوت بـە دەمــەتیغێك بڕابــوون، ئـارام بـوو وەك كەسـێك كـە بەنگكێشان سستی كردبێ، هەرچەندە لەوە دەچوو لــە ژێــر سمێـڵ و ڕیشــەوە شــتێك بجوێـت. خــۆر هەڵكشــابوو، بــەلاَم كارگــەكان هێشــتا بــەڕووی ئاسمانــدا ڕەش دەچــوونەوە، بـە درێــژایی جـادە سەرەكیەكە ماشێنەكان ئەو بەیانییەیان پڕ دەكرد لە دووكـەڵ – ماشـێنێكی یـەكجار زۆر، لـە دواوە، لـە پێشـەوە. تراكتۆرێك بە عەرەبانەكەیـەوە قـەدبڕ ئـەو جادەیەی گرتبوو.

"تـف لـەو بەختـە." لـە ژێـر لێـوەوە بڵمانـدی. سـەیرێكی مـنی كـرد. دەم و چـاوی كشـا. "هــەرگیز لــەو شـوێنەدا نـابین كـە گەرەكمانـە." ئەمــەی وت. "قەت گەیشتووین بەو شوێنە؟" دەستی درێژ كرد، لــەوە دەچـوو بیــەوێت قــژم بــە دوادا بخـات بــەو شێوەیەبم كە ئـەم حـەزی پێدەكات. من ڕاچڵەكیم و كشامەوە. ڕووخساری سوور هەڵگەڕا.

مـن پـڕ ببـووم بـە چـەندەها هەسـت و نەسـتی تێكەڵ و ترسناك. دوور ڕوانیم و ریكلامێكی جگەرە سـەرنجی ڕاكێشام، زۆر گـەورە و بەرچاو كە بـانگی دەكـردی، ریكلامەكـە وێنـەی كچـێك بـوو، بـە جلـی حەمامــەوە، كـە دوو ڕەهەنـد و دیوبـوو، بـە ڕەنگـی شــین و پرتــەقاڵی ڕەنگرێــژ كرابــوو، سەروپرچــی كچەكە بە دوادا كەوتبوو، لێوەكانی لێكدی جودا و كراوە بە دەم جۆرە خەندەیەكەوە كە من لـە ژیـانی ڕاستەقینەشدا كچانێكی وا دەم بە خەنـدەم هـەرگیز نەدیبوو. جولاَین.. ماشێنەكە ڕووناكی تێرژاو خۆرم بـینی كـە لـە پشـت كۆگـا و عەمبارەكانــەوە بــەرز دەبـــۆوە، خۆرەكــــە پرتــــەقاڵی دەینوانـــد وەك هێلكەیەكی بۆگەن كردوو.

ئەو شەوە خەونەكانم پڕ بوون لە هەراو دەنگ، هــات و هــاوار، زرم و كــوتی لێــدان. بــەلاَم لــە بەرەبەیاندا خۆم لە ژوورێكدا دیتـەوە كە پڕبوو لە ڕۆشـنایی كـاڵ و تـەنكی پـاش نیـوەڕۆ. هەسـتم بـە گۆشەی لە (سەتن) دووراوی بەتانییەكە كرد لەسـەر لێوم. من گرانەتام بوو، دەستی بـاوكم بەتانییەكـەی ســەرمی چــێ دەكـرد و پاشـان دەسـتی بەسـەرمدا هێنا. تەمەنم لە پێنج ساڵ پتر نەبوو. كە لە خەوەكە وەئاگا هاتم، پتر لە بیرەوەری دەچوو، نـەك خـەونێك. بەلاَم نەمدەتوانی جێی بكەمەوە. لە ڕاستی دەچوو، بەلاَم من بڕوام پێ نەدەكرد.

ســـەرەتا خۆڵەمێشـــی، پاشـــان هـــەتاوێكی پرتەقاڵی لە نێوان درەختەكانەوە دادەڕژا ئەو كاتەی ئێمـە گەیشـتینە نـاو باخچـەكە، بـەلاَم لـە پشـت ئـەو باخچەیەوە هەوران لێكیان دەخوڕی. كۆتایی وەرزی

گەلاڕێزان بوو، بەلاّم هێشتا گەلاّ بە درەختەکانەوە دەشنانەوە، بەلاّم ئەوەندەش زۆر نا، ئێستاکە هەواکەی خۆش و فێنك بوو، بەس سارد نەبوو، هەوایەك پڕ لە شیّ.

یەك سەعات سووڕاینەوە بە پیّ بەرلەوەی هیچ شتێك ببینین، بە چواردەوری دەریاچەیەکدا ڕێی خۆمان کردەوە کە بە ڕەنگێکی زیوین لە نێو درەختەکانەوە باق و بریق دەبریسکایەوە. خۆر ڕێی خۆش کرد بۆ تەمومژێکی سارد و ئاوس بە شەونم.

لە ناکاو باوکم وەستا و گوێی هەڵخست. لە شوێنێکەوە قرچە قرچی تێکشکانی شتێك بە نەرمی دەهاتە بەرگویّ. باوکە ئاماژەی بۆ خوارەوە کرد کە چاڵێکی لێبوو:

"ئەوەتا لەوێیە."

تفەنگەکە چووە سەرشانی. من دووربینەکەم بەرز کردەوە و تێمڕوانی: من تێنەدەگەیشتم کە چۆن گیانلەبەرێکی وا زل و کێوی" بەڕەڵلاّ و بە کەیفی خۆی دەسووڕێتەوە، کە لەشێکی گەورە، جوان، ماسولکەدار، چاوەکانی پڕ لە ژیان و هێمنی. دووربینەکەم نزم کردەوە و سەیری باوکەم کرد کە دەهات قۆناغەی تفەنگەکەی خوار دەکردەوە، پاشان هەر بە دووربینەکە لەو ئاسکە ڕادەمام کە باوکە دەیویست نیشانەی لیّ بگرێتەوە.

باسکەکانم هەڵبڕی و هاوارم کرد — "هاە ە ە ە!" دەستەکانم هەڵدەشەقاند. بە دەم ڕاوەشاندنێکی کلکەکەیەوە ئاسکەکە تێی تەقاند. باوکە تفەنگەکەی داگرت.

پێی وتم:

"ئەوە چییە.. شێت بوویت؟"

من هەوڵمدا چاوەکانم چڕی بەردیان هەبێت. پاشان ڕووەو زورگ و گردەکان غارمدا. بەهەر چواردەورمەوە گەلاّکان هەڵدەفڕین و بلاّودەبوونەوە، گوێم لە باوکە بوو کە دەیقیڕاند:

"هێی..! ئەوە تۆ چ بەلاّتە؟"

لە دوامەوە گوێم لە هانکەهانکی هەناسەی بوو، تەپە تەپی هەنگاوەکانی، نەفرەت و جنێوەکانی. لە تەنها خولەکێکدا گەیشتمە سەر ترۆپی یەکێك لە گردەکان و بەودیودا غل بوومەوە تاوەکو دوا شت کە گوێبیستی بووم هانکەهانکی هەناسەی خۆم و ترپەی دڵم و خشە و قرچەی گەلاّکان بوو.

تەمەکە دەڕژایە ناو لق و پۆپی درەختەکانەوە، هێدی و لەسەرخۆ وەك کولووە بەفری وردورد، هەروەك بڵێی شوێنەکە سیحراوی بووبێت. هەڵدەلەرزیم و هیچم پیّ نەدەکرا.

گوێم لە شەقژنی گوللەیەك بوو. من تیا مابووم.. نەمدەزانی ئاخۆ باوکە بە دوای مندا دێت یان لە خوارەوە و لای ماشێنەکە تەنها چاوەڕیّ دەکات. یاخود دەڕوات و بەجێم دێڵێت. بە جۆرێك لە جۆرەکان خۆزگەم بوو بڕواتەوە، سەرسامی ئەوە بووم گەر وای بکردایە، ئاخۆ دایکە چی دەڵێت گەر باوکە بیّ من بگاتەوە ماڵیّ. من دەمزانی کە باوکە ئەسپسوارەکانی دەوڵەت بانگ ناکات لە ترسی ئەو ڕاوە.

لە دواوە دارستانەکە داخرابوو، سەرتاپای قاوەیی و خۆڵەمێشی درەختەکانیش تاریك و تەڕ. دەستم کێشا بە یەکێك لەو درەختانەدا تەنها بۆ ئەوەی هەستی پێبکەم" ئەو دەنگە کتومت لەو

دەنگە دەچوو کە باوکە دەستی ڕادەوەشاند و بەرسەری دایکە دەکەوت. منی سڕ کرد.

دوای چەند چرکەیەك کەوتمەوە ڕێ. سەرسامی ئەوە بووم ئەو دارستانە چەندە قووڵە و چەند فراوان. دەمزانی کە لە لایەکەوە ڕێییەکی سەرەکی هەیە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە دارستانەکە، لەوە دەچوو، درێژ بێتەوە تا دەگاتەوە بە (کەنەدا). لەوەدا بوو بمتوانیایە بۆ خۆراك بگەڕێم، تەل و قولاپێك دروست بکەم و ماسی ڕاوبکەم. ئاخر من زۆر جاران لەناو دارستان مابوومەوە، بۆیە کەسێکی بێدەسەڵات نەبووم. من لەرزیم و هەوڵمدا بیری لێ نەکەمەوە.

دارستانەکە پڕ بوو لە باڵندە، جۆرەها باڵندە کە من حەزم پێیان دەکرد، دەیەها بۆقژی بۆر کە کردبوویان بە قرتەقرت و لە نێو گەڵا مردووەکاندا شتیان هەڵدەگرتەوە. پاشان لە بەردەمی مندا بازێکی کلك قاوەیی بەسەر زەوییەکی ڕووتەنی و درەخت تیا بڕاودا دەخولایەوە. بازەکە وەها لەسەرخۆ دەخولایەوە و بازنەی وا گەورەی دروست دەکرد کە من نەمدەتوانی بزانم دواجار بە کام لادا ڕووە و ئاسمان هەڵدەفڕێت، دەبوو بۆ ماوەیەك سەیری بکەم کە دەخولایەوە، ئەگینا دەبوو منیش لەو ناوە بخولێمەوە و خۆم بدەم بە داروبەردا، بە هێواشی ڕێم کرد و لەو بازە ڕادەمام کە دەردەکەوت و بزر دەبوو.

باران دایکرد، ئان و سات، دڵۆپەکان درشت و زەوی کوت، سووکە دەنگێك بوو کە دەیدا لە گەڵاکان، مردووتر بەسەر لقەکاندا کە دایدەکرد. دایکە لێوەکانی تەنکن و ڕێ ڕێی باریك بەسەر ئەو لێوانەیەوە هەر لەوە دەچوو وروشابن، چاوەکانی بۆ هەمیشە چکۆلە بوون، شین و پڕ بریسکەی پۆلایین، دەتوت لەسەر شانەکانتەوە دەڕوانێتە شوێنێك، هەردوو باسکی لێك دەئالاند و دەیخستنە سەر سینەی هەروەکو ئەوەی دڵی خۆی هەڵگرتبێت یان لە تۆی دوور بخاتەوە.

کە سەرم هەڵبڕی بازەکە بزر ببوو، دەبوو دوای نێچیرێك کەوتبێت. منیش بۆ دۆزینەوەی نیشانێکی باوکم بە ناو دارستانەکەدا دەگەڕام و دەمڕوانی. من وێنەیەکی خۆم لە خەیاڵدا بوو کە بەرزهەڵدەفڕی، کە ویستی وەك بازەکە بقیژێنێت. شتێك لە دوامەوە دەجوولاً من بەو ناوەدا هەر دەگەڕام و دەسووڕام، لە چینی چڕی درەختەکان و گەڵا مردووەکانم دەڕوانی. دڵم توند و بەزەبر لێیدەدا، تا دەهات درەختەکان منیان دەشاردەوە و دارستانەکەش خۆی دادەخست، هەستم دەکرد باوکم لە هەموو شوێنێکدا ئامادەیە، لە پشت درەختەکانەوە لەناو لێزمەی باراندا. من شڵەژاو و پەشۆکاو بووم. هەموو ئەوەی کە دەمزانی ئەوە بوو کە دەمتوانی بەو ڕێگەیەدا بگەڕێمەوە کە لێوەی هاتبووم- دیسانەوە کەوتمە ڕاکردن.

کەوتمە سەر ڕێگەیەکی چۆل، لە پێچێکدا پارچە حەسیرێکی تەخت و ڕەشباوم بینی کە باران بەسەریدا دایدەکرد و بە قەراغەکانیدا دادەڕژایەوە. هەناسەبڕکێم پێکەوتبوو، ئاودامان ئاوم لێ دەچۆڕا دڵنیانەبووم کە چوونەوە سەر ئەو ڕێگەیە باشە یان خەراپ، بەڵام گوێم پێنەدا چونکە وام هەست دەکرد کە ئەو دارستانە پڕە لە سیحر و جادوو. لەوە دەچوو سەعاتێك تێپەڕیبێت و کەچی من کەسم نەبینی.

بە دەوری پێچێکی زۆر ڕکدا ڕامکرد و هەروەك تارمایی و خێوێك لە ناکاو دەربکەوێت، کچێکم بینی، بە خۆی و قژێکی خورمایی تۆخ و دوو چاوی گەورە و ڕوونەوە بازنەیی کە یەکاندەردوو لەبەر دەممدا قوت بۆوە. وا بە تاو بەرەو ڕووی چووم و خۆم پێدا کێشا، ئەوەندەی نەما بەر بیێتەوە. هاوزای من بوو، ڕەنگە کەمێك لە من گەورەتر بووبێت، بەلام وا زۆر نا، لوولێکی باریك لە قژی دەتوت نیشانەی پرسیارە و باران وای کردووە بە تەوێڵییەوە بنووسێت. هەر دەتوت یەکێکە لە پەرییەکانی ناو دارستان دەنێو حەکایەتێکی ئەفسانەییدا. قژ کاڵ هەروەك ئەو کچەی ناو ریکلامی سیغار.

"هەلاو.." کچە وتی.

دڵم کەوتە لێدان و کوتەکوت. من هیچم نەوت. کچە خەنییەوە. زەردەخەنەیەکی ئەوەندە شیرین بوو منی خستە لەرزە. تۆ بڵێی ئەو کچە کێ بێت؟ من نەمتوانی وەڵامی زەردەخەنەکەی بدەمەوە، دەرەقەت نەهاتم، پەرێشان بووم، هەستێکی کوشندە وای کرد لە دڵساردی و نائومێدیدا نوقم بم. دایکم کەوتەوە یاد، ئەو هەمیشە چاوی بەسەرتەوە دەبێت گەر تۆ لە هەر شوێنێکدا بیت، باوکم بیر کەوتەوە کە هەمیشە زوو دەهاتەوە. لە دوورەوە و لە پێچێکدا کابرایەك دەکەوت کە مەزەندەم کرد باوکی بێت.

پێی وتم- "ون بوویت؟"

"نەخێر."

"دڵنیایت؟"

سەرم لەقاند، لە دڵەڕاوکێی ئەوەدا بووم کە هەوڵبدات بمباتە لای یەکێك لە سەربازە ئەسپسوارەکان. هەرسێکمان سەیری یەکدیمان کرد.

"پێویستە جلی وشك لەبەربکەیت." کابرا ئەمەی وت، من سەرسامی ئەوە بووم کە ئاخۆ ئەم دوو کەسە لەناو ئەم دارستانە چی دەکەن. پاشان کابرا قۆڵی کچەکەی ڕاکێشا و دووری خستەوە و جارێکی دیکە خەندەیەك کەوتەوە سەر لێوی و پاشان کوژایەوە، چاوەکانی ئەوەندە ڕوون و پاك بوون و بەجۆرێك لە منی دەڕوانی کە تۆ وا هەست بکەی تەنها خوداوەند وا بڕوانێت. هەستێکی سەیر لەناو دەستەکانمدا بەجێمان، شتێکیش لە بۆشایی. هەروەك لە خەونێکدا ڕوودەدات کە تۆ حەز بە جوتبوون و دەست لەملانێ بکەیت، دەمویست پتر کچەکە لەگەڵ خۆمدا بهێڵمەوە، بەلام نەکراو بێهوودە بوو.

من و باوکم شوێنێکمان بۆ بەیەکگەیشتنەوە دەستنیشان کردبوو. هەر کاتێك دەچووینە ناو دارستانەکە باوکم سوور بوو لەسەر ئەوەی کە شوێنێك دەستنیشان بکات کە ئەگەر لە یەکدی دابڕاین لەوێندەرێ یەکدی بگرینەوە. ئەمجارەیان دەریاچەیەك بوو، نیو میل یان کەمتر و یاخود تۆزێك زیاتر دوور لە ماشێنەکەوە.

بەدەم زیندەخەوەوە خۆم لە ژێر بەتانیەیەکدا دەبینییەوە. من هەڵدەلەرزیم، دارستانەکە سارد و تەڕتەڕ بوو. هەردوو باسکم خستنە سەریەکدی و پاڵمدا بە درەختێکەوە. من زانیم کە دەبوو چی ڕووبدات. کە تۆزێك دوورتر پێم هەڵگرت تووشی ڕێبوارێك بووم. هەر ئەو ڕێبوارەش بوو کە ڕێگەی گەڕانەوەی پیشاندام.

کە باوکم لە گردەکەوە دادەگەڕایەوە خوارێ ڕووبەری دەریاچەکە سەوزباوێکی تاریک دەینواند، سێبەری درەختەکانیشی پەرت و بلاّوەکرد. باوکە پێی وتم- "من هەر هەولّ دەدەم لەوە تێبگەم کە تۆ بۆ وات کرد. ئاسکەکە بە زەحمەتتر لە سمۆرەکان لەم ناوەدا ڕادەکەن. هەندێکیان لە برساندا دەمرن. تۆ نەتتوانی فریای یەکێکیان بکەویت: بە هەرحالّ من توانیم ئاسکێك بدۆزمەوە و دەستگیری بکەم. یەك میل لێرەوە دوورە. هەر بە تەنیا توانیم نیو میل بە دوای خۆمدا ڕایبکێشم، بەلاّم من گەرەکمە کە تۆ لە نیوەی ڕێگاکەوە تا ئەو شوێنەی مەبەستمە بیهێنیت. تۆش لێی دەخۆیت، هەر بۆیە دەبێت یارمەتیم بدەیت. تۆ کە جارێکی دیکە شتی وا مەکە"

ڕستەکەی تەواو نەکردو بە هەلّواسراوی بەجێیهێشت. من هەستم کرد کە لە دەم و چاوم ورد دەبێتەوە، بەلاّم من چاوەکانم هەلّنەدەبڕین. هەر بە تیلەی چاو زانیم کە ئەم چەندە کەنەفت و داهێزراوە. ئارەقە و باران قژە خۆلّەمێشییەکەی بەسەر تەوێلّیدا نووساندبوو، هالاّوی هەناسەی خێراتر لە عادەتی لە زارییەوە دەهاتە دەرێ. بەو شێوەیەی کە لەوێندەرێ وەستابوو، گرانی خۆی خستبووە سەر قاچێکیان، تفەنگ بە دەستەوە، بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر شتێك بکەم سەغلّەتی بکات، لەو ساتەوەختەدا، زۆر خەراپ دەکەوتەوە.

گەڕانەوە بە هەمان ڕێگادا کارێکی وەها ئاسان نەبوو. ڕۆشنایی زۆر خێرا نەدەما و بزر دەبوو، وەك هەمیشە کە ڕۆژ کۆتایی دێت، ئەو جەنگەلّەی دەوروبەرمان تا دەهات تاریکتر دەبوو. ساردتر. باران وەستابوو، بە درێژایی ئەو ڕۆژە ئاسمان وەك ئەو ساتەوەختە ڕۆشن نەبوو، بەلاّم تەنها بە بەراورد لەگەلّ تاریکی چڕی دەوروبەر. درەختەکان ئاویان لێ دەتکا، هەر کاتێك دلّۆپە ئاوێك دەتکایە سەر پێستم لەسەرمانا دەیبەستم. تاریکی هەموو دەنگەکانی دەخنکاند، تا وای لێهات جگە لە ترپەی هەنگاوەکانی خۆمان هیچ نەما.

من ویستم خامۆش بم، بەلاّم لەناکاو گوێم لە هاوارێکی بلّند بوو کە پرسی: "ئەرێ ورچ لەو ناوەدا هەن؟"

ئەم هەر خۆی بە دەم هاوارەوە خیزەی سینەی هات و بە دەم مۆڕەکردنەوە وەلاّمی دایەوە: "هیچ ورچێکی لێ نییە."

ئەوەیان منی پساند. پرسیارەکە بە جۆرێك بوو کە کتومت لە هی منداڵێك دەچوو، جۆرە پرسیارێك کە هەرگیز نەیکردبوو. خۆزگەم خواست کە بمتوانیایە من وەلاّمی بدەمەوە. بەلاّم ئەوە شتێك نەبوو کە من هەرگیز لێیبزانم.

باوکە لایتەکەی داگیرساند و پاش ماوەیەك گەیشتینە سەر ئاسکەکە. هەر دوو قاچی بەدارێکەوە بەسترابوونەوە کە کەوتبووە نێوان دوو تاشەبەرد. کەللەسەری وەها ترسناك بە دواوەدا کەوتبو کە من دەترسام لەوەی بەڕەگەوە بقرتێت، هەر بە هەمان ئەندازەو بە گۆشەیەکی زۆر لەوە ترسناکتر هەردوو شاخی لە زەوییەکە چەقیبوون. من نەمدەتوانی سەیری چاوەکانی بکەم کە ڕۆشن بوونەوە ئەو کاتەی روناکی لایتەکە کەوتە سەری، هەر دەتوت نەمردووە. دەیەها مارومێروو ڕووەو قۆرتێکی پڕ لە خوێن دەخشین. دلّم تێکهەلّهات و هەستم کرد نەخۆشم. من لە ژیانمدا ئاواهی بەرامبەر شتێکی وا گەوڕۆنەو مردوو

نەوەستابووم.. وەها نزیك. من نەمویست دەستی لێبدەم.

باوکە پاشەڵی بەرزکردەوە و وتی: "دەی با بڕۆین، بەڵام من هەر بە چیچکانەوە بووم، هەتا ئەو کاتەشی کە بەدوای خۆمانەوە ئاسکەکەمان ڕادەکێشا.

"ئەوەشیان هەر هەڵەی خۆتە. ئەگەر تۆ شێت نەبوویتایە، ئێستا لە هەموو شتێك دەبووینەوە."

هێڵنجمداو ڕشامەوە. جەنگەڵەکە تا بڵێی سارد بوو، لەبەر هەورهێڵ ئەستێرەکان دیار نەمابوون. ڕۆشنایی لایتەکە بەسەر دیوارێك لە درەختەکانەوە دەلەرزی و سەمای دەکرد، دیوارێك بەستوو.. بێ ڕەنگ و بێ قووڵایی. من وەستام. ئاسکەکە لەبەردێکەوە عاسی ما.

من پێم وت: "چیتر بەو ئاسکەدا مەکێشە."

"بە نەفرەت بیت.. ئەمەیان پەیوەندی بە تۆوە نییە. ڕایکێشە. توندتر."

"لەوەپتر پیایدا مەکێشە."

باوکە سەیرێکی کردم. لایتەکە لە ژێرەوەڕا ئێمەی خستبووە ناو تەنێکی قوچەکی لە ڕۆشنایی. هەموو شتێك لە دەوروبەری ئێمەدا تاریك و ڕەش داگەڕاو بوو. هەر دەتوت لەم دونیایەدا هەر ئەو دوو کەسە ماوینەتەوە.

"تۆ چی سەبارەت بەو شتە دەزانیت؟" باوکە وتی: "هیچ شتێك بەو ئاسانییە نییە کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە."

من دەستم لە قاچەکانی ئاسکەکە بەردا. دەبا باوکە خۆی ئاسکەکەی خۆی بە دوای خۆیەوە ڕابکێشێت. تا ئەو حەلە هەر لە بەردەکەوە گیرا بوو، چەند جارێك زۆر بە توندی ویستی ڕاییکێشێت پاشان دەستی لەو دارەی نێوان قاچەکانی بەرداو کەوتە شەق وەشاندن، دیسانەوە هەوڵیدا.. بەڵام بەردەکە توند بەرزەفتی کردبوو، دیسانەوە کەوتە لێدانی. ئاسکەکە بەدەم لێدانەوە تەپەی دەهات، دەنگێکی خنکاوی لێ بەرز دەبۆوە کە وای دەکرد باوکە پتر شێت و هار بێت چونکە بە لەقە کەوتبوە سەری و وازی نەهێنا تا ئاسکەکە هەڵدرا، وەك ئەوەی لەلاوە پەراسوویەکی بشکێت و پاشان هەر هەموو پەراسووەکانی دیکەی لێکدی هەڵبوەشێت. رووخساری کەوتبووە ژێر تاریکی، دەیلرخاند و زەمەنیش تا دەهات خاوو و هێواش دەبۆوە، سەربەرەوخوار رۆشنایی لایتەکە دەیدا لە ئاسکەکە، قاچی لە تاریکییەوە رووە و رووناکی بەدەم شەقەوە لە جەستەی ئاسکەکە دەچەقی، لە تاریکییەوە رووە و روناکی هەر لە جوڵەدا بوو، ئاسکەکە ڕادەتەکی، تا دەهات نوکی بووتەکەی بە خوێن سوور هەڵدەگەڕا بێ ئەوەی خوێنەکە بتکێت، بەڵام بەسەر قەبرغەی ئاسکەکەوە وەدیار دەکەوت. ئەمتوانی دە یان دوو سەد جار وا بکات. من مەزەندەم نەدەکرد. لە ساتەوەختێکدا رۆشنایی لایتەکە رژایە ناو چاوی ئاسکەکە کە لە ناو چڕی تاریکیدا دەدرەوشانەوە، نیمچە ڕوون، ڕۆشناییەکی وا کە خەوت لێبخات، نەمدەتوانی بەرگە بگرم و لەوەدابوو تێیبتەقێنم. پاشان رۆشناییەکە رژایە سەر چاوم، لەو ساتەدا زانیم کە وەك چاوەکانی ئاسکەکە دەدرەوشێنەوە. لایتەکەی لە تەنیشت خۆیەوە دانا، کوژاندییەوە، کەوتە هەناسە برکێ. گەمارۆ درابووین بە ڕەشایی، زیکەزیکی زۆر پڕی سیسرکەکان. قیرەقیری بۆقەکان، گیزەگیزی مێشوولەکان، تەکەتکی ناڕێکی دڵۆپە ئاوەکان کە لە

گەلاّکانەوە دەتکان، بە دەنگێکی نەرم و لەسەرخۆ زاری هەڵهێنا بە جۆرێك کە من هەڵلەرزیم: "من هیچ شتێکم نییە شانازی پێوە بکەم. شتێکی تروهات.. گوم تێکرد.. شانازی بە چییەوە.."

هەموو شتێك هەنگاوێك چووە پێش. هەروەك بڵێیت لە ژێر پێستمدا ئەو هەموو شتانە نێژرابن" من بیرم کەوتەوە: سەر پەنجە نەرمەکانی، هەردوو پشتە دەستی تووکنی. دەنگی. ئەو کاتەم بیرکەوتەوە، کاتێکی زۆر درێژ و لەمەوبەر کە من زانیم من تووشی هیچ نەهامەتییەك نابم تا ئەو کابرایە لەم دونیایە هەناسە بدات و بمێنێت.

بەهەردووکمان کەلاکی ئاسکەکەمان خستە دواوەی ماشێنەکە کە بەر لەوە لە کۆنە قوماشێکەوە جوان پێچامان. کە لەشەکە گران و وشك و ڕەق هەڵهاتوو بوو. هەردەتوت لاشەی مرۆڤێکمان هەڵگرتووە.

باوکە وتی: "هەنوکە هەر لە گەراجەکە بەجێیدێڵین. ژووری دانیشتنەکە رووناك بوو، بەلاّم لەبەر هەر هۆیەك بێت دایکە لەناو تاریکی ئاشخانەکەدا بزر ببوو. توانیم تارمایی ڕەشی دایکە لەودیو پەنجەرەکەوە ببینم، دەمدی باسکی بەرز و نزم دەبۆوە، بەدەم جگەرەکێشانەوە. توانیم هەست بە هەردوو دەستی باوکە بکەم کە لەناو لاشەی ئاسکەکە دەلەرزین.

کە لەگەڵ باوکە چووینە ژوورەوە ڕووی لە دایکم کرد و وتی: "ئاسکێکی جوانمان دەست کەوتووە."

دایکە هیچی نەوت.

"ناتەوێت بیبینیت؟"

باوکە گلۆپەکەی داگیرساند. دایکە خامۆش بوو، جگەرەی دەکێشا.

"جیانی." باوکە بانگی دایکەی کرد. من ڕووە و ژوورەکەی خۆم ملم نا. وەستام. من متمانەم بە هیچیان نەدەکرد. باوکە لەبەردەمیدا قوت بۆوە، بە هەردوو دەست توند کورسییەکەی گرت. چاوە شینەکانی دایکە لە دیوارەکەیان دەڕوانی.

"ئەم ئاسکەم بۆ تۆ ڕاوکرد." باوکە وەستا. قورگی پاککردەوە. "تۆ حەزت لە گۆشتی ئاسکە."

چاوەکانی بۆ هەڵبڕی: "سوپاس."

"تۆ چیت لە من دەوێت؟" باوکە وتی:"تۆ چیت دەویێ؟"

چاوەکانی دایکە پڕ بوون لە بێزەوەری و قێز. بە خۆم نەبوو.. سکم بە باوکە سووتا. "من چیم دەوێت؟" دایکە پرسی. "هەر ئێستا دەقاو دەق پێت دەڵێم. من دەمەوێت تۆ وەکو پیاوێك منت خۆش بوێت و چیتر تێمهەڵنەدەیت، واش چاوەڕێ بکەیت لە پای ئەو لێدان و کوتانە تۆم خۆش بوێت. من دەمەوێت بۆ خێر و خۆشی ئەم ماڵە خۆت ماندوو بکەیت بەو شێوەی کە خۆت بەڵێنتدا. من دەمەوێت کە واز لەم خووە بێنیت و چیتر گیانلەبەری مردوو نەهێنیتەوە ماڵێ وەك پیاوی ناو ئەشکەوتەکان و وا بزانیت کە ئەم بەزمەی تۆ هەموو شتێك دەگۆڕێت. من دەمەوێت واز لە خواردنەوە بێنیت و ئیتر بایەخ بە من و بە (جۆی)ی کوڕمان بدەیت. یان دەمەوێت کە پێم بڵێیت هیچ کام لەم شتانە نەکەیت و ئەو خووانە فەرامۆش بکەیت، هەقی ئەو بیست ساڵەم بدەیتەوە کە لەگەڵ تۆدا بەسەرم بردووە."

لە کۆتایی قسەکانیدا هاواری دەکرد. باوکم لێی راما، چاوەکانی دەتروکاند. بۆ خولەکێك وەستاو پاشان رووی وەرگێراو رووی لە گەراجەکە کرد. هیچ کامیان سەیری منیان نەکرد.

کەوتمە دوای باوکە. لە گەراجەکە هاتە دەرێ و خاکەناسێکی هەڵگرتبوو. تریفەیەکی زیوین دەرژایە ئەو ناوە. چووە دەرەوە و لە ناوەراستی حەوشەکەدا بۆ ماوەی خولەکێك وەستا. باوکە زۆر خزمەتی چیمەنەکەی دەکرد. دوای ئەوەی کە لە کارەکەی دەرکرا هەموو زەوق و خۆشییەکی بە باخچە و چیمەنی ناو حەوشەکە دەبەخشی، هەر خۆی چیمەنەکەی دەبری، پەیینی تێدەکرد، دەیرازاندەوە. هەنووکە وەستابوو سەیری چیمەنەکەی دەکرد وەك ئەوەی کە هەرگیز لەمەوبەر نەیدیبێت. دەمی خاکەناسەکەی لە چیمەنەکە گیر کرد و کەوتە هەڵکەندنی. کات درەنگ بوو. جگە لە خۆمان کەس لەو ناوە نەبوو. هەستم کرد کە دایکە لە ئاشخانەکە وەستاوە و سەیرمان دەکات. بۆ ماوەیەکی درێژ زەوییەکەی هەڵکۆڵی، لە ناو شەوێکی وادا خاکەناسەکە دەنگی دەدایەوە. دوای ئەوە چاڵێکی قووڵی لێدا، رووەو گەراجەکە ملی ناو راکێش راکێش ئاسکەکەی دەرهێنا کە لە قوماشێکەوە پێچرابوو. باوکە سەرێکی هەڵبری و سەیریماڵەکەی کرد. ئاسکەکەی فرێدایە ناو چاڵەکەو نەوەستا تاوەکو تەواو لە ژێر گڵەکەدا شاردییەوە.

## پەراوێز

-بێرتن شولمان: لە بروکلین لە دایك بووە و لە کوینز/ شاری نیویۆرك گەورە بووە، لە هەمان شاردا چۆتە کۆلیژی نیویۆرك تاوەکو پتر ئاگای لە نووسین و داهێنان بێت، دوای ئەوە پەیوەندی کرد بە کۆلیژی (وارن ولسن) و ماستەری لە هونەرەجوانەکان وە دەست هێنا. ئێستاش لە بروکلین، خۆی و ژنەکەی (ئێلین لوری) کە هونەرمەندی شێوەکارە زیندەگی دەکەن. وەك دەرهێنەرێکی داهێنەریش توانیویەتی بژێوی خۆی پەیدا بکات، هێشتا لاوە و چیرۆکی (ئاسکەکە) یەکێکە لە هەوڵە سەرەتاییەکانی.

## سەرچاوە

*Burton Shulman*

*Safe House*

*Stories*

*Global City Press*

*1996/ P. (141-147)*

# ڕەنگە ببێت بە خوازبێنی

ئارسکینی کاڵدوێڵ
لە سویدییەوە: عەبدوڵا قادر دانساز

دێت، دێت – خوا دەست بە باڵیەوە بگرێت! بۆ خواستنی من دێت – لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە مینیسوتاوەوە تا ئێرە بە سەفەر دێت.

بەهەناسە لەخۆبڕین و لەرزەلەرزەوە جار لە دوای جار سەرلەبەر ئەو نامەیەی دەخوێندەوە کە بە هەردوو دەستە جامگرتووەکەی توند گرتبووی. تا لەدوایدا چاوەکانی بە جۆرێکی وەها پڕبووبوون لە فرمێسك ئیتر لەوە زیاتر لە توانایدا نەمابوو پیتەکان لە یەکتری جیابکاتەوە، نامەکەی ناوە بەرمەمکە ڕووتەکانیەوە، بەسەر نوکی ئەو دڵەی لە شادمانیدا جۆلانێی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە مینیسوتاوە– ئەو ڕێگا دوورەی بڕیوە بۆ خواستنی من.

ئەو ڕاستەوخۆ نەینووسیبوو دەیەوێت داخوازی ئەم بکات، بەڵام بەهەر شێوەیەك بێت نووسیبووی حەزی لەو وێنەیە کردووە ئەم بۆی ناردبوو. دەباشە ئەی بۆچی ئەو بەتەکان هەر هەموو ئەو ڕێگا دوورە هەر لە مینیسوتاوە دەبڕێت و دێت بۆ ئێرە گەر بێتو ئەو نیازی داخوازیکردنی ئەمی نەبێت؟ دیارە ئەوەی مەبەستە.

هەروەها ماریۆریەش وێنەیەکی ئەوی بۆ نێردرابوو. دەیتوانی بە تەواوی هێزی جوامێری ئەو بەدیبکات کە لە ڕووی دەموچاوە باریکەکەیەوە تیشکی دەدایەوە لەگەڵ گرژی ماسولکە بەهێزەکانی دەوروبەری چەناگەیدا. بەلەزەتەوە دەستی بەسەر وێنەکەدا دەهێنا و هەستی بە هەڵچوون دەکرد بۆ ئەو پیاوەی دەبێت بە پیاوی ئەم. تەنها هی ئەم، ئەو بە هێز بوو. هەرچییەکی بوێت دەتوانێت لەگەڵ ئەمدا بیکات.

بێگومان ئەو حەز لەم دەکات. ئەو پیاوێکی تێگەیشتوو بوو، پیاوانی تێگەیشتووش لە کاتێکدا دەیانەوێت ژن بهێنن بە دوای ناخ و لەشی جواندا وێڵن. ماریۆریە جوان بوو. شۆخی و دولبەریی جوانیان کردبوو. ئەو بۆی نووسیبوو دەموچاو و پرچی ئەم جوانترین دەموچاو و پرچن تا ئێستا ئەو بینیوێتی. هەروەها ئەم لەشێکی جوانی بەلاوە بوو

بەس هەر ئەوەندەی ئەو بێت بۆ ئێرە دەبێ ئەو لەشە ببینێت. لەشە باریک و ڕەسەنەکەی وەکو نەمامێکی تازە هەڵچوو لە زستاندا بێ خەوش و توندوتۆڵ بوون. دڵی گەرم و بەجۆش بوو، بێگومان ئەو حەز لەم دەکات بێگومان بەتەواوەتی.

ئەگەر بێت و ئەو عاشقی ئەم بێت و حەزی بچێتە سەر ئەم و ئەو کاتەی ئەو ئەم دەبینێت دەبێت ئەوە بکات، ئەوا ئەم ناخی خۆی دەدات بەو. ئەوە گەورەترین دیارییە ئەم دەتوانێت بەوی ببەخشێت. یەکەمجار دڵی خۆی و پاشان لەشی و دواجاریش ناخی خۆی دەدا بەو. بگرە تاوەکو ئێستاش هیچ کەسێك خاوەنی لەش و دڵی ئەم نەبووە.

ئەو لە هەموو نامەکانیدا زۆر ڕاستگۆ بووە. ئەو نووسیبووی دەیەوێت ژن بهێنێت. ئەو نووسیبووی، لە مینیسوتا بە تەنهایی ژیان بردنە سەر زۆر ناخۆشە. ماریۆریەش تەنها بوو. پێنج ساڵی ڕەبەقە هەر لەو کاتەوەی دایکی کۆچی دوایی کردبوو بە تەنها بوو. ئەم لەو تێدەگات. ئەم هەردەم تەنها بووە.

ماریۆریە بۆ ئەوەی بتوانێت خۆشەویستی بکات پێگەیبوو. تەمەنی بیست و چوار ساڵ بوو. باسك و لەتەری وەکو دارێکی تازە لە نەمامی دەرچووی وەرزی زستان سارد و خۆگرتوو بوون مەمك و لێوی گەرم و نەرم بوون و هەناسەی سازگار وەك بای مانگی تشرینی دووەم کە لەسەر دەریاکەوە هەڵیدەکرد و بەنێو دارکاژەکاندا تێپەڕی دەکرد. ماریۆریە بۆ ئەوەی بتوانێت خۆشەویستی بکات پێگەیبوو. لێوەکانی ماریۆریە نەرم بوو و لەشی توندوتۆڵ و بەهێز بوو.

ماریۆریە یەکێ لە ژوورەکانی بۆ ئەو ئامادەکرد و چاوەڕوانی هاتنی بوو. بەرگە لێفە لە لۆکە دروستکراوەکان و بەرگە سەرینەکانی سێ جار شۆرد. نەرم بووبوون وەکو لێوەکانی ئەم وەکو هەناسەکانی ئەم بۆنی دارکاژیان لێ دەهات. بۆ وشککردنەوە بەسەر لقی دار سنەوبەرەکانەوە هەڵیخستبوون و هەر زوو سەرلەبەیانان ئەو کاتەی هێشتاکانێ شێداربوون بۆنی گەڵا دەرزیلەییەکانیان وەردەگرت دەستی بەسەریاندا دەهێنا.

ئەو ڕۆژەی ئەو هات ماریۆریە دەمێکی زۆر پێش هەڵهاتنی خۆر لە خەو هەستابوو، خۆر بە فێنکی و خێرایی هەڵهات.

پێش ئەوەی ئەو کراسە تازەیەی ئەم لەبەر خاتری ئەو لەبەری دەکات بێنێتە دەرەوە بەغار چووە سەرەوە بۆ ژوورەکەی ئەو، لۆچ و خواری سەرینەکانی سەر قەرەوێڵەکەی چاککردەوە و بۆ دواجار دەستێکی هێنا بەسەر لێفەکەدا. دوای ئەوە خێرا خۆی گۆڕی و بە ڕانینی ئۆتۆمبیلەکە ئەو ڕێگا دوورە سێ کیلۆمەترییەی تا ئێستگەی شەمەنەفەرەکە بڕی.

ئەو بە سواری ئەو شەمەنەفەرە هات لە کاتی دوای نیوەڕوان لە بۆستنەوە دێت. ئەو گەلێك لەوە بڵندتر بوو کە ئەم لەو بڕوایەدا بوو و گەلێك قۆزتریش بوو لەوەی ئەم ئاواتەخواز بوو.

ئەو بە دەنگی نووساوەوە وتی: "ئایا تۆ ماریۆریەی؟"

ئەم بەتاسەوە وتی: "بەڵێ. من ماریۆریەم. بێگومان ئێوەش نیلسن؟"

ئەو وتی: "بەڵێ" و بە زەردەخەنە چاوی بڕیە نێوچاوی ئەم. "من نیلسم".

ماریۆریە ئەوی لەوێ دوورخستەوە و بردی بۆ لای ئۆتۆمبیلەکە. سوار بوون و کەوتنە ڕێ. نیلس پیاوێکی کەم دوو بوو، زۆر بە وشکی و زۆر بە

دەگمـــەن قســـەی دەکـــرد. بـــەردەوام ســـەرنجی ماریۆریـــەی دەدا. بێـــبڕان ســـەرنجی دەســـتوپل و دەموچاوی ئەمی دەدا. ئەم هەستی بە پەشۆکان و دەستەپاچەیی خـۆی دەکـرد لـە بەرامبـەر سـەرنجی ڕەخنەگرانە و تەنگ پێهەڵچنینی ئەودا. ئەو کاتەی ئەمان چەند کیلۆمەترێکیان بڕیبوو ئەو قۆڵی خستە سەر لێواری پشتەوەی ئەو کورسییەی ئەم لەسەری دانیشـــتبوو. بـــەس جووتێـــك جـــار لـــەو کاتانـــەی ئۆتۆمبیلەکە بەسەر ڕێگا بەردینەکە تاسەی کرد و تەکانی بەرەو پێش و پاش دەدا لەشی ئەم بەر قۆڵی ئەو کەوت. قۆڵی وەکو هی کرێکارێکی دارستان زۆر بەهێز و ماسولکەدار هەستی پێدەکرا.

پاشـان دوای نیـوەڕۆ ماریۆریـە و نـیلس بـە پیاسە بەنێو دارستانەکەوە چوونە سەر دەریاکە. بایـــەکی ســـاردی شەختەئاســـا لـــە ڕۆژهەڵاتـــەوە هەڵیکردبوو و هەروەکو بڵێی زریانێکی تەواوەتییە شـەپۆلەکان کـەفیان دەکـرد و بەرزدەبوونـەوە. ئـەو کاتـــەی ئـــەوان بەســـەر قەمـــەتاوێری گۆشـــەیەکی دەریاکـەوە وەسـتابون و سـەرنجی نێـو دەریاکـەیان دەدا لـەناکاو بایـەکی تونـد هـەڵیکرد و ئـەمی بـەرەو شـانی نیلس تـوڕدا. نـیلس بـە دەسـتێلێکی پـۆلایین بـەری لـە پشـتی ئـەم گـرت و خـۆی لەسـەر قەمـە تاوێرەکـەوە هەڵـداوە خـوارەوە. پاشـان ئـەم چلورە بەفرینەکان و ئەو چەرداخەی بەلەمەکان بە زستانان تیایدا دادەنرێن نیشانی ئەویدا. پاشان ئەوان بەنێو دارکاژەکانەوە گەڕانەوە بۆ ماڵ.

ئـەو کاتـەی ماریۆریـە خـەریکی ئامـادەکردنی خواردنی شێو بوو نیلس لە ساڵۆنەکە دانیشـتبوو و پایپی دەکێشا. گەلێك جار دزەی کردە لای دەرگاکە و بەدزییـــەوە ســـەرنجێکی ئـــەو پیـــاوەی دەدا ئـــەم شووی پێ دەکات. تاقە هێمایەك بەوەی ئەو کابرایە گیانی بە بەرەوە ماوە دوکـەڵی ئـەو توتنـە بـوو ئـەو بێوچان بەخەستی بە پایپەکەی دەیکرد بە هەوادا. ئـەو کاتـەی خواردنەکە پێگەیشـت ماریۆریـە خێـرا جلەکـەی گـۆڕی و فـەرمووی لـە نـیلس کـرد. ئـەو خواردنەکەی پێخۆش بوو. ئەو دەستخۆشی کرد لە شـێوەی ماسـی لێنانەکـەی ئـەم. پێسـتە ڕووتەکـەی ئـەم هەنـدە گـەرم بووبـوو گـڕی لـێ هەڵدەسـتا بـە جۆرێك لە توانایدا نەبوو زرانییەکانی بنووسێنێت بەیەکەوە. نیلس بە ئارەزوویەکی باشەوە خـواردنی دەخوارد.

ئەو کاتەی ماریۆریە سفرەکەی گرد کردبووەوە دووبـارە جلەکـەی گـۆڕی و چـووە سـاڵۆنەکە، نـیلس لەوێ لەبـەر ئاگردانەکە دانیشـتبوو. لـەوێ دانیشـتن بـەبێ ئـەوەی هـیچ بڵـێن تـا ئـەو کاتـەی ماریۆریـە ئەلبومەکـــەی هێنـــاوە پێشـــێ و وێنـــەکانی خـــۆی پیشانی نیلس دا. ئەو بەبێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت تەماشای وێنەکانی دەکرد.

هـــەموو شـــەوەکە ئـــەم لـــەوێ دانیشـــتبوو و ئاواتـەخواز بـوو هاکـا ئـەو باوەشـی پیـادا دەکـا و ماچی دەکات. بێگومـان دوایـی ئـەوان ئـەوە دەکـەن، بـەڵام ئـەم دەیویسـت هـەر ئێسـتا ئـەوە بکـەن. ئـەو تەماشای ئەو لایەی نەدەکرد ئەمی لێ بوو.

کاتژمێر دە و نیو نیلس وتـی دەیـەوێت بچێت بخـەوێت. ماریۆریـە چـووە سـەرەوە و بـە خێرایـی خـۆی گەیانـدە ژوورەکـەی ئـەو. ئـەو لێفەیـەی سـەر قەرەوێڵەکـەی ئـەو کـە بـە گـەڵای دەرزیلەییـەکانی دارکـــاژ بۆنـــدار کرابـــوو لـــە خـــوار جێگـــای پـــێ درێژکردنی قەرەوێڵەکەوە قەدکرد و دەستێکی هێنا بەســەرینەکاندا. پاشــان خــۆی چــەماندەوە بەســەر قەرەوێڵەکـەدا. پاشـان گـوپی پـڕ لـە هـەوا کـردووی خۆی نا بەسەر سەرینە فێنك و نەرمەکانەوە. تۆ بڵێ ئەگەر بهاتبایە ئەم بچوایە نێو ئەو جێگایـە– دەبـێ ئەو کاتـەی نیلس ئەم لـەوێ دەبینێتـەوە دەبـێ چی

بڵێت؟ ئەو هزرانەی لە خۆی ڕاوەشاند و دووبارە چووە خوارەوە بۆ ساڵۆنەکە، نیلس لەوێکانی لەبەر ئاگردانەکە چیچکەی کردبوو.

ئەو کاتەی نیلس چووە سەرەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و دەرگاکەی لە خۆی داخست ماریۆریە لە نێو ژوورەکەی خۆی ون بوو. ئەم لە نێو کورسیە جوڵانێکەرەکە دانیشت و تەماشای دەریاکەی دەکرد. دوای نیوەشەو لە کورسیەکە هەستا و جلەکانی لەبەر خۆی داکەند. یەکسەر پێش ئەوەی بچێتە نێو جێگاکەی خۆی بەسەر پەنجەی پێوە بەدزەکردن چوو بۆ لای ژوورەکەی ئەو. چەندین خولەك لەوێدا مایەوە و بە بەردەوامی گوێی دەگرت. پەنجەکانی بە ئاستەم بەر دەرگاکە کەوتن. ئەو گوێی لەم نەبوو. ئەو خەوتبوو.

ماریۆریە کاتژمێری پێنج لە خەو هەستا. کاتژمێری حەوت ئەو کاتەی ماریۆریە خەریکی ئامادەکردنی نانی بەیانی بوو نیلس هاتە خوارەوە. ئەو وا دەهاتە بەرچاو دەموچاوی تازە شۆردووە و خۆی کەشخە کردبوو و، ئەم تاڕادەیەك هەستی بەوە دەکرد کە لە تۆی ئەو قاتە لە لۆکە دروستکراوەی فلّت بوو بەبەر نیلسەوە هەست بە بەهێزی ئەو دەکات.

ئەو وتی: "بەیانیت باش".

ئەم بە دڵەوە وەڵامی داوە: "بەیانیت باش نیلس".

پاش نانی بەیانی بە بێدەنگی لەبەر ئاگردانەکە دانیشتن. نیلس پایپی دەکێشا. ئەو کاتەی لە کێشانی پایپەکەی بووەوە هەستاوە سەرپێ و کاتژمێرەکەی دەرهێنا. ماریۆریە بێدەنگ دانیشتبوو و تەماشای ئەوی دەکرد.

ئەو پرسی: "کەی شەمەنەفەری داهاتوو دەڕوات؟"

ئەم بە دەنگێکی بێ نەوا ئەوەی پێ وت.

ئەو پرسی: "دەتوانیت بمگەیەنیتە شەمەنەفەرەکە؟"

ئەم وەڵامی داوە: "بەڵێ".

ئەم چووە موبەقەکە و خۆی چەماندەوە بەسەر مێزی نانخواردنەکەدا. نیلس بەوەستاوی لەبەر ئاگردانەکەوە مابوەوە و دووبارە پایپەکەی پڕکردەوە. چەندین جار بە ڕاکردن دەچوو بۆ ساڵۆنەکە، بەڵام هەموو جارێك بەر لەوەی بگاتە بەر دەرگاکە بەری لە خۆی دەگرت. ئەم دەیەویست لێی بپرسێت ئایا ئەو نایەوێت بگەڕێتە دواوە بۆ ئێرە. ئەو کاتە قاپێکی گرتبووەوە دەستی لە دەستی بەربووەوە و بە جۆرێکی وەها کەوت ئیتر وردوخاش بوو. ئەوە یەکەمین جارە دوای ئەو ڕۆژەی دایکی مرد شتێکی فەخفوری بشکێنێت. بە لەرزە لەرز شەیقەی لەسەر ناو پاڵتۆی لەبەرکرد. ئەوە ئاشکرایە کە ئەو بیر لەوە دەکاتەوە بگەڕێتەوە دواوە بۆ ئێرە! ئەوە گەمژەییە بۆ ئەم شتی وا بە خەیاڵی خۆیدا دەهێنێت! لەوانەیە بیەوێت بچێت بۆ بۆستن و دیاری بۆ ئەم بکڕێت. ئەو- بێگومان دەگەڕێتەوە دواوە- هەر بە تەواوەتیش بێگومان.

ئەو کاتەی گەشتنە ئێستگەکە نیلس دەستی رووە و ئەم درێژ کرد. ئەمیش دەستی خستە نێو دەستی ئەو. ئەوە تاقانە جار بوو ئەو لەشی بەر پێستی پووتی ئەم بکەوێت.

ئەو وتی: "خوات لەگەڵ".

بە زەردەخەنەوە وتی: "خوات لەگەڵ نیلس هیوادارم ڕازی بووبیت بە میوانداریەکەت".

نیلس جانتاکەی هەڵگرت و چوو بەلای ساڵۆنی چاوەڕێکردنی وێستگەکەوە.

ماریۆریە هەستی بە باری گرانی خۆی دەکرد هەروەکو بڵێی قورقوشم لە نێو ئەندامەکانی لەشیدا

بێت. بەبێ بڕیاردان ماتۆڕی ئۆتومبیلەکەی هەڵکرد. ئەو نەیگوتبوو بەوەی ئەو دووبارە دەگەڕێتەوە!

لە پڕێکدا هاواری کرد: "نیلس" و وا بەتوندی لایەکی دەرگای ئۆتومبیلەکەی گرتبوو گرێی پەنجەکانی گەواهی ئەو توندییەیان دەدا.

نیلس وەستا و بەری کردە دواوە.

زۆر بە نا ئومێدییەوە وتی: "هەر کاتێك بتەوێت بێیت بۆ ئێرە بەخێربێیت".

زۆر بە وشکی وتی: "ئەها ئاوەها، بەلام من دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە بۆ مینیسوتا و جارێکی تریش ناگەڕێمەوە بۆ ئێرە."

هاواری کرد: "چی؟" و لێوەکانی کەوتنە تەتەڵەکردن بەجۆرێکی وا زۆر بەسەختی توانی قسە بکات: "دەچیت بۆ کوێ؟"

زۆر بەکورتی دووبارەی کردەوە: "بۆ مینیسوتا."

وەك بدا لە شەقەی باڵ ئۆتومبیلەکەی بەرەو ماڵ هاژوو. هەر ئەوەندەی گەشتە ماڵەوە بەغار چووە سەرەوە بۆ ژوورەکەی نیلس.

لە ژوورەکە بە وەستاویی بە دیار قەرەوێڵەکەی نیلسەوە مایەوە و بە چاوانێك فرمێسك کوێریانی کردبوو تەماشای لۆچەکانی لێفە و سەرینەکانی دەکرد. بە لوشکەلوشك جلەکانی لەبەر خۆی دادڕی بەسەر درێژی قەرەوێڵەکەوە خۆی داوە سەر ئەو جێگایەی نیلس تیایدا ڕاکشابوو. باوەشی بە سەرینەکاندا دەکرد و بە فرمێسکەکانی تەڕیانی دەکرد. هەستی دەکرد لەشی ئەو بە تەنیشتی خۆیەوەیە، ماچی دەموچاوی ئەوی دەکرد و لێوەکانی بەرەو ئەو بردە پێشەوە بۆ ئەوەی ئەو ماچی بکات.

ئەو کاتەی ئەم لە قەرەوێڵەکە هاتە خوارەوە کردبووی بە شەو. خۆرئاوا بووبوو و ڕۆژیش کۆتایی پێهاتبوو. ئەو خۆرئاوابوونە ساردە ژوورەکەی پڕ کردبوو لە سێبەر.

ماریۆریە بەتانییەکی ئالأندە شان و ملیەوە و بە ڕاتەکان بەرگە لێفە و بەرگە سەرینەکانی کردەوە بە چاوانێکەوە فرمێسك کوێری کردبوون بەرەو ژوورەکەی خۆی ڕایکرد. سەری ئەو سنوقەی لە دارسەرو دروستکرابوو هەڵدایەوە زۆر بەدیقەتەوە بەرگە لێفە و بەرگە سەرینەکانی قەدکرد. لە نێو سنوقەکەی نان و سنوقەکەشی بردە دیار قەرەوێڵەکەی خۆیەوە.

پاشان چراکەی کوژاندەوە و لە نێو لێفەکەی خۆیدا ڕاکشا.

بە چپەچپ و بەسۆزەوە وتی: "تو ئەو خوایە، نیلس" و دەستیشی ئەهێنا بەسەر سەری لووسی ئەو سنوقە لە دارسەرو دروستکراوەی قەد قەرەوێڵەکەی.

## سەرچاوە

*Erskine Caldwell, Ev. Aktenskap;*

*All valdens berattare, Nr. 5. Maj 1952, p. 326-330*

# چەند نامەیەك لە نیخیڵەوە

ڤیلاس سارانگ

لە ئنگلیزییەوە: تۆفیق عەبدول

سـەعات دەوچـارەك هەسـتام و بەرانبـەر پەنجەرەکـە ڕاوەسـتام, چاوەڕوانی پۆستەچییەکەم ئـەکرد. پۆستەچـییەکە نزیکـی دەونیـو دێـت, هەرچەند زۆر جاریش کەدێت نامەی بۆ من پێنییە, هەنـدێجاریش کەنامەیـەکی بـۆ مـن پێبێـت, مـن هـەرهیوابڕاوم. پـێش ئـەوەی مـن بگوێزمـەوە ئـەم ژووره پزیشکێکی تیابووە, ئەوە سێساڵە ئەو لێرە نـەماوە کەچـی تائێسـتاش هەنـدێ کۆمپانیـای دەرمانگەریی بڵاوکراوەی زانستی پزیشکی بەناوی ئەوەوە ئەنێرێت. بەلایەنی کەمەوە هەفتـەی دووجار لەم چاپکراوانەی بۆ دێت. ڕائەکەم بۆ لای دەرگاکەو پـەلاماری زەرفەکـە ئـەدەم, بـەڵام ئـەوەی تیاندایـە بریتین لە ئامۆژگـاری و ڕاسپاردە دەربـارەی هەنـدێ بەرهەمی پزیشکی نەبیستراو و بەئاسانی گۆنە کراو وەك (تانـدرێل بـەخێرایی هـەوکردن و ئاوسـاوی دائەمرکێنێتـەوە) (بۆتازۆلیـدین, چارەسـەری درامـاتیکی بـۆ حاڵەتـەکانی ڕۆمـاتیزمی تیـژ) (یـۆراکس. هایـدرۆکۆرتیزۆن چارەسـەری ئاسـانی گیروگرفتـی ئـاڵۆزی پێسـت) (کینامینـا بـۆ چـاکتر دەسـەڵات پەیـداکرن بەسـەر ئاڵۆشـەکانی لەشـدا).. تادوایی..

ئـەم جـۆرە شـتانە بێزاریـان کردبـوم, بـەڵام ئەوەنـدە توانـاو دەسـەڵاتم نىیـە بـۆ ئـەم هـەموو کۆمپانیایە بنوسم و پێیان ڕابگەیەنم کـەئیتر دکتـۆر لێرە دانانیشێت, لەبەر ئەوە تائێستاش پۆستەکەی من وەری ئەگرم.

بێ گومـان کـاتی واهەیـە کەنامـەکان وەرئـەگرم بەڕاسـتی ئەمـەوێت بـزانم چـی یـان تێدایـە, جارێـك بەپێچـەوانەی هـەموو جارەکانـەوە چـەند مانگێـك لەمەوبەر دانەیەکی زۆر چاوەڕوان نـەکراوم وەرگرت کەتیایا نوسرابوو:

خۆشەویستم بابی پیلانکار

ئـەزانم بـەبینینی ئـەم نامەیـە سـەرت سوڕئەمێنێ, لەوەئەچێت هـەرگیز مـن نەناسـیتەوە بـەڵام بمناسیتەوە یا نەمناسیتەوە من ئەبێت بۆت بنوسم بەتایبەتی دەربارەی ئەو ڕاپۆرتـەی کەئەبێت

ئامادەی بکەم. بەڕێوەبەری گشتی پێش پانزەی کانونی یەکەم ئەیەوێت بەمە من تەنیا دوومانگم بەدەستەوەیە بۆ ئەنجامدانی، لەگەڵ ئەوەشدا من ئەبێت دەوری دەرۆژێك بێڵمەوە بۆ چاپکردنی ڕاپۆرتەکە: ڕاستت ئەوێت ناتوانم داوا لەکەسی تر بکەم بۆم چاپ بکات، خۆشم تەنیا بەدوو پەنجە لێ ئەدەم لەبەر ئەوە بەشێکی زۆر لەکاتەکەم ئەگرێت.

تۆ وەرە بیر لەمە بکەرەوە: من ئەمە یەکەم ڕاپۆرتم نییە، لەمەوبەر زۆری ترم پێشکەش کردووە، بەڵام تائێستا ڕاپۆرتی وەکو ئەمەم تووش نەبووە- پاشەڕۆژم بەستراوە بەم ڕاپۆرتەوە، بێ گومان من دڵنیانیم لەوەی کەبەڕێوەبەری گشتی ئەگەر ڕاپۆرتەکەی بەدڵ بوو ،پلەیەکی بەرزترم ئەداتێ.

هەروەها کێ ئەتوانێ دڵنیابێت لەوەی کە (ب.گ) ڕاپۆرتەکەی پێخۆشە؟ چونکە هەندێ جار ئەبینین زۆر دڵخۆش ئەبێت بەنوسراوێکی لاوازو بەپەلە نوسراو کەلەوانەیە پڕبێت لەزانیاری دژبەیەك. لێی ناگیرێت چونکە تەنیا خۆی ئەو مەبەستە دیاری کراوە ئەزانێت کەئەبێت ڕاپۆرتەکە بیپێکێت.

ئێمە ئەبێت ئەو بەگەمژە بزانین، چونکە خۆمان بەهەموو شتێك نازانین سەرباری ئەوەش من ئەبێت گرنگی بدەم بەئامادەکردنی ئەم ڕاپۆرتە، تەنیا دووکەس یاسێ کەسی تر پێش من ڕاپۆرتیان دەربارەی ئەم مەسەلەیە پێشکەش کردووە. (بێگومان، من نەمتوانیوە هیچیان ببینم) ئەگەر هەندێ لەیەك نەچون لەنێوان ڕاپۆرتەکانماندا هەبێت، (ب.گ) سوور ئەبێت لەسەر ئەوەی کەئەبێت هۆیەکانی بۆ دەربکەوێت، هەروەها (ووتەووت ـ یێك) هەیە گوایە یەکێك یان دوانی تر داوایان لێکراوە ڕاپۆرت لەسەر هەمان مەسەلەی لەمەڕمن بنوسن، دوورنییە بۆئەوە بێت کەڕاپۆرتەکەی منیان لەتەکدا بەراورد بکرێت.

لەڕاستیدا ئەوەی زۆر بەلامەوە ستەمە ئەوەیە دوای تەواوبونی ڕاپۆرتەکە نابێت کۆپی‌یەکی لای خۆم بێت. ئێمە بۆمان نیە وێنەیەك لەڕاپۆرتەکە بۆخۆمان گل بدەینەوە ئەبێت هەتا تێبینییە سەرەتایی‌یەکان و کاغەزی ڕەشکارییەکانیش لەناوبەرین. یەکێك ڕاپۆرتێك بەم هەوڵ و تەقەلاو گرنگی پێدانەوە ئامادەبکات لەگەڵ ئەوەشدا نەتوانێت دانەیەکی بۆ یادگار لای خۆی بێڵێتەوە!!..

هەرلەبەر ئەمەیە بۆ تۆ ئەنوسم، لەوانەیە ئەمەش بیرێکی سەرکێشانەی سەرەنجام دیاری نەکراو بێت. هەندێ کەس بۆیان هەیە وابیربکەنەوە کەئەمە شێتییەکی لەمرۆڤ نەوەشاوەیە، ناتوانم پێشبینی ئەوەبکەم چیم بەسەر دێت ئەگەر پیلانەکەم بکەوێتە ڕوو، خۆم بۆ هەموو شتێیەك ئامادەکردووە.

پیلانەکەشم ئەوەیەبەنهێنی‌وێنەیەك لەڕاپۆرتەکەبنێرم بۆ تۆ.

کۆمپانیاکە زانیاری تەواوی هەیە دەربارەی هەموو کەس و کارو برادەرەکانم، لەبەرئەوە ڕاست نییە بینێرم بۆیەکێك لەوان،ئەگەرلای تۆبێت مەترسی کەمترە. ئایا تۆ پیاوەتییەکی وا لەگەڵ هاوڕێیەکی دێرینی قوتابخانەت ئەکەیت؟.

من ناونیشانی خۆم نانوسم، چونکە نامەوێت کۆمپانیاکە بەمە بزانێت، هەروەها نامەوێت ناونیشانەکەم دەست دەزگای پەنجوانی بۆ

بازرگـانیی بلاوکردنـەوە دەربکـەوێت (هـەر چـەند لەوانەشە ئێستا لەلایان بێت). بەهەرحاڵ، دەزگای پەنجوانی بونەتە هۆی خستنە ڕووی هەندێك نهێنی پیشەسازی کۆمپانیاکەمان لەبەرئەوە هەوڵ ئەدەن پـەی بەهــەموو پەیوەنـدی و نێردراوەکـان ببـەن، لەبەرئەوە لەماوەی چەند ڕۆژێکدا بۆت ئەنوسم و پێـت ئـەڵێم لەسـەر چـی ناونیشـانێك پەیوەنـدیم پێوەبکەیت. تا ئەو کاتە ئەمەندە بەسە.

دڵسۆزت

نیخیڵ بۆس

نیخیـڵ بـۆس!! ناوەکـە لەسـەرەتاوە تووشـی سەرەخولێی کردم بەڵام دەستەواژەی (هاوڕێیەکی دێرینی قوتابخانەت) هێنامیەوە سەرخۆم، بۆس لە جەمشید پوور دوو ساڵ هاوڕێی سەرەتاییم بوو، لەڕاستیدا زۆر برادەری یەك نەبوین، من ئێستا هەتا هاوڕێ نزیکەکانی ئەو سەردەمەشم لەبیر چۆتەوە ئیتر چۆن دەست بەجێ بۆس بناسمەوە؟ مێشکی خۆم گوشی، وێنەیەکی کاڵی قوتابییەکی لاوازی چاویلکە لەچاو بوو بووە هۆی ئەوەی لە هزرگەمدا بمێنێتەوە.

نامەکـە بـە (پەنجـە چـاپ) نووسـرابوو هـەتا واژۆکەشـی هەرچـاپ بـوو، ویسـتم مـۆری پۆستەخانەکە بخوێنمەوە بەڵام ئەوەندە کاڵ بوو، نەمتوانی بزانم لە کوێوە هاتووە. تۆبیت نامەیەکی ئاوات بۆ بێت چی دەکەیت؟

سـێ چـوار جـارم خوێنـدەوە دوای ئـەوە فڕێم دایە چاوێکی مێزەکەوە. نزیکەی دووهەفتە دوای ئـەوە نامەیـەکی تـرم بۆهـات بـەم شـێوەیە نووسرابو:

خۆشەویستم بابی پیلانکار _ 28 ی ئۆکتۆبەر

ئـەم چـوار ڕۆژە ئەمویسـت دەرفـەتێکم دەسـت بکـەوێت بـۆت بنوسم، ئـەوا ئێسـتا پـەرژام وئـەبێت بەسی و پێنج دەقیقە لێ ببمەوە.

وابـزانم چـەند ڕۆژێـك لەمەوبـەر لـەبارەی ڕاپۆرتێکەوە بـۆم نوسـیبویت، لەڕاسـتیدا مـن هـیچ جۆرە ڕاپۆرتێك نانوسم، ئەمە گرنگ نییە، لەبەرئەوە ئـەوەی بـۆم نووسـیبویت ڕاسـت نییـە، هـەروەها ئـەوەش کـەوابزانم بـۆم نووسـیبویت لەجێیەکـەوە ئەچم بۆجێیـەکی تـر سـەرت سوڕ نـەمێنێت ئەگـەر پێـت بڵـێم ئـەم سـێ مانگـەی ڕابـردو لـەم ژوورە نەچومەتە دەرەوە. هەنـدێ جـار یـەکێك کـە شـەو و ڕۆژ لەگەڕاندابێت واهەست ئەکات کەهەمیشە لەیەك شوێندایە. هەرچەند جیاوازییەکی واش نیە، بەڵام بەسە بۆ ئەوەی زانیاری ڕاست نەدەیت بەدەستەوە.

ئەوەی پێوەی خەریکم تـەنیا نامەیەکە داوای هەنـدێ ڕوون کردنـەوە ئـەکات، کـاتی ئـەوەم هـاتوە داوام لێ بکرێـت ڕا دەربـارەی هەنـدێ مەسـەلەی زیندوو دەربڕم، بەس ئەوە چەند ساڵە لەخزمەتدام تـا ئێسـتا هیچـی وا نـازانم دەربـارەی مەرجـەکانی کـارگوزاری، بـەنیازم ئـەم خاڵانـەی خـوارەوە بـەرز بکەمەوە:

1ـ تکایـە ڕوونـی بکـەرەوە چـی پلەیـەکی کـارگوزاری لـە مـن بـەرزترە و چـی پلەیـەك لـەخوار منەوەیـە، مـن گومـانم نییـە، لـەوەی هەنـدێ لـەو فەرمانبەرانەی کەفەرمان بەسەر مندا ئەکەن، پلەیان لـەمن نـزمترە، لەبەرئـەوە پشـت گوێیـان دەخـەم، هەندێ جاریش ئەو فەرمانبەرانەی کە من فەرمانیان ئـەدەمێ پشـت گـوێی ئەخـەن چـونکە لـە ڕاسـتیدا پلـەیان لـە مـن بـەرزترە (بەدوریشـی مەزانـە ئەوانـەی من فەرمانەکانیان پشتگوێ ئەخەم لەڕاستیدا پلەیان

لە من بەرزترە هەروەها ئەوانەش کە فەرمانەکانی من گویٚ پیٚ نادەن پلەیان لە من نزمترە.

کەواتە کیٚ ئەبیٚت بەگویٚی کیٚ بکات؟؟.

2ـ لەسەر ئەنجامی ئەو خاڵەی سەرەوە پرسیاریٚکی تریش هەیە, ئایا فەرمانبەران هەن هەمان پلەوپایەی منیان هەبیٚت؟ ئەگەر هەن ژمارەیان چەندە؟ یەکیٚك ئەبیٚت چۆن مامەڵەیان لەتەکدا بکات؟.

چی جۆرە هەڵس وکەوتیٚکیان لیٚ چاوەڕوان ئەکەیت؟.

3ـ یەکیٚك لەو پیٚ ڕاگەیاندراوانەی وەریان گرتون ئەڵیٚت سەرجەمی موچەکەت کاتیٚك وەرئەگریت کە خانەنشین بوویت, ئەی چۆن ئەبیٚت ئەگەر یەکیٚك پیٚش ئەو کاتە وازی هیٚنا؟ ئایا هیچی دەست ئەکەویٚت؟ چەند؟.

4 . ئایا هیچ ڕیٚگرییەك هەیە میٚزەکەم ڕووبکەمە باشوور؟.

5 . ئایا ئەتوانیت مەرەکەبی سوور بەکاربیٚنیت؟.

6ـ ئایا پیٚویستە لەمۆرە ئاوییەکەی هەموو نوسراویٚك ووردبیتەوە؟.

7 . ئەگەر یەکیٚك داوای دامەزراندنی کرد, ئەوماوەیە چەندە کە ئەبیٚت لە ڕیزی نۆرەدا چاوەڕوانی پیٚبکەیت؟.

دڵنیام پرسیاری زۆرتر لەمیٚشکمدان, بەڵام هیٚشتا شیٚوەی خۆیان وەرنەگرتوە لەبەرئەوە ناتوانم لیٚرەدا دەریان ببڕم, بەڵام زۆر شادمان دەبم بەوەی ڕای تۆ بەرامبەر ئەو خاڵانەی سەرەوە بزانم, لەمەش گرنگتر ئەوەیە من بەنیازم داوای ڕونکردنەوە بکەم بەڵام تا ئیٚستا بیریٚکی چەسپاوم نیە دەربارەی باشترین وەرز بۆ دەست پیٚکردنی ئەم کارە, بەڕای خۆم وەرزی هەڵکردنی بای باشوری ڕۆژئاوا چاکترە, چونکە خانوەکان تەڕو دڵتەنگن, چەتر بەرەویٚزەی شەقامەکان بووەو سایەکەری پەنجەرەکەت دادراوەتەوە. بەڵام هەندیٚك ئەڵیٚن زستانەکە باشترە, ئەوەخراپە, من دڵنیام ئەو وەرزەی ئیٚستا تیٚیدایین چییە, لەسەرەوە نوسیومە (28ی ئۆکتۆبەر) بەڵام تەنیا ئەوە بەس نییە کاتیٚك لەپەنجەرە بچکۆلەکەمەوە ئەڕوانم, ئاسمان ساماڵە, ناتوانیت بڵیٚت ئەم ڕۆژانە دنیا گەرمە, لەهەمان کاتدا سەرماش نییە, کەواتە ئایا هاوینە؟ سەرەتای هاوینە؟ یا کۆتاییەتی؟ سیٚ ڕۆژ لەمەوبەر سەر لەئیٚوارە ڕەشەبایەکی سارد هەڵیکرد, بەڵیٚ هەتا گەڕام پاڵتۆیەکی ئەستورم پەیداکرد, کەلەبەرم کرد باشتربوم, بەڵام شەو کەخەبەرم بۆوە زۆرم گەرما بوو, هەموو گیانم ئارەقەی کردبۆوە, پاڵتۆکەم داکەندو فڕیٚمدا, جاریٚکی تر پیٚویستیم پیٚی نابیٚت, لەگەڵ ئەوەشدا کیٚ ئەتوانیٚت سویٚند بخوات ئەمە زستان نییە؟ بەزۆریی زستان لای ئیٚمە هەرئاوا ساردنەبوە. ئەگەر ئەمە زستان بیٚ و ساردوسەرما نەبیٚت, نابیٚت وەرزی هەڵکردنی بای باشوری ڕۆژئاوا بیٚت؟ بای باشوری ڕۆژئاوا بەبیٚ باران؟ بەتەواوەتیش بیٚ باران نا, چونکە دویٚنیٚ بەیانی زوو, لەپەنجەرەکەوە, سەیری دەرەوەم کرد, دیم گۆڕەپانەکە بەتەواوەتی تەڕە, سەیری دیوارەکانیشم کرد, بەڵام دیوارەکان بەخیٚرایی ئاو هەڵئەمژن لەبەرئەوە دڵنیام, لەوانەیە ئەم بەیانییە تاریك و لیٚڵە گۆڕەپانەکەیان شۆردبیٚت, ئەوەشم لە یادە ئەم ڕۆژانە دەستیان لە شۆردنی گۆڕەپانەکە هەڵگرتووە ڕاستە, بەڵام لەوانەیە دیسان دەستیان دابیٚتەوە

شۆردنی، ئەوجا، ڕۆژناڕۆژێك ئەیان شۆرد، لەبەرئەوە ئەگەر دیم سبەینێ گۆڕەپانەکە تەڕبوو ئەوە ئەگەیەنێت دیسان دەستیان کردۆتەوە بەشۆردنی، لەوانەیە بەم جۆرە ماوە ناماوەیەکی کورت بیشۆن، لەبەرئەوە لەڕاستیدا ناتوانم دڵنیابم لەوەی ئایا دوێنێ باریوە یان گۆڕەپانەکەیان شۆردووە؟

لەبەر ئەوە کارێکی بەجێیە ئەگەر بتوانیت یارمەتیم بدەیت لەهەڵهێنانی ئەم مەتەڵانەدا تۆ لەبۆمبای ئەژی، ئەبێت زۆر شارەزاتر بیت لەبارەی ئەم جۆرە شتانەوە تا ئەوکاتەی ئامۆژگارییەکانی تۆ ئەبیستم ئەو نامەیەش کە بەنیازم بینوسم شێوازێکی دیاریکراوتر لەمێشکمدا وەرئەگرێت.

باسکردنی ناوێت، ئەمجارەش ناتوانم ناونیشانی خۆمت بۆبنوسم، لەنامەی پێشودا بۆم نوسیبویت، بۆ پێویست ناکات مرۆڤ هەموجارێك بیانویەکی بەهێزبێنێتەوە لەماوەی چەند ڕۆژێکدا پێت ڕائەگەیەنم چۆن بتوانیت پەیوەندیم پێوەبکەیت.

سەرەنجام باشە

وەرزەکە هەڵەیە

نامەکە لەم خاڵەدا تەواو بووە وەکو بەنیوەناچڵ بەجێ هێڵرابێت، ئیمزای لەسەر نەبوو لەسەر پەڕەیەکی شینی دەفتەری تێبینی نوسرابوو بەخەتێکی ئەستوری خوار، زۆر دڵنیانیم، بەلام واهەست دەکەم نوسەرەکەی ویستویەتی بەدەست وخەتێك بنوسێت کەنەناسرێتەوە، ئەتوانم پۆستە مۆری ئەم نامەیە بخوێنمەوە، ناوی شارەکە ئاشکرا بوو هەرهەمان شوێنی سەرنامەکەی پێشووە. ئەم نامەیەشم سێ چوار جار خوێندەوە و خستمە ئەولاوە. لەماوەی چەند ڕۆژێکدا نامەیەکی ترم پێگەیشت..

خۆشەویستم باوکی پیلانکار

من خەریکی خۆئامادەکردنم بۆ دەست لەکارکێشانەوە، زۆر بەڕاستیشمە.

لەو ڕۆژەوەی ئەم کارەم دەست کەوتوە شتێك لەمێشکی خۆمدا تاوتوێی ئەکەم، ئێستا بۆم دەرکەوتوە، ئاشکراکردنی پێشکەش کردنی ئەم داواکاری دەست لەکارکێشانەوەیە.

ئایا ئەتوانم، دوای ئەوەی لەکار کشامەوە، سواری شەمەنەفەرێك ببم وبێم لەلای تۆبژیم؟ لەو باوەڕەدام باش بەیەکەوە بگونجێین. بیر لەم مەسەلەیە بکەرەوە. بێ نامەت ناکەم.

ن .ل .ب .

نامەکە بەرواری پێوە نەبوو، بەدەست و خەتێکی تر نوسرابوو، پیتی ڕێك ڕێك و وشەی دوور لەیەك، بەشێوەیەك هەر ووشەیەك ئەتوت دورگەیەکە. بەوردی لەنامەکە ڕامام. هەتا پەستیش بوم، بەچی مافێك دێت و لەتەك مندا ئەژی؟ ئایا ئەزانێت من پیشەم هەیە یان نا؟ ژنم هەیە یان نا؟ چەند منداڵم هەیە؟ چەندیان کچن؟ تەمەنیان چەندە؟ ماڵکەم چۆنە؟ چەند ژوری تێدایە؟ ئایا باوکم ماوە؟ دایکم ماوە؟ باری ئابوریم چۆنە؟ نامەکان قەیناکات، بەلام کابرایەکی زرپ و زیندو خۆی؟!.

ڕاویژێکی خۆمم کرد، لەخۆمم پرسی: چۆنە ئەگەر بەڕاستی بێت و لەتەك مندا بژی؟ من ئەوە سێ ساڵە بەتەنیام لەم ژوورەدا، بێجگە لەخۆم

کەسی تری تیا نەنوستوە, من بەڕوتو قوتی ئەچمە ناوجێگــاوە, تیتــوڵێکم لەبــەردا بێــت خــەوم لێ ناکەوێت, ئەمە چۆن ئەکرێت ئەگەر ئەوبێت و لێرە بــژی؟ مانــای ئەوەیــە ســاڵ دوانــزەی مــانگ شــەو نەخـەوم. لـەم گێـژاوەدا مامـەوە. لـەماوەی دو ڕۆژدا نامەیەکی تر گەیشت:

بابی گیان

کاتێك ئەم کارەم دەستگیر بوو, باوەڕم وابوهەر زۆر بــێ عەقڵییــە تەنانــەت بیریــش لەدەســت لــە کارکێشانەوە بکەیتـەوە, ئـەی باشـە دوای ئـەوە بـۆ هـەربیرم لای دەست لەکارکێشانەوە بو؟ بـۆ ئـەوەی پارێزگـاری چـالاکی و گـورج و گـوڵی خـۆم بکـەم؟ لەوانەیـە, بـەڵام ئایـا بەڕاسـتی مـن بیرم لەدوانامـەی دەســت لەکارکێشــانەوە کردۆتــەوە؟ مــن چــیم ویســتووە؟ ئــەو ووشــانە چــی یــان کــردووە لەمێشکمدا؟

ئێســتا, کــەم تــا زۆر قەناعــەتم, ئــەوەی مــن ویستومە بینوسم شتێیەکی جیاواز بوە, لەڕاستیدا, مێشــکی خــۆم مانــدوکردوە بــۆ ئــەوەی شــێوازی داڕشــتنی نامەیــەکی تاوانبــارکردنی ڕەخنــەئامێز دابنێم کەهەموو شتێیەك لە شوێنی شایانی خۆیدا دابنێـت, مـرۆڤ ئـەبێت لـەم جۆرەکارانـەدا, ئاگـای لـەخۆی بێـت, ئـەبێت هـەموو ووشـەیەکت بکێشیت, ئەبێت بۆ چەند جارێك بە بەڵگەو ڕاستیەکانی لای خۆمدا بچمەوە و هـەڵیان بسـەنگێنم. من ئێستا لـەو بـاوەڕەدام, لـەخۆم ڕائـەبینم و گیـانی ئـەوەم تێدایـە سەرکێشییەکە ئاوابکـەم, لەبـەر ئـەوە سـورم لەسـەر ئەوەی بزانم سەرەنجامی بەچی ئەگات, ئەم چەند مانگـەی ڕابـردو, بـەوردی کاروبارەکـانی کۆمپانیـام لێـك ئەدایـەوە, بەتایبـەتیش هـەموو جوڵـەکانی (ب .گ). هـەر لەوماوەیـەدا دەزگـای پـەنجوانی هەنـدێ نهێنی پیشەسازی ئێمە یان دەست کەوتوە, کەوتنـە بەرهـەمهێنانی هـەمان کەرەسـتە. ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ دڵنیاتر ئەبم تەنیا کەسێك لێپرسراوی ئەم کارە بێت هــەر (ب.گ) خۆیــەتی, شــتی تــریش زۆرن, کــەبۆم دەرکەوتون.

لەبەرئەوە بەهیوای نوسینی نامەیەکی درێژم, بەبەڵگــەی تــەواوەوە, ڕاســتەوخۆ بــۆ ئەنجومــەنی بەڕێوەبەرایەتی باڵا.

لێـرەدا پێویسـتم بەیارمـەتی تـۆ هەیـە. بـۆمن مایەی سەلامەتی نییە لێرەوە خۆم بینێرم لەبەرئەوە بەپۆســتەدا ئــەینێرم بــۆ تــۆ, پەنجەچــاپی بکــەو بەپۆستە بینێرە و ڕەشکاریەکە بسوتێنە. شتی تر هەبوو ئەمویست دوبارە بۆت بنوسم. بەڵام کاتەکە کەمی بەدەمەوە ماوە.

دڵسۆزت

ساتچیدائەناند

نامەکــە, ئیمزاکــەی نــەبێت. ئــەوی تــری پەنجەچاپ بوو.

سـەیرە! من ئێستا دڵگرانم بەوەی کەنایـەت و لەتەکمدا بژی! ئەچوم بۆ وێستگەی شەمەندەنەفەرو پێشــوازیم ئــەکرد. جانتاکــەم بــۆ هەڵئــەگرت. چاکەتەکەتم ئەکرت بەتاکە سنگەکەی ناو ژورەکەم دا, ئەگـەر فڵچـەی دانەکـەی لـە بـیر بچـوایە خێـرا ڕامدەکردو ئەچوم دانەیـەکم بۆ دەکڕی. ئەم بـرد بـۆ سینەما. زۆر تامەزرۆی ئەوە بوم پرسیارێکی زۆری لێ بکەم, باری سەرنج بگۆڕینەوە!

بۆمـاوەی دوومـانگ و نیـو نامـەی دیـار نـەبو, بڕیــارم دا باشــتر وایــە لــەبیری بکــەم دوای ئــەوە, ڕۆژێك, نامەیەکی ترهات:.

2ی شوباتی 1997

خۆشەویستم بابی پیلانکار

هــــەموو شـــتێیەك هەڵوەشــــایەوە, ســــەرم ســــــورئەمێنێت چــــۆن بــــیرم لەنوســــــینی نامەیــەکی تاوانبــار کــردن کردۆتــەوە. نامەیــەکی تاوانبـــار کـــردن ؟! دانیشــــم ئەوانــــە بنوســــم کەبەتاوانبارکردنیان ئـەزانم؟!. لـەپڕ هەسـتم بـەخۆم کرد کە داوانامەیەکی لێبوردن ئەنوسم. بەڵێ داوای لێبوردنم کرد:.

لـەوەی کاتێـك کـە پێنوسـەکەم داداوە, سـەرم هەڵبڕیوە

لەوەی لەپێچی کۆڵانی سێیەم ئاوڕم بۆ دواوە داوەتەوە

لـــەوەی کەبـــەیانیان ددانم بشـــۆم, لـــەوەی (دۆزینەوەی هند)م خوێندۆتەوە

لـــەوەی کـــە ســـێوێکم لەســـەر پەنجەرەکـــە بەجێهێشتوە تا گەنیوە

لەوەی کەبۆنم کردوە بەڕۆژنامەیەکەوەلـەکاتی دەرچونیدا

لـەوەی کەسەرچـاوەی بـیر ڕونـاککردنم پشـت گوێ خستوە

لەوەی کەبە پەرداخێکی سەوز خواردومەتەوە

لەوەی کەناوی دیڤیداس باکسی- م هێناوە

لەوەی کەنینۆکم نەبوە

لـەوەی کـەئارەزوم هـەبوە لای لایـە بـۆ منـداڵ بنوسم

لەوەی کە ووشەی نوسراوم سڕیوەتەوە

لەوەی کە هالأوی دەمم کردوە بەئاوێنەدا

لـەوەی کـە نامەکـەم بـۆ تـۆ نوسـیوە. کـە ئەمـە دواینیانە

بـەش بـەحاڵی خـۆم ئـەتوانم بڵـێم هـیچ کاتێـك بەبێ هۆ بۆم نەنوسیویت, ئەمجارەش ئەم نامەیـەت بـۆ ئەنوسـم بـۆ ئـەوەی پێـت بڵـێم: هـەموو نامـەکانم بسوتێنە, وادانێ ئەمە لەبری هەمویانە. زۆر درێـژەم دایە, ببورە.

ئیمزا

نامەکــــە بــــەئینگلیزی ئیمــــزا کرابــــو, بــــەڵام نــــەمتوانی ئیمزاکــــە بخوێنمــــەوە, پیتــــی یەکەمی ناوی یەکەمی چ, یان ج بوو هـەروەها پیتـی یەکــەمی نــاوی دوەمیشــی دیســان چ یــان ج بــوو, لەدڵی خۆم دا وتم:.

کەواتـە ئێسـتا ئـیتر پێویسـتە لـەبیری خـۆمی ببەمـەوە, بـەڵام بەڕاسـتم نـەزانی نامـەکان بـدڕێنم, فڕێمدانە بنـی چەکمەجەی مێزەکەوە, دوای ئـەوەی دەستم کـردەوە بـەزەرفی کاغـەز دروسـت کردنـەوە و هـەموو شـتێیەکم دەربـارەی نامـەکان لـەبیر چـۆوە دوای مانگێك نامەیەکم بۆ هات:.

بابی:

لەوە ناچێت بچم بەهیچ لایەکدا. لەبەر ئـەوەی دەســــــتم دایــــــەوە نوســــــین, ڕەشـــــکاریەکانم دڕانــــد, دیســــانەوە دانیشــــتمەوە, دیســــانەوە پــــەڕەکانم دڕانــــدەوە, ئــــەوەتا دیســــانەوە چــــەند ڕۆژێــــك مێشــــکی خــــۆم گوشــــی ســــەرلەنوێ ئەیانوسمــەوە, تــەنیا ڕۆژی دوای ئــەوەی کــەزانیم ئــــەم جارەیــــان زۆر لــــەخۆم دڵنیــــام ئەمــــەوێت دەربــــارەی خــــۆم بنوســــم, هــــەموو شــــتێیەك دەربارەی خۆم, لەوانەیە هەر بۆخۆشم بنوسم, ئەوە ئاشــکرایە چــی چــاوەڕوانم ئــەکات. مــن نــاوم لەولیستـەدانیە کەلەبەرچـاوگیراوە, لەگـەڵ ئەوەشـدا دووەم ڕۆژ زانــــیم کەلیژنــــەی بەڕێوەبەرایــــەتی

کۆمپانیاکان بەشێوەیەکی فراوان بەپیاوانی‌سەربە پەنجوانی موتوربە کراوە ئیتر مەسەلەکە ئەوەندە بەلامەوە گرنگ نەما.

ئەمەویت دواتکات لیٚبکەم, ئەم چەند لاپەڕەیە کەدەربارەی خۆم نوسیومە نامەویت بکەویتە دەست کۆمپانیاکەمان/ دەزگای پەنجوانی

ئایا دەتوانیت بیٚیت بۆ ئەم شوێنەو لەگەڵ خۆت بیبەیت؟ چونکە ناتوانم بەپۆستەدا بینێرم. دوای سێ ڕۆژی تر وەرە بۆ ئەم ناونیشانەی خوارەوە تا ئەو کاتە منیش تەواویان ئەکەم

ناونیشانەکە:.

سەفالیا

شەقامی دکتۆر ئەمبیدکار

سیتاپور

لەژورەکەم دا, لەچەکمەجەی مێزەکەم دا, دەفتەرێك ئەبینیت کەبەرگەکەی وێنەی (نەهرۆ)ی پێوەیە, پەڕەکانی بێخەتن, ئەمە ئەو نوسراوەیە کەئەبێت دووری‌بخەیتەوەو بیپارێزیت. من بۆیە ئەمەت بۆ ئەنوسم چونکە لەوانەیە کاتێك تۆ ئەگەیت من لێرە نەبم, نامەکە بەرواری پێوە نەبوو, ئیمزا نەکرابو, لەسەرپەڕەیەك نوسرابو کە لەدەفتەرێك کرابۆوە. نوسینێکی زۆر ناشرین و ناقۆلاٚ نوسرابو, وات هەست ئەکرد هەموو پیتێك لەهەر ووشەیەك بەهێواشی‌و بەناڕەحەتییەکی زۆر نوسراوە. سەرم سوڕمابوو, نەمئەزانی چی بکەم. بچم بۆ ستیاپور؟!.

لەلایەکەوە پەرۆشی ئەوە بوم بچم, لەلایەکی تریشەوە ئەترسام پیٚ ڕابواردن بێت. ئایا بڕوابەم نامەیەبکەم؟ تۆ بڵێی سەفەرێکی بێکەڵك نەبێت! چونکە من لەبارێکدا نیم کەڵکی ئەوەم پێوە بێت پارەبەفیڕۆبدەم. ڕاستە, هەندیٚ پارەم لەزەرف دروست کردن پاشەکەوت کردوە. دوو ڕۆژ لەسەریەك دودڵ بوم, شەو خەو نەئەچوە چاوم. بەیانی ڕۆژی سێیەم هەستام, دەم و چاوم شۆرد, هەندیٚ کەل و پەلم پێچایەوە, جانتایەك و ڕووم کردە وێستگەی شەمەندەنەفەر .لەوێستگەی ستیاپور دابەزیم و چومە ناو شار ,شارێکی پیس و دڵتەنگ دیار بوو, شەقامەکانی قیرتاو بون, بەلاٚم تەنگەبەربون و پڕبون لەتەپ و تۆز. من لەئەنجامی ئەوەی ڕۆژێك بەڕێوە بوم هەمووگیانم تێك شکابو, چاوم هەڵنەئەهاتن, کاتیش دەمەوئێوارە بوو, بەلاٚم هەوا هێشتا گەرم و ووشك بوو. ماوەیەکی پێچوو تا گەشتمە شەقامی ئەمبیدکار, کەس ناونیشانی تەواوی پیٚ نەئەوتم , خەڵکەکە سست و کەمتەرخەم بوون, بەشێوەیەك لەسەر سەکۆکانیان و بەر دەرگاکانیان پان بوبونەوە بێکارییان پێوە دیاربوو.

کەگەیشتمە شەقامی ئەمبیدکار ئەو دەمەبو ڕۆژ لە ئاسۆ ئاوا دەبوو.

چێشتخانەیەك لەسیلەی شەقامەکەدا بو, لەولای ئەوەوە دوکانی بەقاڵێك بوو, بەدەستی چەپدا لولەیەك دوکەڵ بەهێواشی بەئاسماندا بلاٚوئەبۆوە. بەناو کۆمەڵێك گەنج دا تێپەڕیم کەلەدەوری قەلەڕەشێکی تۆپیو کۆبوبونەوە, لەلای ڕاستەوە دەرگانیشانێکم دی لەسەری نوسرابو (سەفالیا), خانویەکی یەك نهۆم بوو, دیار بو زۆر کۆن بو ,بەلاٚم تازە بۆیەکرابۆوە. خۆم کرد بەژووردا, چەند چرکەیەك لەدالاٚنەکەدا وەستام. ژورەوە هێمن دیار بوو, لەپاشدا پیرەمێردێك هاتەدەرەوە.

پیاوێك لێرەیە ناوی بوسی بێت؟

تۆكێیت؟.

هاوڕێی ئەوم، پیلانكار

پیرەمێردەكــە ســەرێكی لەقانــد، بەواتایــەك چـاوەڕێ بكـەم، چـوە ژورەوە، بەكۆمـەڵێك كلیلـەوە هاتە دەرەوە، چاوێكی لێ داگرتم كە بەپاچینەكانی پشتەوەدا بەدوایدا سەركەومە سەرەوە.

دەنگــی كـابرای پــیرە بــە پــاكی لــە جــیڕەی پاچینەتەختەكان ئەهاتە دەرەوە

ئەم بەیانیە لەخەستەخانەوە هاتن لاشەكەیان بــرد، خـــۆی رایســـپاردبو لاشـــەكەی بـــدرێت بەخەســـتەخانە. پیرەمێردەكەدەرگاكـــەی كـــردەوە، پێمنایـــە ئـــەودیو، بـــەدەوری خۆمـــدا ڕوانـــیم، تەختەیەكی نوستن، مێزێك، چەند كتێبێك، چرایەك لەســەر مێزەكــە، تەپڵــەكێكی جگــەرە، دووپاكــەتی هەڵنەپچڕاو هەنـدێ كـراس و پـانتۆڵ كـەكرابون بـە دوو ســـنگدا بـــەدیواری ژوورەكـــەوە. لەگـــەڵ كــەنتۆرێكی زلــەی كــەل و پــەل لــە سوچــێكی ژورەكـــەدا. خـــۆم بەهەڵخەڵـــەتاو هاتەبەرچـــاو كـــەئاوا دەســـت بـــەتاڵ دەرچـــوم، لـــەكاتێك دا چاوەڕوانی ئەوەم ئەكرد كەهەنـدێ شتی نائاسایی لەم شوێنەدا ببینم!

پیرەمێردەكە، بێدەنگ بەلامەوە هەڵوەستابوو، چــەند هــەنگاوێك چــومە پێشــەوە، چــەكمەجەی مێزەكـەم ڕاكێشا، كاغـەز، چەند دەفتـەرێك، قەڵـەم، پانـــدان، هەنـــدێ پـــارەی وردە، چـــاوم خشـــاند بەدەفتەرەكانـدا، ئـــەوەیانم دەرهێنـا كەبەرگەكـــەی وێنــەی (نــەهرۆ)ی پێــوە بــوو، خســتمە جانتاكــەم، جانتاكەم داخست، سەیرێكی پیرەمێردەكەم كرد. خــۆی كــەنارگرت و ڕێ كــەی بــۆ چــۆڵ كــردم.

هاتمەدەرەوە. تا پیرەمێردەكە دەرگاكەی داخستەوە مــن لەپلــەكان دابــەزیم. لــەڕێگای گەڕانەوەمــدا دەفتەرەكـەم دەرنـەهێنا. تـەنها ئـەو كاتـە دەرمهێنـا كەگەیشتمە ماڵەوە.

دەفتەرەكە هیچی تێدا نەنوسرابو، دوالاپەڕەی نــەبێت بەدەســت و خــەتێكی نــاخۆش نوســرابوو (نیخیـــــڵ). جـــــارێكی تـــــر بەدەفتەرەكـــــەدا چومەوە، پـەڕە پـەڕە هەڵمدایـەوە. ئایا ئەمـەوە ئـەو دەفتەرەیــە كەباســی كردبــوو؟ بەرگەكــەی وێنــەی نەهرۆی پێوەیە. بەڵام ئایا كەسی ترپێش من چۆتە ژورەكـەو دەفتـەرە بـاس كراوەكـەی بـردو ......وە، یا، بردوو.......یانە؟

ئایا، دڵم لەپیرەمێردەكە پاك بێت؟

هەسـتم ئـەكردپێم ئـەڵێن یـەكێكی تـر پـێش مــن چــەكمەجەكەی داوە بەیەكــدا، لەوانەیــە مــن هەڵــەبم یــا لەوانەیــە ئــەو كەســەی پــێش مــن كــە لەوانەیەــ پیرەمێردەكــە بێــت. بــۆ شــتێكی وەكــو پــارە گــەڕابێت و دەفتەرەكــەی دەســت كەوتبێت.

جــارێكی تــر گەڕامەوەســـەر دوالاپـــەڕەی دەفتەرەكە.

ئایا ئەمە دەست وخەتی ئەو خۆیەتی؟ ناتوانم هــەتا لەمــەش دڵنیــابم! یەكــەم نامــەی ناوەكــەی بەپەنجەچاپ نوسرابو. دوای ئەوەش نامـەكانی ترم بــەناوی جیاجیـاوە بۆئـەهات و بەدەسـت و خــەتی جیاجیا.

ئایـا پـێم ئەسـەلمێنێت ئـەو نامانـە هـەمویان ئــەو نوسیونیــ هــەمویان هەریــەك كــەس بــوون؟ ئەگــەرهات و ئــەم نامانــەم پیشــانی كەســێك داو وتـــی (ئەمانـــە هـــەمویان خـــۆت نوســـیوتن)

چــۆن ئــەتوانم بیســەلمێنم وانیــە؟ مــن هێشــتا دەفتەرەکەم لایە. هەڵدانەوەی بەردەوامی پەڕەکانی وا لێ کــردوە هــەموو گوێچــکەکانی ســەرەوەیان نوشتاوەتەوە.

## سەرچاوە

*Asian new quarterly,Magazine of Asian Writers.*

*Indian selected short stories*

*Letters from Nikhil*

*Rabbit*

*By Vilas Sarang.*

ئــەم نوســەرە لــە کۆلیــژی ئــادابی زانکــۆی بەســـرە وانـــەکانی درامـــاو شـــیعر وئـــەدەبی ئنگلیــزی پێئــەوتین، چــەندین وێنــەو یادگــاریم لەگەڵیـدا هەیە،بەرەگـەز ماراسـییە. پەیوەنـدیمان نیـە، بـەلام لــە ڕێگــای ئینتەرنێتــەوە زانیومــە لــە زانکـۆی ئینـدیانای ئەمـەریکی مامۆسـتایەو هـەمان ئـەو وانانـە ئەڵێتـەوەو لـەو زانکۆیـە دکتۆرایـەکی تـــری لەئـــەدەبی ئیســـپانیدا وەرگرتـــوە دوای ئـەوەی دکتـۆرای یەکـەمی لـەزانکۆی بۆمبـای لـە ئـەدەبی ئینگلیزیـدا وەرگرتبـوو. کـاتی خوێنـدنم لـە زانکــۆی بەســرە گۆڤــارێکی ئنگلیــزی نیشــاندام، چـاوپێکەوتنێکیان لەگەڵـدا سـازدابوو بەناونیشـانی: ئـەو چـیرۆك نوسـە مەزنـەی بەخوێنـدکاریی چـووە زانکـــــۆی بۆمبـــــای و بـــــە ســـــەرۆکیی بەجێیهێشت.

# ڕانانی کتێب

## ژن لەناو گەلە جیاوازەکاندا

### ژیانی کۆچەریی کورد

**Amand v. Schweiger - Lerchenfeld**
لە سویدییەوە: هەندرێن

# ژن له ناو گەله جیاوازەکاندا

## ژیانی کۆچەریی کورد

**Amand v. Schweiger – Lerchenfeld**

له سویدییەوە: هەندرێن

### لەبری هەڵوەستەی هەڵوێستێك

له زستانێکی بەفرپۆشی کۆڵانه کۆنەکانی ستۆکهۆڵمدا، لەمدیوی شووشەی پەنجەرەکەوە دیمەنی کتێبه بەرگ زەرد و کۆنینەکان، بۆ ژووری کتێبفرۆشه کۆنەکه *Antikvariat* پەلکێشیان کردم. به دەم ونبوون له ناو خەیاڵی نارنجی تابلۆ و کتێبەکانەوە، که گیرفانی چکۆلەی من دەرەقەتی نرخەکانیان نەدەهات، ژنه کتێبفرۆشەکه به پرسیارێك بێداری کردمەوە: "گەر یارمەتیت ویست پێم بڵێ." پاش وێستێك، لەبەر ئاوێزان بوونی من به کتێبەکان، دیار بوو حەزی کرد بزانێ کوێندەریم. به دەم وەرامی منەوە، کتێبێکی زلی بەرگ قاوەیی پەڕ کۆنی گرته دەست و دەستیکردە قسەکردن لەسەر تایبەتمەندی ژنی کوردەوە. بەلای ئەوەوە سەیر بوو، که چۆن به بەراورد لەگەڵ ژنی عەرەب، فارس و تورك، مێژووی ژنی کورد خاوەنی زۆر خاڵی پرشنگدارە، کەچی ئەمڕۆ له سوێد بابەتی "شەرەف" به کوردەوە ناوبانگی پەیدا کرد. دواجار باسی کەسایەتی ژنانی دونیای ئیسلامی کرد و دیسان بەلایەوە پرسیار بوو، که دەبوو له سوێد ژنی کورد، بەو مێژووە تایبەتەی که هەیەتی، بیتوانیبایه ئەو تایبەتییه مێژووییەی خۆی نمایش بکات. لێرەدا جێگەی پرسیارە که ئەمڕۆ، به بەراورد لەگەڵ سەدەی نۆزدەدا، ناتەباییەکی سەرنجکێش له دیدی ڕۆشنبیرییانەی سوێد قووتدەبێتەوە: لەم ساڵانەی دواییدا، دوای کوشتنی "فاتیمە"، چەمکی "شەرەف" له میدیاکانی سوێد هاوواتای وێنەی کوردی بەرجەسته کردەوە، کەچی له دەورانی سەدەی نۆزدەهەم، وێنەی ژنی کورد، هەروەك له وتاری ناوبراودا دەبینین، هاوواتای نموونەی ژنی هەڵکەوتووی وێناندووە.

بەهەرحاڵ، نرخی کتێبەکە بە من قەرەبۆ نەدەبوو. بەڵام ئەو ژنە بە ڕەچەڵەك "لیّتوانیە"، گووتی گەر ئەو وتارەی لەسەر ژنی کوردە، وەربیگێڕیّ، بۆت کۆپی دەکەم، منیش وادەی ئەوەم پێدا. جێگەی سەرنجە کتێبی، "ژن لە ناو گەلە جیاوازەکاندا"، کە چەند نووسەری ئەڵمانی نووسیویانە، وێڕای وڵاتانی ئیسلامی، هەروا ژنی چەندان گەلی تری بەخۆیەوە گرتووە.

لێرەدا گرنگە بڵێم، ئەو کتێبە لە ساڵی 1881 کراوەتە سویّدی، کە لەگەڵ زمانی ئەمڕۆی سویدی زۆر جیاوازە، بۆیە وەرگێڕانەکەی هەم دواکەوت و هەمیش مایەی سەرئێشەیەکی زۆر بوو. هاوکاتیش ئەو دوو دەقە شیعرەی کە سەرچاوەی نووسەرە، لە وتارەکەیدا، من ئازادانە بە کوردی شرۆڤەم کردوون، کە بوارم نەبوو بە دوای خودی دەقە کوردییەکاندا بگەڕێم.

هەروا بێتەوە، گرنگە ئاماژە بەوە بدەین، کە ئەمڕۆ ژنگەلێك بە ناوی دەمڕاستی داکۆکیکەرانی ژنی کوردەوە، بە خۆپیشاندانە بێتامەکانیان لە شەقامەکانی ستۆکهۆلم، دیاردەی "شەرەف" ئازاری ژنی کوردیان کردۆتە بازاری ماددی و ئیقامە وەرگرتنی خزم و حیزبە خێڵ ئاساییەکەیان. بۆیە ئەمڕۆ دەبێ کورد ئەوە بزانێ، کە لیستی پۆلیس و دائیرەی پەنابەران لە وڵاتی سوێد، پڕە لە ناوی ئەو ژنانەی کە گوایە لە کوردستان و سوێد، قوربانی هەڕەشەی کوشتنی "شەرەف"ن، دواجار، ئەو تەرزە بە ناو فێمێنیستە تووتییەی کورد، لێرە سەرقاڵە بەوەی کە بە ڕۆژئاوا بڵێ، "کولتوری شەرەف"، بەرهەمی مێژووی کوردە. ئەوە نابێ مانای ئەوە بێ کە من لێرە بەشێك لەو جیهانبینییە سەقەتەی کورد بە دژی ژن فەرامۆش بکەم. بەڵام بەو شێوازە ساختەیە، ژنی کورد، وەك پیاوە ڕووناکبیرە هاوڕێکەی، بە خۆ نامۆبوون و خنکانی لە ناو دەسەڵاتی کولتوری باڵادەستی "نێوەند" *center* ، بە بەرجەستەکراوی پیادە دەکات.

بەهەمەحاڵ، ماوەتەوە بێژم، کورد لە ڕێگای بێگانەوە ئاشنای مێژووەکەی خۆی بووە، کەچی کوردگەلێك لە دیوە پرشنگدارەکانی مێژووەکەمان بێ بەرییە. ئەمڕۆ وەك چۆن ڕووناکبیری پیاوی کورد، هەروەك "ڕۆئیا تەلوعی"ش لە دەقەکەی، "پەیڤی من و ئۆلیمپ دوگوژ" بە جوانی ئاماژە بەو تەرزە ڕووناکبیرە دەکا، کە سەرقاڵە بە گواستنەوە ونبوون لە ناو هزری دەرەکی، کە بانگەشە و خودی بونیاتی کەسایەتیەکەی لەگەڵ یەکتردا لێکدژن، وەلێ ژنی ئەمڕۆی کورد، زۆرینەیان، لێرەدا ناکرێ چەند نموونەی ژنی کورد، کە بە بەراورد لەگەڵ زۆرینەی ژنە بەرژەوەندخواز و گەمەبازەکان لە کردە و نووسیندا لە یاد بکەین، وەك ڕووناکبیرانی پیاو سەرقاڵن بە قسەی زلەوە، بازرگانی ڕۆشنبیریی و لاسایی و گواستنەوەی هزری فێمێنیزمی ڕۆژئاوایی، بەشێکە لەو ژنە بەناو خەباتکارانەی ژنی کورد، وەك وێنەی نووسەرە پیاوەکان، لەبەر مۆدەی زاراوەبازی ڕۆژگار، بێ ئاگان لە مێژووی ژنی کورد. من ئەو چەشنە ڕووناکبیرە نێر و مێیە مۆدەخواز و بازارخوازە بە "مەلای خوتبەکار" و "مەلا ژن"ی ئاوقات ناودێر دەکەم. (بە داوای لێبووردنەوە، کە بۆ ساتێك سەرم گەرم دەکەم بەو پرسە ئاڵۆزەوە). ئەوەی پێویستە بگووترێ، تا ژنی کورد، لەو پەتای لاسایی و گواستنەوەیە بە دوور بێت، هەروەك ئەم وتارە وەرگێردراوە بەرجەستەی

دەکاتەوە، دەکرێ بگەڕێتەوە ناو جەستەی مێژووی ژنی کورد کە هەم بەردەوامی ڕۆحی خۆماڵی خۆیەتی و هەمیش تژییە لە ئاسۆی پرشنگدار و پۆزەتیڤانە بۆ بنەمایەکی ڕەسەنی بزاڤی ژنی کورد. لێرەدا، بەرانبەر ئەو وێنە نالەبارەی کە ئاماژەم پێکرد، دەکرێ ئاماژە بە "لەیلا زانا"، بکەین، کە وەك میراتگرێك یان دیاردەی کۆنتێکستێکی کوردی، وێنەی دەستە خوشکانی خۆی" مێژووی ڕووناکی ژنی کورد، بەرجەستە دەکاتەوە. لەیلا لە ساتەوەختێکی پێویست، وەك ژنە کوردێك، پیاوە دەسەلاتدارەکانی ئەمڕۆی ناچار کرد، کە گوێی لێبگرن. بۆیە دەبێ بڵێین، لەیلا نەك هەر جەربەزانە لە هەوڵی ئەوەدایە کە ڕێز و جۆرە مافێك بۆ کورد بەرجەستە بکاتەوە، بەڵکو تەنانەت دەکرێ کۆمەکییەك بێ بۆ ڕزگارکردنی تورکیاش لەو تەنگژی و داتەپینەی کە سەدەیەکە ناخی سیخناخ کردووە.

هەڵبەت، وەك ئاشکرایە بزاڤی فێمێنیستی ڕۆژئاوا، بەرهەمی کۆنتێکستی مێژووی فرە دیوی خۆیەتی: لە پاڵ شۆڕشی فەرەنسی، "ژان دارك" و دواجار "ماری ویلستۆنکرافت" و وێرای کایەکانی "ڕۆشنگەریی" لە سەرەتایەکانی سەدەی نۆزدەهەم، کە ئەم وتارە وەرگێڕدراوەی ئێرە، لەو کاتەدا نووسراوە، کە بزاڤی فێمێنیزمی ڕۆژئاوا هێشتا لە گاگۆلکێدا بووە. دواجاریش کتێبی، "ڕەگەزەکەی ئەویتر"ی "سیمۆن دێ بۆڤوار"، وەك ئاوێنە بوونەوەیەکی ئەو کۆنتێکستە، دەبێتە ئینجیلی بزاڤی نوێگەریی فێمێنیزمی ئێستای ژنی ڕۆژئاوا.

لەم ڕوانگەیەوە، لە بەرجەستە کردنەوەیەکی سەدەدا گەرەکمە بێژم، گەر ژنی کورد ماڵی ئاوەدان، مێژووی ژن و ژیانی کورد فەرامۆش بکا، دواجار، وەك وێنەی زۆرینەی سیاسەتمەدار و ڕووناکبیرە سەرقاڵەکانی ئەمڕۆی پیاوانی کورد، ئایندەی کیژە تازەکان و پرسی ژن بە کولتووری بیژۆکی گواستنەوە و لاسایی سیخناخ دەکەن.

گەلێکی موحەمەدیانی بەشێکی زۆر لە ئازادی ژیانی ژنانی موحەمەدیانی - کوردان بە تێکڕایی - پاڵەوانە کوردانەییەکان و سترانە ئەڤیندارەکان - ژن و زارۆکان، کە لە لای تورکانەوە دەفڕێنران، ڕۆمانسیەتێك - ژنە ئەفسانەیەکی جەنگاوەری وەك کارا فەتیمە، ژنە شەیتان پەرستەکان و ئاهەنگە ئاینییە شەوانەییەکان - "چۆپی" یان هەڵپەرکێی نەتەوەیی بەخۆوە گرتووە.

کورد وەك شوێن لە تورکە ئەناتۆلیەکان نزیکن. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تێزکە پێویستی بە بەڵگەیەکی تر هەبوو، پاش بڕوایەکی دڵنیا تاکو ژیانێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی بخەملێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە ژێر کاریگەری ئاووهەوا، پەیوەندی سروشتی، دابونەریت و هاوسەفەری ئەمانە لە خودی خۆیدا کە هەمیشە شێوەی تازە وەردەگرن. بەمجۆرە سەفەر دەبێتە مایەی ژیان، کە ئێمە ئێستا بە ڕێگای خەڵکانی دەڤەرە ئیسلامییەکان، خۆمان تەرخان دەکەین تاکوو تیشکێك بخەینە سەر نموونەی ئەو ڕاستییە. لە جەم تیرە ئیسلامییەکانی قەوقاس، ئێمە دەزانین لە جەم عوسمانییەکان و هاوکاتیش ئەرمەنییە مەسیحییەکان کە خانوو و بەرەو نەریتی کشتوکاڵی هەیە، ئەوان لە سەرەتاوە تا کۆتایی و ئاستی توانا ئازادی کەسایەتی ژنانیان پێشێل دەکرد" لە جەم ئەو تیرانەدا، بەر لە بە

کۆچەریی بوونیان، بە هۆی سەختیی یان نەبوونی توانای جێگەیەك بۆ جێنشین بوونیان، کە ژیان نەکاتە وابەستە بوون، بەڵام دواجار ئەو پەیوەندییە بێ بەهایە ناچار کەوتە بەردەم گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی.

تا بە باشی شتێك لە مەڕ پەیوەندی کوردان بە دەست بێنین، لە بەرابرا گرینگە شتێك لەسەر ئەو وڵاتە بزانن، کە ئەو گەلە سەرنجێکێشە تێیدا دەژی. لەوێ لە باشوور سنوورە سروشتیەکەی وڵاتی باڵای ئەرمەنییەکانە، هەروا لە ناو ئەو خەڵکەدا بەرەبەرە ڕەگەزەکانی ئەرمەنی بزربوون. تۆرووس پشتی کێوێکە و چەندان دیمەنی هەڵەتی هەیە، کە کوردان دەکەونە پشتی ئەو کێوەوە. سیلیسیا دەکەوێتە نزیك رووباری فوراتەوە و بە بیست میلی جوگرافی یان پانتایی لە نێوان مالاتیا و سامۆساتا کەوانەیی دەبێتەوە. لە زنجیرە شاخانەوە، لە کانییەکانەوە رووباری تیگریس سەرهەڵدەگرێ و سنووری نێوان ئەرمێنیا و کوردستان دیاریدەکات. هاوئاهەنگییەك لە ئاپۆرەی ئەو دیمەنانە هەموو دۆڵە گەورە و لێکترازاوانەکان بە خۆیەوە ناگرێت، بەڵام لە دەشتایی قووڵی پان و پۆر و گەورە سەرگێژکەرەکانی ئەوێدا، لە دارستان و کەڤر پێکهاتووە و لە دۆڵەکاندا رووەکی کێویی تێدا گەشە دەکا، ئەو وێنە دڵراکێشانە هەموویان سەروەتێکی زۆریان هەیە. کاتێ داگیرکەرانی عوسمانی بێڕێزانە بە دژی سەربەخۆییان وەستا، ئەو تیرە سەرفرازانە لە پشت ئەو تەرزە سروشتە خۆیان پاراست، جووتێرە ئازادیخوازەکانیش لەو مێرگە پان و بڵاوانە، کە بەهەشتێکە بۆ کۆچەرییە شاخاوییەکان، بەروبووم بەرهەمدێنن. ئاوا کوردان ئاشقە چیاییە تەنیاییەکانیان خۆشدەوێت، خەونی ئەو گەلە سادەیە ناوەخنی سترانەکانیان ئەوە دەسەلمێنن، کە بەمجۆرەیە:

ئەڤین و جوانی بەسەر هەموو شت رازاوەتەوە
بارانی بەرەکەت هەردەم بە گەرمی دەبارێ
هەموو قانێك، لەسەر چیایە سەرکەشەکان،
ڕەحمەت و کەسکاییە
لەوێ هەموو پارچەی خاکمان بەرەکەتە.

لەوێ بەفر لوتکەی شاخەکانی داپۆشیووە
لەوێ کوردە رەشە لە رەشماڵەکەی دوردۆنگە،
لەوێ مێگەلە مەڕەکەی دوای کەوتووە،
کیژە جوانەکان، بەناز و خێرا رادەگوزەرێن.

"ئەڤین و جوانی بەسەر هەموو شت رازاوەتەوە
بارانی بەرەکەت هەردەم بە گەرمی دەبارێ
هەموو کاتێك، لەسەر چیایە سەرکەشەکان،
ڕەحمەت و کەسکاییە
لەوێ هەموو پارچەی خاکمان بەرەکەتە".

کوردان مافی خۆیانە تا رادەی جادوو زێدە چیاییەکەی خۆشبوێت، چونکە هەر لە دێر زەمانەوە خودانی ئەو ماڵە بوون. رەسەنی و کێوییەتی کورد، بە دەم تاقیکردنەوەی شەڕە دژوارەکان خۆی نمایشدەکا، کە ئەمەش رەگێکی بۆ خۆ نواندنەکانی خۆی دەگەڕێتەوە، هاوکاتیش نکوڵی لەوە ناکرێ، کە ئەو هەستی شانازیکارییەی کە لە رۆحی جەنگاوەریاندا هەیە، لەیەك بە دوای یەکی خێزانە لێهاتووەکانەوە بۆی بەجێماوە،

ئەمەش بارێکی کۆمەڵایەتییە و خەڵکەکە پێیەوە حەسرەت دەکێشن. ئەو دۆخ و تایبەتمەندییە بەسەرخۆ داخراویە "Kast, assiretti" کە دڵڕفێنە، واتا لە بەرایرا مەرجی پێویستییەکە، بۆ خۆپاراستنیان لەو هەموو جیرانە نەیارانە یان جوتیارانە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا وا دەکا بتوانین شوێن پێی نموونەی وێکچووانەی کورد، لە رووی دەرەکی یان ناوەکی، لەو نەیارانەدا بدۆزینەوە.

خەسڵەتی ئازاد و سەرفرازانە، کە لە شێوازی ئەو گەلە کوردە موحەمەدییەدا هەیە، هەروەك ئێمە ئاماژەمان پێکرد، کە ئەمەش لەسەر ژنانیدا بێ کاریگەری نەبوو. ئەو کەژە فرە رەنگینە سروشتییەی کورد، سەوزایی مێرگەکان بە چەندان مانگ، دەرفەتی بۆ والا دەکاتەوە تا بتوانێ لەسەر کۆنە شاخێك ژیانی ئارامی بۆ مەیسەر ببێ، ئەمەش دواجار هەمیشە لەناو ئەو تیرە رەچەڵەکدارە خەملیوەدا، زەمینە بۆ ژنی بە توانای دەسەڵاتدار خۆشدەکات. ژنی کوردان بێبەرین لە هەموو ئەو رێزبەندیەی کە پیاوە بالادەستەکانی تورك بە هۆدەی جیاواز بۆ ژنەکانیانی دروست دەکەن. بەلام لە جیاتی ئەوە، بەختی ژنی کوردان لە کاروباری ناوماڵدا وێنا دەبێتەوە، لە هەموو بەشەکانی ولات، رەوشتی پاکی، دڵشادی گوراح و حەوسەڵە و ئاکاری بەخشندەیی باشترین پایەیە، ژن لە سەرەتای بەیانییەوە تا درەنگانێ لە دەرەوە و ناوەوەی رەشماڵدا گەلێك کار رادەپەڕێنێ" ئاگای لە زارۆکان دەبێ، چێشت لێدەنێ و هەروا تفەنگی پیاو خاوێن و چەور دەکات یان ئەسپە جوانەکەی بەخێو دەکا، وێڕای ئەمانەش، هەرچەند پیاوەکەی لە راو یان شەڕ بێت، ئەو کەزیە رەنگین و رازاوەکانی دەهۆنێتەوە. ژن هەر کارێك بکات خۆی هەست بە بەختەوەری دەکات، هەر چۆنی بێ، ئەو تێلە ئاسنەکەی لوولدەکات یان نیمدەرە و کورسی دەچنێتەوە، گەر ئاوازی زایەڵەیەك بەسەر ئەو سروشتە سازگارەی دەرەوە نەچڕێ، ئەو کاروبارانەش هەرگیز ئەنجام نادات.

ئەمە شتێکی سروشتییە، کە ئەو هەڵبەستانە بەندن بە هەمان بازنەوە، ئەو هەڵبەستانەش یادەوەری شەڕەکانی دژە دوژمنەکان یان ناکۆکی نێوان تیرەکان دەردەبڕن. وەك هەموو خەڵکانی چیاکانیش، کوردان بەسەرسەختی تۆڵەی خوێن دەکەنەوە، کە ئەمەش هەمیشە هۆکاری مەحف بوونەوەی تیرەکان بووە، بەسەر شاری رێگە داخراوەکان، دەتوانین بڵێین لە هەموو شوێنێك کە ژنی گرتۆتەوە. هەڵبەستەکانی شەر بەشی زۆرینەیان لە بیرهاتنەوەکانی قۆناغی شەرکردن لەگەڵ تورکان دەپەیڤن، کە بابەتەکانی ئەو هەڵبەستانە رقی ریشاژۆی کوردانە لە تورك، بناغەی ئەمەش بۆ ئەو تالانکاریی و دەستدرێژیانەی سەر ژن و کیژان دەگەڕێنەوە، کە تورکان چیانشینەکان ئەنجامیان داوە. زۆر لە میرە سەر بڵندەکانی کوردان لەگەڵ ئەو ئەزموونانە ژیاون. کاتێ پاشا "bozuker"؟ لە لایەن پاشایەکانی موسڵ یان دیاربەکرەوە رەوانە دەکران، هێرش دەکرایە سەر قەلایەکەی و ژنە هاولاتیەکان - کە پێویست بەوە ناکات بڵێین، بۆ بازاڕی کۆیلە سوورگووم دەکران، دوای ئەوە کچانی هاولاتییە کوردە چیا ئازەدنشینەکان کاتێ بە دەست بەسەریان لە شوێنێکی وەك "Bospren" یان لەوەش

قووڵتر لەو باڵەخانانەی ژنان دایان دەنان، کە بۆ دەسەڵاتدارانی تورکان دروستکرابوون. بەمجۆرە مرۆڤ ئەوە دەزانێ، هۆمەر پاشا، ئەو چەوساوە بە دەمارەیە کە لە ناو کوردانــدا ڕاپەریوێکی خوێناوییە، بۆیە زەماوەندی لەگەڵ کچێکی هەڵگیراو کــرد. چونکە ساڵەکان بە دوای خوێناویترین باڵکێشیدا تێدەپەڕن، هەندێ سات ئاپۆرەیەکی جەنگاوەر لەگەڵ خانەوادەکانیان دێن، کە لە نزیک قەڵایەکی قەڵاچۆکراوی هاوچەشنەکانیان بارگە لێدەخەن، وێجا وا ڕوو دەدات لە ناو ئەو فرە خەڵکە پێکگەیشتووانەدا سترانبێژێك هەڵدەکەوێت، وەك "*rapsoden*"ی جەم هێلینە دێرینەکان، کاتێ هەست بە حەماسەت دەکا، وایلێدەکات شاعیرانە یادەوەری شوێنەکە وێنا بکات. لەسەر زەویەکەی دەوروبەری سترانبێژەکە گوێگران لەسەر رایەخە خەتخەتەکانیان (نووسەر وشەی "*abajer*"ی بەکارهێناوە، وەرگێڕ)، ڕودەنیشن و بە قەلغانی تیژ یان بە دەسەسڕێکی پولەکەدار" مۆسیقاژەنێك بە ئاوازێك "جوزەلە" *bitvar*، کە جۆررە فلۆتێکی لوولەیی سادەیە دەستپێدەکا، بەدەم ئەمەوە پۆلی ژنان پێکەوە بە چرپەوە دێنە پێشەوە، بەمجۆرە سترانبێژ دەفرۆشێ و تا کۆتایی واز لە نمایشەکەی ناهێنێت. لە سەرەتادا ئەوە تەنیا بە گیانێکی خەمین دەستپێدەکات" بەشێك لەو ژنانەی کە دەبێ، سترانبێژ خۆی، تازە چەشتبێتی، جا هێدی هێدی دەنگی سترانبێژ بەرەو گوور و هێز دەڕوات تا تەواوی ئاوازی ساتە سروشتییەکانی ژیانی دەچرێت، دواجار بە کێوییانە ئاوازەکەی دەتەقێنێتەوە، کە گوێگرانی گڕ لە گوێگران بەردەدات و بەمەش کێوییانە تر پێکڤە وەك کۆر دەستپێدەکەن:

لەناو ئاژەڵان شێر پاداشتی پاڵەوانە:
بە فێڵ و فڕ، وەك پیاوکوژ شەڕ ناکا"
هەر کە نەیارەکەی بینی. دەنەڕێنێ.
لێ قەت ترسنۆکان بە ئەرزی دا نادا،
شێر خەباتگێڕی لە خۆی دێ"
رووی کردە خەتەری، کەوتە جەنگ،
بە خورتی چاوی بڕییە چاوی دوژمن،
خوێنی دڵی ڕشت.

لێ تورکان لە خانووی نەیاران رازاوەن،
وەك دەعبای خوێنمژ، بە ناو مژی شەو خۆ دەشارنەوە"
مێرك، گەنجە کوران دامەچەمێنەوە،
ئەو لە ژیانی دایك لە هیچ زارۆیان خۆش نابێ.
دارستانێکی کەڕ، بە چڵوپۆی چڕەوە،
بە گمەی نەوا و نەرمی تەیرەکان،
بە دەنوکەوە خۆراك هەڵدەگرن بۆ جوجەڵەکان
وەفادارانە دەکەونە دوای نێرەکان

ئەو کۆترە بۆ خۆی خانمە،
بە پرچییەوە ئەگریجەی تەڕ دەکا،
هەنووکە ئەو لێقەوماوە لە دەست زەبری تورك ئاخ هەڵدەکێشێ،
خودانماڵیش، وەك قارەمانێ لە خوێندا گەوزی،
نەبەزێك لە خاك گۆڕ بۆ خۆی هەڵدەکەنێ"
حەژمەت دەکێشێ لە خوێنی ڕژاوی گەرمی،
لاوێك و جگەرگۆشەیەك بەجێدێڵێ.

پاشەی تورکان، تالآنکارێکی کرێتە،
وەك دالَـەخۆرێك، خـاش خـاش، گۆشـتی پـیس دەخوا.
زارۆك، بەریٚ خۆت بدە، لاشەی خلّتاوت بابی!
ئەی جەوان، هیڤی ئەڤینت لیٚ تالآنکراوە!
بمریٚ ئەوەی، کە دوو ئەڤیندار لێکدەکا!
بمریٚ پیاوکوژ، رەحمێك ناکا بە قوربانی گریاو!
کە ناشیٚ مردووان لە ناو گۆڕ ببا،
مەلەك تاوسی توورەمان گوێی لەوە دەبیٚ!"

شـتێك، کـە وێـڕای ئەمانـە، خزمـەکانی پـێش خۆیـان شـایەتی لەسـەر ئـەو خەڵکـە جـەنگ ئـامێزە دەدەن، کـە ژنـانیش دەیـانتوانی خۆیـان بـۆ پیشـەی شەڕکردن تەرخان بکەن. بۆ نموونە سەرچڵێکی وەك "کارا – فاتیمە" (فاتتیمـە رەش) کـە مێژوویـەکی پـڕ لەسەربەرزی بردەوە، فاتیمە لە یـەکێك لـە عاسـێترین ریزە شاخ دەژیا، واتا لە رەواندوز، کە لە دەستپێکی شـەڕی بـەناو "کـریم" بـە ئومێدێکـەوە پۆلێـك لـە عاشـقانی سەرکێشـی لـە کـوردان کـۆکردەوە، بـە خەیاڵی ئەوەی پشتی داخوازییـەکانی پاشا بگرن. نوێنەرایـــەتی فاتیمـــە لـــە کۆســـتەنتینۆپیل – *Kostantinopel* (ئەوە بە گوێرەی ئینجیل ولآتێکە لـە ئـەفریکا؟ وەرگێـڕ) بـەوە فاتیمـە دەنگدانەوەیـەکی زۆردایەوە، فاتیمە تـەواو جلـی پیاوانی دەپۆشـی و وەك سەرۆك خێڵێکی کۆنی سـەربڵند بە جلـە و شیر ئاسایەکەی ئەسپەکەی لغاو دەکرد. فاتیمـە هـەر لـە سـەرەتای لاوێتییـەوە فێـری چـەك بـەکارهێنان بـوو، روخســارە هــەتاو گەزیوەکــەی رەنگــی پیاوانــەی گرتبوو، لە دوا ساڵەکانی تەمەنی کـەس مەزەنـدەی

نەدەکرد کە ژنە. بە هیچ تەرزێك کاریگەری شێوازی شـــەڕی "حجـــاج"ی عـــەرەبان بەســـەر خاســـڵەتی فاتیمەوە نییە، (کتێبی ناوبراو، وتـارێکی دوای ئـەم وتارە، تەرخانە لەسەر ژنی عەرەب، وەرگێڕ) دواجار هــەروەك کەسـایەتی فاتیمــە رەش بــە شــێوەیەکی رۆمانسیانەی جوان وێنـا دەکرا، هـەروەك گوتمـان، لەبەر توانای خۆنواندنەکەی بوو، کە ژنایـەتی پێـوە دیار نەبوو. ئەو ژنە ئامانجی ئەوە بوو کە لـە شـەڕی دژی رووســـەکان بەشـــداری بکـــا، کـــە لـــەوەدا سـەرنەکەوت، لـەو سـاتەوەختەی، کـە جـارێکی تـر هـەنگاوەکانی بـەرەو مـاڵ هەڵێنایـەوە، شـوێن پێـی هەموو ئیشەکانی بووە ئاردی نێو دڕکان. ڕەنگـە لـە گەوڕ و هەڵەتی ڕێچکەکانی چیای رەواندز، بە یـادی ئـەو لـە کێڵـە وشـە هـەڵکۆڵراوەکانی سـەر کێڵەکـەی تفـــەنگێك، تـــەورێکی شـــەڕ، شـــیرێکی کەوانـــەیی شـەڕکەران سـەردەربێنیٚ، کـە ئـەو جـۆرە کێلانـە هـی کوردە رەسەنە جەنگاوەرەکانن.

ئێسـتا بـۆ ئـەوەی بچـینە سـەر رووی دەرەکـی ژنـی کـورد، کـە ئەمـەش بـۆ خـۆی رامـانێکی تایبـەت بەرجەســتە دەکــا. لــە ڕاســتیدا بەشــێکیان، وەك نـــەریتی هـــەر ئاســـیاییەك، لەشـــیان بـــە کوتـــان دەرازێننەوە، دوگمە و گوارە لە لووت دەکـەن، بەڵآم رووخساریان خواوەندییانە و ناخیشیان لە خۆرازی بوون دەنوێنیٚ. لـە بنەڕەتـدا ئـەو شـێوە لەشـەی کـە هەیانـــە مانـــای ئـــازارخواردن نییـــە، بـــەڵکو خڕوخەپـــەییان دەلالـــەتی نەشـــونمای تـــەواوی جەســـتەیانە، شـــێوەی خەپـــەییان، هـــەموو جـــۆرە جولآنەوەیـــەکیان ئـــاوەلآیی و خـــۆش بـــەزییان دەنـوێنیٚ. بەهـەرحاڵ، لـەم ڕوانگەیـە، تەنانـەت لـە رووی بـــەدەن ساغیشـــیانەوە کـــە هـــەر دەبـــوو بـــە

گـوێرەی هـەوەس وا بـە ئاسـانی هـەڵس و کـەوت بکەن.

کوردان دڵپاك و سروشتین، هـەروا سەختگیر و بـە دیسـپلین و ڕێـزدارن، هەمیشــە لــە بەرانبــەر بێگانانـدا زۆر جـاران بـە گومانـەوە مامەڵـە دەکـەن و، بەشــێوەیەکی مەیلــە و تــەواو لاتــەریکن، وەلــێ هەمیشە جدی و میوان دۆستن. دەکرێ دوو جۆرە تیپی لێکجودای ژنـی کـورد جێگـەی سـەرنجدان بن: شـێوەی ژنـە جـەنگاوەرەکانیان سـەریان خرتـرە و روخسارێکی پان و خۆ نواندنێکی تۆکمەیان هەیە و هـەروا چـاو و پرچییان بە زۆری قاوەییـەکی تۆخـە" ژنـە جوتێرەکـان بـە گشـتی نـازدار و جـوانن، کەچـی بەشـێکیان قـژیان کـاڵ و نەرمـە، هـەروەك پێکهـاتی ڕووخسـاریان ژیکەڵـە و جـوانی هەمـە چەشـنن. بـە گشتی پرچییان بە شتێك یان بە دەسماڵی پلپلەدار و خشل و شتی لەم جۆرە دەڕازێننەوە" پـرچ و سـەر کراوەیــی تــەنیا لای ژنــی کــوردە ئەناتۆلییــەکان دەبینرێت. ئاکار و سیمای ژنی کورد ڕەنگین گەرم و ڕێکە و لە سوور بەرجەست دەبێتەوە، کراسیان چین لەسـەر چـین تـا گـۆزینگی پێیـان شـۆڕ دەبێتـەوە (دامــێنی کراســەکانیان بــە زێــر، زیــو، خشــڵ، پولەکـەدار یـان چـنین، دەڕازێنـەوە)، کـە کـەواش دایدەپۆشــێ. بــە گشــتی حیجــاب و ســەرپۆش بـەکارناهێنن" تـەنیا ژنـی سـەرۆك تیرەکـان نـەبێ کـە بـەکاری دێـنن، ئەمـەش بـۆ رووکەشـی لەبـەرخاتری قورئـان، لـە دەرەوە بـێ حیجـاب و سـەرپۆش خۆیـان پیشان نادەن.

ئێمـە لـە سـەرەوە لـە دەسـتپێکدا باسـی ئـەو بابەتە سەرنجکێشەمان کرد، کە چۆن ژنـی کورد لە ماڵەکـەی خۆیـدا پــەروەردە دەبێـت، ئــەو ماڵــە پێکهاتووە لە ماڵێکی گەڕۆکی کوردانە، کە بە مووی ڕەش دروست دەکرێت، (نووسەر لە جیاتی رەشماڵ وشـەی "*Kara-tschadyr*"ی بـەکارهێناوە. وەرگێـڕ)، شوێننشـینەکان دیـواری خـانوو لـە بـەرد دروسـت دەکـــەن و ســـەربانەکەش تەختاییـــە، هـــەروەك هەندێکیان گەرمیان و کوێستان دەکەن، بە بەهاران دەچـنە بنـاری چـیاکان و بــە زسـتانانیش لــە خانووبەرە ریـز بە دوای ریز دروستکراوەکانیان لە نێـو دۆڵەکانـدا، ژیـان بەسـەر دەبـەن. لای ئاغاکـان خـواردنی دەسـتی ژنـە خۆشەویستەکانیان گرنگـە، کـە کفتـە و پـلاو و لـەناو سـینی یـان قاپـدا، بـە دانیشـتنەوە لەسـەر زەوی دەیخـۆن، تـا پیاوەکـان تـەواو نـەبن، ژن نـان نـاخوات، وەك دەبیـنین، لـەو دیـــدەوە تەنانـــەت کـــوردان لـــە نێـــوان نـــەژادە ئاسیاییەکان بێوەی و هۆگرترین خەڵکن. کورد لە نێو ڕەگەزە بێهێزەکاندا بە جۆرێك لـە جۆرەکـان، بە بـــەراورد لەگـــەڵ موحەمـــەدیی مەســـیحییەکان ڕەفتارییان نەرمترە.

ئێمـە پێشـتر باسـی تایبەتمەنـدی نـەریتی ئەرمەنییـەکانمان کـرد، هاوکـات هاوڵاتییـەکان لـە باشووری کوردستان (جێگـەی سـەرنجە سـەد سـاڵ زیاتر پێش هەنووکە، ئەو نووسەرە ناوی باشووری کوردستانیش دەبا، کەچی دەمڕاستانی ژن و پیاوی کـورد ئـەمڕۆ لـە دەممیـان نـایێ وا بڵـێین. وەرگێـڕ)، جیرانی مەسیحییان هەیە، کە لە ژیانی ماڵنشینیدا بـە هـەمان چەشـن وەك ئاسیاییەکی ڕەسـەن خۆیـان نوانـدووە. بـۆ نموونـە ژنـانی "کلـدو ئاشـووری؟ "*nostoriansk*" سـەر سووڕمانی خۆیان بەرانبـەر بـە باوکانی ڕۆژئاوا دەردەبڕن، کە پارەی نەختینـە لـەو پیــاوە وەرناگرێــت، کــە کچــەکەی دەخوازێــت،

سـەرباری ئەمـەش لـەوێ (ئـەوروپا) کیـژەکان بـە مـەرجی خۆیـان مـەیلی دڵییـان رازیدەکـەن. بـۆ مەسـیحییەکانیش رەوا نییـە ژنـان پێکـەوە لەگـەڵ پیـاوان نـان بخـۆن. ویـڕای ئەمـەش لـە جـەم هـەموو گەلە چیانشینەکان ئاکاری جوانکیلە هەیە" ئەوان زریـنگ و سـوورن لەسـەر ئـیش و کارەکانیـان کـە دەیکـەن. جلوبـەرگیان قوماشـی خـوری سـپی یـان ســـووری قەڵـــەمی و خەتـــدار، شـــەرمنن (واتـــا شـەرمنێکی سـاختە نـین: مـرۆ بـە زۆری دەبـینێ خێزانەکان پێکەوە لە ژێر ئاسمانی ساماڵدا خۆیان دەشۆرن)، هەروا بۆ ژن سەخت نییە لەگەڵ رەگەزی پیـاو بخـەوێ و ژنـان بـە چەشـنێکی ناسـك بـۆ ئـەو شتانە خۆیان دەنووێنن.

لە نێوان کورداندا دەستەیەك "*sekt*" هەیە، کە بە "شـەیتان پەرسـت" نـاودێر دەکرێن، کە دواجار پێویستە چەند پەیڤێك لەسەر ئەوانە بێژین. ئەوان بـە خۆیـان دەڵـێن ئێزیـدی (واتـا ئێزیـدیزا، نـاوێکی کۆنە بۆ خوا) و لە ڕاستیدا بڕوای ئەوان جۆرێکە لە شیعەگەرایەتی، ئـەوان بڕوایـان بـە تاکـە خوایـەکی مـرۆڤ ئاسـا هەیـە، کـە لـە پێغەمبەرێکدا بەرجەسـتە دەبێتـــەوە، بـــەو مانایـــە، شـــێخ ئـــادی، بـــاڵاترین فریشـــتەی پـــیرۆزی نەتـــەوەیی بـــە شـــکۆییانە. ئێزیدییەکان بڕوایان بە "هاتنە خوارەوەی فریشتە" هەیـە، کـە ڕۆژێ لـە ڕۆژان ئـەو فریشـتەیە زینـدوو دەبێتـەوە، کـە ئەمەشـە ئـەوانی بـەدناو کـردووە، هاوکاتیش، بەهۆی ئەمەوە، بڕوادارە جوداکان، وەك موحەمەدییەکان، کە بە رق و کینە هەمیشە راوییان نـاون، لـەو پەیوەندییـەدا هەڵبـەت ژنـانی ئێزیـدی زیـاترین ئازاریـان چێشـتووە. لـە ماوەیـەکی دوور و درێـژدا دیسـانەوە تورکـەکان بـە شـێوەیەکی فراوان کەوتونەتـە دوای ژنـانی ئێزیـدی، بـەڵام هـەر لـەو کاتـەوە ئـەوە ئاشـکرا بـووە، کـە ئـەو "ژنـە شـەیتان پەرسـتانە" لـە بـازاڕی قوسـتەنتینیەدا بـە هـەرمێن کران، ئەو کارە بۆیان کرا پەرەیان پێدا.

هـــەروەها ئێزیدییـــەکان جـــەژنی نیشـــتمانی خۆیان هەیە، کە بۆ شێخ ئادی گرینگییـەکی زۆری هەیـە. ئـەو جەژنـە لـە دۆڵێـك بـەڕێوە دەچـێت، کـە شێخی پیرۆزیان لـەو دۆڵـەدا شاردۆتەوە. بەمجۆرە، پیاو و ژن بە جلی سپی و شەدەی سەرییانەوە بە دڵی پڕ خورپەیانەوە بە دەوری گۆڕ و گۆمـەزی ئـەو مەرقـەدە پیرۆزەیانـدا دەسـووڕێنەوە، سـێرمۆنی – سـروتەیەکەیان نمـایش دەکـەن، کـە ئـەوان چـۆپی "*tschopi*" یان گۆڤەنـدی بازنـەیی پێدەبێـژن. هـەموو بەشدارن بە دەم ئەمەوە پێکڕا دەست لەناو دەستی یەکتر دەکەن، لەشیان بەملا و بەولادا بادەدەن و پێ لـە خـاك دەکـووتن، بـە خۆبادانـەوە بـە جـۆش هـاوار دەکـەن، کـە هەڵپەرکێکـە تـەواو بـوو، جـا ژنـان لـە دوایانەوە دەیڵێنەوە. هەموویان جلی باق و بریقی رازاوەیـان لەبەردایـە، مـرۆ بـە دیـار ئـەو نمایشـەوە ئـــەوەی بـــە زەیـــن دادێـــت، وەك داب و نـــەریتێکی چەســـپیوو هـــەر بـــەردەوامی هـــەبێ، کـــە ژنـــان سـەربەرزانە لـە ژێـر بـاڵای چـەماوەیەی دار گـوێز و شـۆرەبی، بـە چـراخانی دەسـتییانەوە سەرچـۆپی شـایی دەگـرن، جـا هـاواری: "هەلهەلـە" بـە نـاو سەرتاپای دۆڵەکە دەنگدەداتەوە. بەمجۆرە دەبێ ئەم روانینە شایەتییەکی راست بدات بە دەستەوە، کە کاریگـەری ئـەو شـانۆیە سـێرمۆنی سـرووتەکەی سەرمەسـتانە وێنـا بکـات. هاوکـاتیش جارێـك لـە جـاران دەبـێ ڕووداوێکـی ناچـاوەڕوان بکرێـت، کـە گاڕانێـك لـە تـورك یـان لـە کـوردە موحەمـەدیی –

موســڵمانەکان–، وەك ڕەوە گــورگ بخزێنــە نــاو سـەرمۆنیەکەی ئـەوان، ئاهـەنگی جەژنەکـەیان بکەنە فرمێسك و شین و واوەیلا.

هــەروەها تورکــەکان چــەند ســاڵێك بــەر لــە ئێســـتا، بـــە ڕێکـــەوتێکی ڕەسمـــی کەوتنـــە ناویـان، ئەمـەش بـەو بیـانوەی کـە خۆیـان بـە ڕەوا دەزانـــی، کـــە گوایـــە خـــودی ئێزیدییـــەکان هێرشـیان بردۆتـە کـاروانی بازرگـانی تورکـەکان، بۆیـــە تورکـــەکان ئـــەوەیان بڵاوکـــردەوە کـــە ئێزیدییـــەکان وڵات تاڵانکـــەرن، کـــە دەبـــێ تـــەفروتونا بکـــرێن، هاوکـــاتیش بـــە گـــوێرەی تورکـان ئـەوان کـورد نـەبوون، بـەڵکو لـە خـەڵکی مێزوپوتامیاییەکان بوون. هەڵبەت لە ماوەی 1830، هێزەکـانی حـافیز پاشـا زێـدی ئێزیدیـەکان، چیای شــەنگاریان، قەلاچــۆ کــرد، کــە هێزەکــەی بــە شێوەیەکی دڕندانە پیاوەکانیان ئەنجن ئەنجن کرد و هاوکـاتیش سـەدان لـە ژن و منداڵـەکانیان بـرد بـۆ بازاڕی کۆیلەکانیان.

## سەرچاوە

*Amand v. Schweiger – Lerchenfeld. Qvinnan bland skilda folk, fri osversattning of Egerius (1881), C.E. Gernandts boktryckeri, Stockholm.*

# وێستگەکانی سەردەم

# گۆڕانەکانی فەلسەفە
## (ئەفلاتۆن، دیکارت، کانت، نیچە)

هاشم سالح
لە عەرەبییەوە: شاد



کێن ئەوانەی گرنگترین فەیلەسوفن لەمێژوودا؟ مەسەلەکە هەرچۆنێك بێت، ئەوا وەڵامی ئەم پرسیارە بەپێی حەزو ئارەزوی کارەکتەری توێژەرە هاوچەرخەکان دەگۆڕێت. لەوانە دەکرێت باس لە بیریاری فەرەنسی "پیر فۆجیرو لاس" بکەین. "فۆجیرو لاس" مامۆستای فەلسەفە بوو لە زانکۆی سۆربۆن و هەنوکەش خانەنشین کراوە.

ئەم پیاوە نێوبانگێکی گەورەی لە وانە وتنەوەی فەلسەفەدا هەیەو لەنزیکەوە ئاشنایە بەفەلسەفە. ئەو تەمەنی خۆی لە وتنەوەو قوڵبونەوە بەناخی فەلسەفەدا بەخەرجداوەو لەدوا کتێبیشدا دەبینین کە گرنگی بە چوارناوی سەرەکی دەدات، ئەوانیش بریتین لە: "ئەفلاتون، دیکارت، کانت، نیتشە"، بەڵام گەورە فەیلەسوفانی کەش لەیاد ناکات، بەڵکو تەنها پێی وایە ساتەوەختی سەرەکی و چارەنوسساز ئەوانە دیاری دەکەن.

ئەوەتا لەشوێنێکی کتێبەکەیدا دەنوسێت: (بێگومان ئەرستۆ فرە گرنگەو زیاد لەئەفلاتونیش کاریگەری لەسەر فەلسەفەی ئیسلامی و فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست هەبووەو وەکی یەکەمین مامۆستای مرۆڤایەتیش دراوەتە قەڵەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دامەزرێنەری فەلسەفە ئەو نییە، بەڵکو ئەفلاتونی مامۆستایەتی). ئەوە "ئەفلاتۆن"ە لەسەدەی پێنجەمی پێش زایندا (واتە *2500* ساڵ بەر لەئێستا)، فەلسەفە وەکی پسپۆڕیەکی فکری و ئەکادیمی دادەمەزرێنێت، چونکە بەر لەو فەلسەفە تێکەڵ بوو بە ئاین و شیعرو ئەفسانە، بەڵام "ئەفلاتون" هاتوو فەلسەفەی گۆڕی بە میتۆدێکی ئەقڵانی تەواو.

فەلسەفە لەساتەوەختی هاتنە ئارایەوە لەسەر دەستی "ئەفلاتون" کە قسەکەری یەکەم بوو بەناوی "سوکرات"ەوە (ئەو پیاوەی تاکە حەرفێکی نەنوسی)، هێدی هێدی لەرێی پشت بەستن بە بیرکردنەوەی ئەقڵانی، خۆی لە بیروباوەڕە دینیەکان و ئەفسانە جیاکردەوەو ئەم خۆجیاکردنەوەش بووە مایەی ئەوەی فەلسەفە بەمانا ئەقڵانیەکەی دروست بێت. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە "ئەفلاتون" دامەزرێنەری فەلسەفەیە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە حساب بۆ گرنگی "ئەرستۆ" نەکەین کە راستەوخۆ دوای "ئەفلاتون" هات.

لەراستیدا "ئەرستۆ" کە دەکرێت لەیەك کاتدا وەکی قوتابی و نەیاری "ئەفلاتون" سەیری بکەین، نوێنەری ئاقاری ریالیستیە لەفەلسەفەدا. ئەو هاتوو شێوازێکی نوێی بۆ

تێگەیشتن لەو پەیوەندیانە هێنایە ئارا کە لەنێوان فەلسەفەو زانستو بوارەکانی تردا هەیە. هاوکات زیاد لە "ئەفلاتون" گرنگی بەدیاردە بەرچاوو واقیعیەکان دەدا. "ئەفلاتون" یەکێك بوو لەوانەی گرنگی بەجیهانی ئایدیاکان دەدا, نەك بەجیهانی واقعی. هەرلەبەر ئەمەش بوو کەرۆحانیو عاریفەکان لەئیسلامو مەسیحیەتدا "ئەفلاتون" یان لە "ئەرستۆ" خۆشتر دەویست. لێرەوە دەتوانین لەو جیاوازییە تێ بگەین کەلەنێوان "ئیبن سینا"ی ئەفلاتونیو "ئیبن روشد"ی ئەرستۆ تالیسیدا هەیە. پاش ئەوەی فەلسەفەی یۆنانی بۆ ماوەی هەزار ساڵ کۆنترۆڵی فیکری ئینسانی کرد, "دیکارت" هاتوو کۆتایی بە قۆناغێك هێناو سەرەتایەکی تازەی دەستپێکرد. ئەمە مانای وایە "دیکارت" چرکەساتێکی نوێیە لەمێژووی فەلسەفەدا.

ئەو کاتێك دروشمە بەناوبانگەکەی راگەیاند: (من بیر دەکەمەوە, کەواتە من هەم), سەرەتای فەلسەفەی خودگەرایی یاخود فەلسەفەی هۆشیاری فەردی لەمێژووی فیکری خۆرئاوادا چێدەکرد. "دیکارت" بەم کارەی میتافیزیکای ئەرستۆ تالیسی تێکشاندو لەجێگایدا میتافیزیکایەکی نوێی هێنایە ئارا کە پەیوەست بووبە زانستی مۆدێرنو دۆزینەوە تازەکانی, ئەو دۆزینەوانەی سیمای جیهانی گۆڕی (یان دەتوانین بڵێین دیدو بۆچونی ئێمەی سەبارەت بە جیهان گۆڕی, بەتایبەت دوای کۆپەر نیکۆسو گالیلۆو کیبلەر).

کەواتە "دیکارت" بە بۆچونی "فۆجیرۆ لاس", گەورە چاکسازی فەلسەفەیە. پێموایە چەمکی (چاکسازی) لێرەدا, زۆر لاوازەو نەگونجاوە بۆ کەسێك کە کۆتایی بە قۆناغێکی هەزار ساڵەی مێژووی فەلسەفە هێنابێت. بەڵام پێدەچێت نوسەر بەو مەبەستە ناوی (چاکسازی) لە "دیکارت" نابێت, تا تێرمی (شۆڕشی فەلسەفی) بداتە "کانت" کە سەدەیەك دوای "دیکارت" هات.

"فۆجیرۆ لاس" پێی وایە فەلسەفە دوای "کانت", جیاوازە لە ساتەوەختی پێش هاتنی "کانت" و چرکە ساتی ئەو دابڕانی گەورەیە لەمێژووی فەلسەفەدا. بەم پێیە دابڕانی گەورە لە مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوادا, لەوکاتەدا دەست پێدەکات کە "کانت" میتافیزیکای بەمانا (ئەرستۆ تالیسیو دیکارتییەکەی) رەتکردەوەو فەلسەفەی لەسەر رێسای زانستی فیزیایو گەردونی نوێ دارشت کە"نیوتن" کەشفی کردبوو.

لێرەدا هەوڵدەدەین کەم تاکورتێك باس لەم مەسەلەیە بکەین. "کانت" پێی وابوو مەعریفەی زانستی بەرهەمی نێوان هەستەکانو چەمکەکانە. هەستەکان – یاخود ئەزمونە واقیعیە هەست پێکراوەکان–, دەتوانن بمانگەیەننە ئەو یاسا زانستیانەی ئاراستەی سروشتو گەردون دەکەن. هەرچی چەمكو زاراوەکانیشە, ئەوا بەشێوەیەکی لۆژیکی فۆرمەلەی ئەو یاسایانە دەکەن. کەواتە فەلسەفە بەبێ زانستی ئەزمونگەری وەك شتێکی ئەبستراکتو بەتاڵ دەمێنێتەوەو بایەخێکی ئەوتۆی نییە. هاوکات زانستی ئەزمونگەری بەبێ دنیابینیەکی فەلسەفی, کوێرو نابینا دەبێت. لەبەرئەوە وتمان مەعریفەی زانستی بەرهەمی هاریکاری نێوان زانستی ئەزمونگەریو تیۆریزەی فەلسەفیە.

بەڵام میتافیزێك بەرهەمی ئەزمونی هەستەکیو چەمکە

ئەقلانیەکان نییە، بەرەنجامی هاوکاری نێوانیشیان نیە، بەڵکو ئاکامی ئەقڵی پەتیە، واتە ئەقڵی میتافیزیکیە، ئەمەش ئەقڵێکە خۆی بەمشتومڕە سوفیستائیەکانەوە خەریک دەکات کەکۆتایی بۆ نییە. هەندێك لەمیتافیزیکاییەکان باس لە نەمری رۆح دەکەن (بۆ نمونە دوای مردن)و هەندێکی کەش پێچەوانەی ئەوە دەڵێن. هەندێکی کەیان دەڵێن جیهان کۆن و سەرمەدییە، هەندێکی تر دەڵێن نوێیەو دروستکراوە. ئەم مەسەلانەش وەکو "کانت" دەڵێت: (یەکلایی ناکرێتەوەو هەر بۆچونەش پاساوی خۆی هەیە). لەبەرئەوە شۆڕشی کانتیزم هات بۆ ئەوەی ئاستێك بۆ ئەم پرسیارە میتافیزیکیە نەزۆکانە دابنێت. "کانت" پێمان دەڵێت: (پێویستە گرنگی بەوە بدەین کە بەسوودەو بەردەستەو لەم سەروبەندەشدا دوو پرسیاری سەرەکی وروژاند: دەشێت چی بزانین؟ دەبێت چی بکەین بۆ ئەوەی حاڵی مرۆڤی پێ چاك بکەین یاخود کێشەکانی پێ چارەسەر بکەین؟).

"کانت" دوای ئەوەی لەرێی کتێبە بەناوبانگەکەیەوە (رەخنەی ئەقڵی پەتی) کۆتایی بە میتافیزیك هێنا، فەلسەفە بووە بەتیۆریای مەعریفەو تیۆریایەك دەربارەی ئاکار. لەکتێبی (رەخنەی ئەقڵی تیۆری)دا "کانت" باس لەوە دەکات کەدەبێت چۆن لەژیاندا هەڵسوکەوت بکەین و بەچ مۆراڵێکیشەوە پابەند بین.

"پییر فۆجیرۆ لاس" پێی وایە شۆڕشی فەلسەفی "کانت"، هیچی لەشۆڕشی سیاسی فەرەنسی کەمتر نییە کە هاوزەمانی یەکتری بوون. وەك چۆن یەکەمیان فیکری رژێمی کۆنی رامالی، ئەوا دووەمیان سیاسەتی سەردەمی کۆنی لەکارخست و لەرووی عەمەلی و لەسەر ئاستی دامو دەزگایی لەناوی برد، بەمجۆرەش مۆدێرنەی ئەوروپی لەسەر ئاستی تیۆری و عەمەلی دروست بوو.

لێرە بەدواوە دێینەسەر "نیچە"، ئەم پیاوە چی کرد بۆئەوەی ببێتە ساتەوەختی چوارەم و سەرەکی لەمێژوی فەلسەفەدا؟

پرۆفیسۆر "پییر فۆجیرۆلاس" پێی وایە "نیچە" یەکەمین کەس بوو کە بە بلیمەتی خۆی، حاڵی بوو لەوەی ئەو سەرکێشیە فەلسەفییە مەزنەی "ئەفلاتون" سەرەتاکانی داڕشت و "دیکارت" چاکسازی تێداکردو "کانت" شۆڕشی تێدا بەرپاکرد، گەشتۆتە کۆتایی خۆی و بەبنبەست گەیشتووە. بۆیە پێویستە فەلسەفە بەمانا کلاسیکیەکەی دابخەین، بۆ ئەوەی لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژووی فیکری مرۆڤایەتیدا بکەینەوە. ئەم ئازایەتیە کەم وێنەیە جگە لە "نیچە" کەسی تر نەیبوو. لە کتێبی (گورانی تراژیدیا)دا "نیچە" گەڕایەوە بۆ قۆناغی پێش "سوکرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ"، قۆناغێك کە شیعرو فیکر لێکتر جیا نەبووبوونەوەو ئەفسانەش ئاوێزانی مەعریفە بوو.

لێرەوە بەبڕوای "نیچە" کاتێك "ئەفلاتون" شاعیرانی لە کۆمارەکەی کردە دەرێ و فەلسەفەی لەسەر بنەمایەکی ئەقلانی لۆژیکی دامەزراند، فەلسەفەی هەژارو بەتاڵکردو سەرچاوەیەکی گرنگی لێ بڕی. ئێستا و پاش ئەوەی ئەقلانیەتی فەلسەفی بوو بە بەستەڵەك و لەسەر دەستی "هیگڵ" گەیشتە لوتکە، پێویستە دوو هەزارو پێنج سەد ساڵ لەمێژووی فەلسەفە بەجێبێڵین. کاتی ئەوە هاتووە فیکرێکی نوێ بێتە ئارا

که توانای ئاشتکردنەوەی فیکرو شیعر، فەلسەفەو ئایین، ئەقڵو دەرونی هەبێت.. چونکە مرۆڤ وەکی فەلسەفەی ئەرستۆتالیسی یان دیکارتی یان کانتی پێیان دەوتین، هەر تەنها ئەقڵ نییە یان وەکی رۆمانسیو عاریفەکان باسیاندەکرد تەنها دڵو دەرون نییە، بەڵکو تێکەڵیەکە لەهەردووکیان. پێویستە هیچ یەکێکیان لەپێناو ئەوی دیکەیاندا فەرامۆش نەکەین.

بێگومان بۆ خوێنەری ئێمە تێگەیشتن لە پەرچەکداری "نیچە" لەبەرامبەر ئەقڵانیەتی خۆرئاوادا ئاسان نییە، لەبەرئەوەی ئەو تا ئێستا لە ئەقڵانیەت تێرنەبووەو بەحەقیقیش ئەزمونی نەکردووە. ئەمەش بەپێچەوانەی خوێنەری ئەوروپییەوە کە چەندین سەدەیە لەسایەیدا دەژیو لێی تێربووە. لەبەرئەوە پێویستە مەسەلەکان لە سیاقی مێژوویی خۆیاندا سەیربکەین، تا بەدحاڵی بونێکی وا روونەدات کە زیان لەبەرژەوەندی رۆشنبیریمانو داهاتوومان بدات.

کلتوری ئێمە کە لە ساتەوەختی شکست هێنانی "ئیبن روشد" بەرامبەر "غەزالی"و فەقیهو عارفو دەروێشەکاندا لە فیکری فەلسەفی دابڕاوە، ئەوپەڕی پێویستی بە ئەقڵانیەتی فەلسەفیو زانستی هەیە.

هەر بۆیە من دوودڵم لە وەرگێڕانی فیکری "نیچە" بۆ سەر زمانی عەرەبی، بەر لە وەرگێڕانی کۆی مێژووی ئەقڵانیەتی فەلسەفی، هەر لە "دیکارت"ەوە تا "کانت و هیگڵ".

لەراستیدا ناتوانین لە "نیچە" تێبگەین، گەر لە "دیکارتو کانتو هیگڵ" نەگەیشتبین، لەبەرئەوەی "نیچە" وەکی پەرچەکردارێك لەدژی ئەوان هاتە ئارا. لەبەر هەمان هۆ مەترسی لە وەرگێڕانی قوتابیە هاوچەرخەکانیدا هەیە، وەکی: "دێریداو دۆلۆزو فۆکۆو.. هتد". هەموو شتێك دەبێت بخرێتە سیاقی خۆیەوە، تابەراستی لێی تێبگەین. رەنگە هۆکاری ئەوەی زیاد لە سەدەیەکە شکستمان لەتێگەیشتنی فەلسەفەی خۆرئاوادا هێناوە، بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێمە لە کاتی وەرگێڕانیاندا لە سیاقی مێژوویی خۆیان دەریان دەهێنینو لەو سەرزەمینەیان دەقرتێنین کە بەرهەمی هێناون.

لێك شیتاڵکردنی ئەقڵانیەتی فەلسەفی هیچ مەترسیەکی بۆسەر کلتوری ئەوروپی نییە، چونکە ئەقڵانیەت لەو کلتورو کۆمەڵگایانەدا بۆ چەند سەدەیەك دەبێت رەگی داکوتیوەو شوێن پێی خۆی قایم کردووە، بەڵام بۆ رۆشنبیریی ئێمە نەك هەر مەترسیدارە، بەڵکو تاوانێکە دەرهەق بە کلتوری ئیسلامی، ئەو کلتورەی پێویستیەکی زۆری بەوە هەیە ئەقڵانیەتی فەلسەفیو زانستی تیا بچێنرێت.

**سەرچاوە**

**الشرق الأوسط — *2003/4/20***

## فیدراسیۆنی نێو نەتەوەیی وەرگێڕکاران

**لە فارسییەوە: فەرەیدوون بێوار**



فیدراسیۆنی نێو نەتەوەیی وەرگێڕکاران *—Fit—* لە ساڵی 1953 بە هەوڵ و تەقەلای (پیەر فرانسوا کایلە) لە شاری پاریسی

پایتەختی فەرەنسا دامەزرێنرا. —Fit— ئەنجومەنێکی نێو نەتەوەییە و نزیکەی لە پەنجا وولاتی جیهاندا ئەندامی هەیە. فیدراسیۆنی نێو نەتەوەیی وەرگێرکاران لە رێگەی ئەنجومەنە ئەندامیەکانییەوە گوزارشت لە حەزو ویست و پێوەندییە مادی و مەعنەوییەکانی زێتر لە شەست هەزار وەرگێرکار دەکات لە پێنج کیشوەری جیهاندا. —Fit— پێکهاتەیەکی تەواو ناسیاسی وەرگێرکارانی شارەزا و کارامەیە، لە چوارچێوەی رێکخراوێکی ناحکومیدا لە لایەن یونسکۆ وە پلەی —a— وەرگرتووە و پێوەندی نزیکی لەگەڵ رێکخراوە نێو نەتەوەییەکانی دیکەدا هەیە.

### ئامانجەکان

ئامانجە سەرەکییەکانی —Fit— بریتین لە:

یەکەم: دروستکردنی پێوەندی لە نێوان وەرگێرکاران وزێترکردنی پێوەندی هاریکاری لە نێوانیاندا.

دووەم: پشتگیری و زەمینە خۆشکردن بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنی وەرگێرکاران لەو وولاتانەی کە توانای پێکهێنانی ئەمجۆرە ئەنجومەنانەیان نییە.

سێیەم: بەرقەرارکردنی پێوەندی لەگەڵ ئەو رێکخراوانەی کە پێوەندیان بە کاری وەرگێران یان بوارەکانی دیکەی کەلتوری و زمانەوانییەوە هەیە.

چوارەم: برەو پێدان و پاراستنی هەماهەنگی و لێک تێگەیشتن لە نێوان رێکخراوە ئەندامەکان بە جۆرێك کە پاڵنەری (ئەنگێزەی) وەرگێرکاران زێتر بکات.

پێنجەم: خستنە رووی زانیاری و راو بۆچوونی بە کەڵك بۆ رێکخراوە ئەندامەکان.

شەشەم: پشتگیری و پارێزگاریکردن لە فێرکردن و توێژینەوە.

حەوتەم: دروستکردنی هاوئاهەنگی لە نێوان پێوەرە پسپۆریەکانی وەرگێراندا.

هەشتەم: بەرگریکردن لەبەرژەوەندییە مادی و مەعنەوییەکانی وەرگێرکاران لە سەرتاسەری جیهاندا، و هاریکاریکردنیان بۆ ناساندنی پیشە و بەرزکردنەوەی پێگە کۆمەڵایەتییەکەیان و هەروەها ناساندنی زانست و هونەربوونی وەرگێرکاری.

### ئەندامێتی

بەگەشەکردنی خێرای پیشەی وەرگێرکاری، لە شێوەی جۆراو جۆر و ئەمرۆییەکانیدا دوای جەنگی جیهانی یەکەم، کاتی ئەوە هاتبوو رێکخراوێکی جیهانی بۆ وەرگێرکاران دابمەزرێت.

وەرگێرکارانی تێکستە ئەدەبی و زانستی و هونەرییەکان، و وەرگێرکارانی هاوکات و هاوکاتی دادگاکان، و وەرگێرکارانی هاوکاتی کۆڕ و کۆبوونەوەکان، و وەرگێرکارانی گروپی میدیاکان، و زاراوەناسان دەستیان دایە دەستی یەکتری تا ئەو کێشە و گرفتانە چارەسەر بکەن کە بەهۆی پیشە تایبەتییەکانیانەوە لە پێوەندی نێو نەتەوەییدا هەیە.

### بابەتە سەرەکییەکان

Fit— لە رێگەی کۆمیسیۆنە تایبەتییەکانیەوە هەوڵ دەدات تا پێداویستییەکانی ئەندامانی فیدراسیۆنەکەی لەسەرتاسەری جیهاندا دەستەبەر بکات ئەویش بە بایەخدان بە بابەتەکانی وەکو فێرکردن و هەلومەرجی کاری و ناساندنی پیشەی وەرگێرکاری.

بەیاننامەی یونسکۆ لە بارەی چاکسازی و پارێزگاریکردن لە پێگەی کۆمەڵایەتی و یاسایی وەرگێرکاری و وەرگێرکار کە لەساڵی 1976 لە (نایروبی) پەسەند کرا، بە خاڵێکی وەرچەرخان دادەنرێت لە مێژووی *fit* دا.

*Fit* شانازی بە دەسکەوتەکانییەوە دەکات لە بواری پیشەی وەرگێرکاریدا. لە هەمان کاتیشدا ئەم ئەنجومەنە بەباشی ئاگاداری ئەوەیە کە کارێکی زۆری ماوە لە بواری دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی رۆژانەی بۆ لایەنی هاریکاری و پێوەندییە نێو نەتەوەییەکان. لەم رووە *Fit* بە رۆڵی ژیانی خۆی پەرەپێدەدات بۆ زاڵبوون بەسەر لەمپەرەکانی زمانەوانی و هاریکاری کردن بۆ برەوپێدانی لێک تێگەیشتن لە نێوان نەتەوەکاندا.

### دەستەی سەرۆکایەتی

کۆڕ و کۆبوونەوە جیهانییەکانی *Fit*– هەرسێ ساڵێک جارێک دەبەسترێت. ئەم کۆڕ و کۆبونەوانە دەرفەتێکی زۆر باش دەخاتە بەردەست وەرگێڕکاران، تا یەکتربیبنن و لە کارگە رەسمی و کۆبونەوە گشتییەکاندا باس و گفتوگۆ و راگۆڕینەوە بکەن سەبارەت بە کێشە و گرفتەکانی پیشەکەیان. جگە لەم کۆڕ و کۆبوونەوانەش – *Fit*– لەسەر ئاستی دەستەی سەرۆکایەتیش رۆڵی خۆی دەگێڕێت. لە میانەی ئەو هەڵبژاردنەی کە لە کۆبونەوەکەدا ساز دەکرێت، شۆراو کۆمیتەی بەرێوەبردن بۆ ماوەی سێ ساڵ بەرپرسێتی بەرێوەبردنی کاروباری رێکخراوەکە لە ئەستۆ دەگرێت. ئەم شۆراو کۆمیتەیە نزیکەی بیست کۆمیسیۆن و کۆمیتە پشتیوانی دەکەن و بەشێوەیەکی رێکوپێك کۆنووسی کارو پێشچوونەکانی بۆ شۆرا و کۆبوونەوەکە دەخەنە روو.

### ناوەندە ناوچەییەکان

*Fit*– لە کاتی پێویستدا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی و بۆ زێتر کردنی چالاکییە گشتییەکانی، دەست دەکات بە دامەزراندنی ناوەندە ناوچەییەکان. کۆمیتەی بەرێوەبردنی هەر ناوەندێك چەندان کۆڕ و کۆبونەوە لە ناوچەکەیدا ساز دەکات تاکو ئەنجومەنە ناوچەییە ئەندامەکانی *Fit* هانبدات بۆ گۆڕینەوەی بیروڕاکان و لێکۆڵینەوەی کێشەکانیان و دەستەی سەرۆکایەتی. *Fit*یش لەو کێشە و گرفتانە ئاگادار بکاتەوە.

### بلاّوکراوەکان

هەواڵنامەی (*babel*) (*translatio*) دوو وەرزنامەی – *Fit*–ن و بە شێوەیەکی بەردەوام بلاّودەکرێنەوە و خوێنەرێکی زۆریشیان لەناوەوەو دەرەوەی رێکخراوەکەدا هەیە. کورتە هەواڵنامەی (*Fit-flash*) دوای هەر دانیشتنێکی شۆرا یان کۆمیتەی بەرێوەبردن بلاّودەکرێتەوە. جگە لەمە کۆمەڵە وتارەکانی هەر کۆبونەوەیەکیش لە قاڵبی سەرچاوەیەکی کاملّی زانیارییە بەنرخەکان بۆ کەسانی ئارەزوومەندی بوارە جیاجیاکانی پیشەی وەرگێرکاری بلاّودەکرێتەوە و دەخرێتە بەردەستیان.

### سەرچاوە

مجلة اطلاعات علمي، ژمارە 11، ساڵ 1380– هەتاوی.

# فەیلەسوفان و گەورە بیریاران

## چۆن لەمانای خراپە گەشتون.

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع




ژنە نوسەری ئەم کتێبە "سۆزان نیمان" کە بەڕێوەبەری پەیمانگای ئەنشتاینە بۆ فیکر و فەلسەفە لە ئەڵمانیا. پێشتر کتێبێکی گرنگی بە ناونیشانی (یەکێتی عەقڵ: خوێندنەوەیەك بۆ فیکری ئیمانۆیل کانت) بڵاوکردۆتەوە. ئاشکرایە کانت دامەزرێنەری عەقڵانیەتی مۆدێرنە لە ڕۆژئاوادا.

دانەر لەم کتێبە تازەیەدا باس لە بابەتێکی ترسناك دەکات کە بە درێژایی مێژوو بووەتە شوێنی سەرقاڵکردنی فەیلەسوفان، ئەویش: بابەتی خراپەکارییە، بەمانایەکی تر بۆچی خراپە لە جیهاندا بوونی هەیە؟ لەبەرچی تەنها چاکە و خۆشەویستی و گیانی مرۆڤایەتیانە نییە؟ بەدرێژایی مێژوو کامەیە دەرکەوتەکانی خراپەکاری؟ فەیلەسوفان و بیریارانی گەورە چۆن لە خراپەکاری گەشتون؟

ئەمانە کۆمەڵە پرسیارێکن نوسەر دەیانخاتەڕوو، هەوڵدەدا لە ڕێگەی پەنابردنە بەر کتێبی گەورە فەیلەسوفانی وەك "لایبنتز، ڕۆسۆ، کانت، هیگڵ، مارکس، هیوم، مارکیز دوساد و دەیانی تر" وەڵامیان بداتەوە.

کتێبەکە لە پێشەکییەکی گشتی و چوار بەشی گەورەپێکهاتووە، هەر بەشەش چەند لقێکی لێدەبێتەوە، ئەمە جگە لەو پێڕست و پەراوێز و سەرچاوانەی کە لە کۆتایی کتێبەکەدایە. بەشی یەکەم ئەم ناونیشانەی هەیە: (ڕوناکی ئاسمان) کە پێنج لێکۆڵینەوەی درێژی لەخۆ گرتووە. یەکەمیان باس لە عەدالەتی خوایانە دەکات وەك ئەوەی فەیلەسوفی ئەڵمانی "لایبنتز" و شاعیری ئینگلیزی "ئەلکسەندەر بۆب" وێنای دەکەن، یەکەمیان ساڵی 1626 لە (لایبزگ) لە دایکبووە و ساڵی 1716 لە (هانۆڤەر) کۆچی دوایی کردووە، دووەمیان لە ساڵی 1688 لە (لەندەن) هاتوەتە دنیاوە و ساڵی 1744 ماڵئاوایی لە ژیان کردووە.

لەگەڵ ئەوەی هەموو ئەو خراپەکارییە لەم جیهانەدا ڕوودەدات، کەچی "بۆب" جەختی لەسەر سروشتی خێرخوازانەی مرۆڤ کردوەتەوە، هەردووکیان "لایبنتز و بۆب" باوەڕیان بە عەدالەتی خوایانە هەبووە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دێتەدی و پشتی چەوساوەکان دەگرێ و ستەمکار یاخود تاوانبار بە سزای خۆیان دەگەیەنێت. ئەم دوانە دەیانوت: خوای گەورە و میهرەبان ئەم جیهانەی بە باشترین شێوە دروستکردووە و لەمە باشتر نابێت، لێرەوە پێویستە لەسەرمان پێشوازی لە هەر خراپە یان کارەساتێك بکەین کە دێتەڕێمان، چونکە ئەوە

حیکمەتێکی خوایانەیە و لە دەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤە.

لە ڕاستیدا "لایبنتز" دەیویست کێشەی خراپەکە دەبووە هۆی ئابڕوچونی ئەوانی تر چارەسەر بکات، ئەوان دەیانگوت: (گەر خوای گەورە و میهرەبان ئەم جیهانەی بە باشترین شێوە دروستکردووە و بە شێوەیەکی عەقلانی ڕێکیخستووە، ئەی بۆچی شەڕ و خراپەی تێدا ڕوودەدات؟ بۆچی منداڵێکی بچوك کە ئازیزی دایك و باوکیەتی و لە ژیانیدا هیچ خراپەیەکی نەکردووە دەمرێ؟ مرۆڤی خێرومەند بۆچی توشی نەخۆشی کوشندە دەبێ و مرۆڤی تاوانباریش تەمەنێکی درێژ دەژی؟ ئایا ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە جیهان عەقلانی نییە بەپێچەوانەی ئەوەی فەیلەسوفان دەیانگوت؟) سەبارەت بەم پرسیارانە "لایبنتز" دەڵێ: (دەرئەنجامی گشتی گەردون باش و پۆزەتیڤانەیە، لێرەوە پێویستە بە خراپە ڕازیبین و لەبەرامبەریدا سەبرمان هەبێ).

لێکۆڵینەوەی دووەم لە بەشی یەکەمدا سەبارەت بە کێشەی خراپەکاری باس لە هەڵوێستی "جان جاك ڕۆسۆ" دەکات. ئەمەو لێکۆڵینەوەی چوارەم قسە لەسەر هەڵوێستی کانت و لێکۆڵینەوەی پێنجەم قسە لەسەر هەڵوێستی "هیگڵ و مارکس" دەکات.

ئاشکرایە "ئیمانۆیل کانت" قوتابی جان جاك ڕۆسۆ بووە و زۆر سەرسامیش بووە پێی. هەر بۆیە ناوی لێناوە (نیوتنی ئەخلاق) بەمانای ئەوەی ڕۆسۆ شۆڕشێکی لە بواری ئەخلاقدا بەرپا کرد کە هیچی لە شۆڕشەکەی نیوتن لە بواری فیزیا و گەردونناسیدا کەمتر نییە، بەڵام کانت لە خاڵێکدا لەگەڵ ڕۆسۆ جیاوازە کە بریتیە لەمەی خوارەوە: کانت واینابینێ کە سروشتی مرۆڤ سروشتێکی خێرخوازانەیە، بگرە وایدەبینێ کە خراپە لە قوڵایی ناخی مرۆڤدا بوونی هەیە، بەڵام مرۆڤ هەوڵدەدات خۆی لێدەرباز بکات یاخود لە توندوتیژییەکەی کەمکاتەوە، ئەویش لە ڕێگەی عەقڵ و گرتنەبەری ڕاسپاردە ئەخلاقییەکان یاخود یاسای ئەخلاقی وەك ئەوەی خۆی ناوی لێنابوو.

پاشان دانەر لەسەری دەڕواو دەڵێ: ڕاستە کانت کاریگەری ڕۆسۆی لەسەر بووە، بەڵام لەهەموو شتێکدا شوێنی نەکەوتووە، بەڵکو زۆری بۆ زیادکردووە، لە واقیعدا کانت نوێنەری ئەخلاقی مۆدێرنە لە ڕۆژئاوا کە جێگەی ئەخلاقی تەقلیدی مەسیحی گرتەوە. بە واتایەکی تر کانت هەستا بە عەلمانیکردنی ئەخلاقی مەسیحی و کۆمەڵێ پرنسیبی فەلسەفی عەقلانی پێبەخشی. هەندێك دەڵێن گۆتە دوای ئەوەی نوسینەکانی کانتی سەبارەت بە بوونی خراپەکاری لە قوڵایی مرۆڤدا دەخوێنێتەوە، زۆر بێزار دەبێ و دەڵێ: (بەداخەوە ئەم فەیلەسوفە کە بە درێژایی تەمەنی ژیانێکی پاك و بێگەرد ژیاوە، کەچی لەدواجاردا گەشتوەتە ئەم بیرۆکە خراپە، کانت لەباتی ئەوەی باوەڕی بە سروشتی خێرخوازانەی مرۆڤ هەبێ، دەستیکردووە بە تۆمەتبارکردن و گومانکردن لە مرۆڤ). بەڵام گومانی کانت لە مرۆڤ مانای ئەوە نییە ئەو بەیکجاری مرۆڤ تاوانبار دەکات، چونکە مرۆڤ لە ڕێگەی پەروەردەیەکی تەندروست و گۆڕانی بارودۆخی مادیی خراپییەوە کە ناچاری دەکات کاری دڕندانە ئەنجامبدات، دەشێت هەڵسوکەوتی چاك بکرێت.

ئاشکرایە مرۆڤی برسی کە برسییەتی زۆری بۆ هێنا دەستدەکات بە دزی... ئیدی لەمەوە بیگرە.. لێرەوە مرۆڤ بەرهەمایی خراپەکار نییە تەنها لە هەندێ حاڵەتی زۆر کەم و دەگمەندا نەبێ، مرۆڤ کاتێ خراپەکارە کە بارودۆخەکەی نالەبارە، لێرەوە لەسەر کۆمەڵگا پێویستە ژیانی تاکەکانی چاك بکات و ئاستی گوزەرانێکی باشیان بۆ دابین بکات تاکو لە ڕێگەی ڕاست لانەدەن و دزی و تاوان ئەنجام نەدەن. لە هەموو ڕۆژئاوادا پەروەردەی تازە لەسەر ئەم پرنسیبە دامەزراوە، پرنسیبێك لەو بڕوایەدایە تەنانەت تاوانباریش دەکرێ لە گرتوخانەکەیدا لە ڕێگەی فێرکردن و چاککردن و ڕۆشنبیرکردنییەوە ئاکاری باش بێت و دواجار لەسەر ئیشێك ڕابێت کە کەرامەتی مرۆڤانەی بۆ بگێڕێتەوە.

پاشان دانەر بەردەوام دەبێ و دەڵێ: بەڵام هیگڵی فەیلەسوف بەم دەستەواژەیەی خوارەوە ناوبانگی دەرکردووە: (هەموو شتێکی واقیعی عەقڵانییە) هەندێکیش وایدەبینن ئەم دەستەواژەیە پاساودانێکە بۆ مەسەلەی خراپەکاری لە جیهاندا. کوشتارگاکان واقعیین، بەڵاو کارەساتە سروشتیەکان واقعیین، واتە ئەوانەی ماوە بەکردەیی ڕوودەدەن. ئایا ئەوە عەقڵانییە یاخود ئەخلاقییە؟

هیگڵی فەیلەسوفی گەورە وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ: (من ناڵێم ئەخلاقییە، بەڵام دەڵێم دەبوو ڕوویان بدایە، گەر پێویست نەبوایە ڕوویان نەدەدا). لێرەوە بۆ چاککردنی بارودۆخی مرۆڤایەتی لەسەرمانە ئەوەی لە توانامانەدا هەیە جێبەجێی بکەین، بەڵام گەر خراپەیەك ڕوویدا ئەوا وایدادەنێین ئەوە شتێکی ناچارییە و ڕەنگە لە پشتیەوە شتێکی شاردبێتەوە کە ئێمە لە چرکەساتی یەکەمدا دەرکی پێناکەین، زۆرجار گوزەرانی خەڵك دوای ئەوەی بە قۆناغێکی سەختی پڕ لە پەشێوی و برسییەتی و شەڕی ناوخۆ و ناخۆشیەکاندا تێدەپەڕێ، باش دەبێت.

ئیدی دوای ئەوە مەسەلەکان هێور دەبنەوە و حاڵ و گوزەرانیان زۆر باشتر دەبێت. ئەمەش مانای ئەوەیە خراپەکاری پێویستیەکی مێژوییە و دەبێت بێتە دی و ڕووبدات.

خراپەکاری نیشانمان دەدات ڕێگای گەشتن بەحەقیقەت پڕ کەندوکۆسپە و پێویستە باجەکەی بدرێ، هەروەها بونی خراپە لە جیهاندا ئاماژەیەکە پێمان دەڵێ کاری چاکە و چۆنایەتیەکەی چەند گرنگ و بایەخدارە. دژەکان شتەکانمان بۆ دەردەخەن، ناشتوانین چاکە بناسین گەر خراپەمان نەناسیبێ. نمونەیەك بۆ ئەوە شۆڕشی فەرەنسییە کە کوشت و بڕ و خراپەیەکی زۆری لێکەوتەوە و ماوەیەکی زۆر کاری ترسناکانەی تیرۆرکردنی بەخۆوەبینی، دواتر مەسەلەکان ئاشکرابوون و فەرەنسا گەشتە هێنانە ئارای ڕژێمێکی تازە کە لە ڕژێمی پێشو باشتربوو. لێرەوە بۆ گەشتن بە قۆناغێکی باش پێویستە بە قۆناغێکی خراپدا تێپەڕین، پێویستە بەقۆناغێکی نێگەتیڤدا تێپەڕین تاکو دەگەینە قۆناغێکی پۆزەتیف.

بەشی دووەمی کتێبەکە قسەوباس لەسەر ئەو فەیلەسوفانە دەکات کە ئەم جیهانە و پێکهاتەکەی تاوانبار دەکەن و لەو بڕوایەشدا نین ئەم جیهانە باشترین جیهانی گریمانە کراوبێت وەك ئەوەی لایبنتز و شاعیری ئینگلیزی بۆب

دەیانگوت. لەنێو ئەوانە فەیلەسوفی فەرەنسی "بییر بایل"ە کە لەسەدەی حەڤدەهەمدا ژیاوە و بەچاوی خۆی ئەو کوشتارگایانەی بینیوە لەسەر دەستی کاسۆلیکەکانی فەرەنسا بەرامبەر بە پرۆتستانتەکان ئەنجامدراوە، ئاشکرایە فەرەنسا ئەو کات دابەش ببوو بەسەر دوو بەشدا:

بەشێکی کاسۆلیك و بەشێکی پرۆتستانت، بەشی یەکەمیش زۆرینەبوون. لەبەر ئەوە بەشی دووەمیان دەچەوساندەوە و بەگومڕا و لادەر تۆمەتباریان دەکردن. پاشان لویسی چواردەهەم بۆ لەڕیشە دەرهێنانی پرۆتستانتەکان لە فەرەنسا پەلامارێکی ناڕەوای دان، ئیدی بەهۆی دەمارگیرییە ئاینییەکەی لویسی شانزەهەم و بەهۆی ئارەزوویەوە بۆ ڕازیکردنی زۆرینەی کاسۆلیکی میللەتەکەی، سەدان هەزار لە پرۆتستانتەکان کۆچیان کرد و ڕوویانکردە دەرەوەی وڵات.

"بییر بایل"ی بە ڕەچەڵەك پرۆتستانتی لەنێو ئەو کۆچبەرانەدا بوو، ئەو لە ساڵی 1647 لە پاریس لەدایکبووە و لە ساڵی 1706 وەك دوورخراوەیەکی ڕاونرا و لە هۆڵەندە کۆچی دوایی کردووە. کتێبێکی بەناوبانگی لەژێر ناونیشانی (فەرهەنگی فەلسەفی) بڵاوکردەوە، تێیدا باس لەو خراپەکارییە دەکات کە لە سروشتی مرۆڤدا هەیە، خراپەکارییەك پاڵی بە مەسیحیەکانەوە نا لە نێوان خۆیاندا شەڕی مەزهەبی هەڵگیرسێنن و لە میانەی شەڕی ناوخۆوە کوشت و بڕێکی زۆر لە دژی یەك ئەنجام بدەن. لەوەش خراپتر ئەوە بوو هەموویان مەسیحی بوون و باوەڕیان بە ئینجیل و مەسیح هەبوو، بەڵام هەر مەزهەبەی بە ڕێگایەکی دیاریکراو باوەڕی هەبوو کە جیاواز بوو لەڕێگەی مەزهەبەکەی تر، هەر مەزهەبەی بەڕێگای تایبەتی خۆی ئاینی شیدەکردەوە.

لێرەوە جیاوازی کەوتە نێوان کاسۆلیکەکان و پرۆتستانتەکانەوە، وەك ئەو جیاوازییەی لە جیهانی ئیسلامیدا لەنێوان شیعە و سونەدا هەیە.

بایل دەڵێ: بۆ ئەوەی لە ئەقڵی تیرەگەری و بیرکردنەوەی تەسکی مەزهەبی دەربچین پێویستە پەنا بۆ عەقڵ ببەین، بەمانایەکی تر پێویستە شیکردنەوەی عەقڵانی تازە بۆ دین بکەین، گەر نا ئەوا تا هەتاهەتایە یەکتر سەردەبڕین و ناشتوانین کێشەکە چارەسەر بکەین. لەبەر ئەم هۆیە بوو دوای بیل بیرمەندانی ڕۆشنگەری دەرکەوتن و لاسایی ئەویان کردەوە و زۆربەی بیروڕاکانیشیان بەکارهێنا، لەوانە "ڤۆڵتێر و دیدرۆ و ڕۆسۆ.." زۆرێکی تریش.

ئەوەی تایبەتە بە ڤۆڵتێر کە لەنێوان ساڵانی 1694-1778دا ژیاوە، دەتوانین ئەمەی خوارەوە بڵێین:

تا دواسنور باوەڕی بە عەقڵ هەبووە و لەو بڕوایەشدا بوو خوای گەورە و میهرەبان بەباشترین شێوە جیهانی دروستکردووە و بەشێوەیەکی چاك ڕێکیخستووە، وەك چۆن ئەندازیارێك ئەو ئامێرەی دروستی دەکات بەشێوەیەکی تەواو ڕێکی دەخات، هاوکات چۆن هیچ ئامێرێ بێ دروستکەرێك بونی نییە، ئاواش گەردوون بێ خالقێك بوونی نییە، بەڵام گرفتەکە ئەوەیە مرۆڤ نییەتی خراپە و سروشتێکی شەڕانگێزی هەیە، لەبەر ئەوەیە لەکۆمەڵگادا گیروگرفت ڕوودەدات، جگە لەوە نەزانین و

دەمارگیری ئاینی و کورتبینی هەموویان شتگەلێکن پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێن دەستدرێژی بکاتە سەر مرۆڤی برای. لەبەر ئەم هۆیەش بوو ڤۆڵتێر لەسەردەمەکەی خۆیدا بانگەشەی بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەقڵ ئەکرد تاکو لە کورتبینی و ئەحکامی پێشوەخت و عەقڵیەتی تایفەگەری بێزراو بێتەدەرێ. ئەودەم ڤۆڵتێر لەگەڵ توندڕەوە مەسیحیەکان بەریەک کەوتن، بەتایبەتی کاسۆلیەکەکان کە زۆرینەیان پێکدەهێنا و بەرێگەیەکی ناعەقلانی توندوتیژ لە ئاین گەشتبون، بە پێچەوانەی زۆربەی پرۆتستانەکانەوە.

ئیدی جەنگێکی فیکری گەورە لە نێوان ڤۆڵتێر و گەورە پیاوانی ئاینی مەسیحی هاتە ئارا کە لە کتێبەکانی مێژوودا تۆمارکراوە. ئەمە لەلایەک، بەڵام لەلایەکی ترەوە ڤۆڵتێر لە تێڕوانینی گشتیدا بۆ گەردوون بە پێچەوانەی لایبنتز ڕەشبین بووە، لەو بڕوایەدا بووە خراپە قەدەرێکە هەڵهاتن و دەربازبون لێی مەحاڵە، گەورەترین بەڵگەش بۆ ئەوە ڕوودانی کارەساتە سروشتیەکانە، بومەلەرزە و بورکان و باوبۆران و ئاگر کەوتنەوەکان. ڕەشبینیەکەی ڤۆڵتێر زیاتر بوو کاتێ گوێبیستی ئەو بومەلەرزە گەورەیە بوو کە بەر شاری بەرشلۆنە کەوت و سەرتاپای شارەکەی تێکوپێکدا و سەدان هەزار کەس بوونە قوربانی.

ڤۆڵتێر وتی: عەقڵێ نییە پاساو یاخود لێکدانەوەیەک بۆ ئەم ڕوداوە دڵتەزێنە گەورەیە بکات و دەیپرسی: بۆچی توانای خودایی ڕێگە لە ڕودانی ئەمانە ناگرێ؟ بەڵام جان جاک ڕۆسۆ وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: تۆ وەک پێویست ئیماندارنیت، گەرنا ڕازی دەبوویت بە قەدەری یەزدان، حیکمەتێکی خوایانە لەسەرو ئێمەوە هەیە و بەدەرە لە دەسەڵاتی مرۆڤ و نابێ هەرجارێ کارەساتێک یاخود نەهامەتییەک ڕویدا کوفری خوا بکەین.

دواتر دانەر باس لە لێکدانەکەی 11سێپتەمبەر دەکات و شتێک بەم مانایە دەڵێ: کاتێ لە بەرەبەیانی 11ی سێپتەمبەردا تیرۆر لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای دا و بەجارێ سێ هەزار کەسی کوشت، ئەمریکیەکان ئەو کارەیان بە گەورەترین خراپەکاری دانا، ئایا کەسێ گەر ویژدانی هەبێ ئەو ژمارە زۆرەی خەڵک دەکوژێ و خێزانەکان هەتیو دەخا و ژنەکان بێوەژن دەکات و زەندەقی هەزارانیش دەبا؟ کەچی ئەو لایەنەی ڕووداوکەی ئەنجامداوە بە ئیشێکی ئەخلاقی ڕووتی دادەنێ، چونکە پێودانگەکانی پێودانگی خەڵکانی تر نییە، ئەوان وایدادەنێن ئەو خەڵکە کافرن، بۆیە کوشتنیان ڕەوایە و خوداش لەسەر ئەوە سزایان نادا.

لە واقیعدا پاساو هێنانەوە بۆ تیرۆر هێندەی کۆنی مێژوو کۆنە، پێشتر بە بیانوی ئەوەی بەرگریکردنە لە کێشەی پرۆلیتاریا و چەوساوەکان پاساویان بۆ دەهێنایەوە. ڕوسیا لەسەدەی نۆزدەدا بزوتنەوەیەکی تیرۆرستی بەخۆوە بینی کە لە کۆمەڵێ لاوی چەپڕەو پێکهاتبوو، ئەمانە ژمارەیەکی زۆریان لە پیاوانی دەوڵەتی ڕوسی کە لەنێویاندا خودی قەیسەر بوو تیرۆرکرد.

ئاشکرایە ڕۆماننوسی گەورە "دیستۆفسکی" لە ڕۆمانێکی بەناوبانگدا باسی لەوانە کردووە. ئەو گەنجە توندڕەوە عەدەمیانە لە ڕێگەی ئەوەی گوایە خزمەتی کێشەی گەل دەکەن و تۆڵە لە دەسەڵات دەکەنەوە کە خوێنی

دەمژین، پاساویان بۆ کردەوە تیرۆرستیەکانی خۆیان دەهێنایەوە. لێرەوە ئەوە فیکری چەپ بوو مەشروعیەتی ئەدا بە تیرۆر، بەڵام ئێمە دەزانین کە فەتوا ئاینیەکان کاریگەریان زیاتر هەیە بۆ مەشروعیەت دان بە تیرۆر و وا دەکەن تیرۆر لای خەڵکی قبوڵ بکرێ.

لە مسیحیەتدا قەشەکان بە بیانوی ئەوەی لە ئامۆژگارییەکانی خواوەند لایانداوە، فەتوای کوشتنی ئەم زانا و ئەو زانای تریان دەردەکرد و هەندێ گەنجی خوێن گەرم یاخود توندڕەو فەتواکانیان جێبەجێ دەکرد. هەر ئەمەش بوو یەکێك لە ئەفسەرە فەرەنسیەکان پێیهەستا، کاتێ ویستی جەنەڕاڵ دیگۆل تیرۆرکات، چونکە بەلای ئەو ئەفسەرەوە گوایە جەنەڕاڵ دەیویست واز لە (جەزائیری فەرەنسا) بێنێت، بۆ ئەمەش لە کتێبەکانی بیرمەندی مەسیحی سەدەکانی ناوەڕاست قەشە "تۆما ئەکیونی" فەتوایەکی ئاینی بەدەستهێنا و بە ئارەزوی خۆی لێکدانەوەی بۆ دەکرد و دەیوت: ئەم فەتوایە پاساو بە کوشتنی دیگۆڵ دەدات، چونکە دیگۆل حەقی فەرەنسای لە جەزائیر بەفیڕۆ داوە، بەڵام لە بەختی فەرەنسیەکان هەوڵەکانی ئەو ئەفسەرە شکستی هێنا، لێرەوە هەموو کاتێ بە بیانوی بەرگریکردن لە کێشەیەکی دیاریکراو پاساو هێنانەوە بۆ تیرۆر دەکرێ.

بەڵام دەزانین لەسەر ڕوی زەوی کێشەیەك نییە پاساو بۆ تیرۆری کوێرانە بێنێتەوە، ئەمە دەڵێن چونکە تیرۆرست ناتوانێ بە تەواوی کۆنترۆڵی کارەکەی بکات، ڕەنگە خەڵکێکی ڕاگوزەر کە دوور و نزیك هیچ پەیوەندییەکیان بە کێشەکەوە نییە تیاچن، ئەمەش ڕویدا کاتێ یەکێك لە قوتابییە ڕوسەکان ڕۆشت تاکو کەسێتییەکی ڕوسی گەورە تیرۆر بکات، کەچی بۆمبەکە پێش وادەی خۆی دەتەقێتەوە و ئەو خەڵکانەی بە ڕێکەوت بەو ناوەدا ڕۆشتون پێوەدەبن نەك کەسی دیاریکراو. ئەمە جگە لەوەی تەقاندنەوەی کۆگا وچێشتخانە و گازینۆ و شوێنە گشتییەکان دەبێتە هۆی کوشتنی خەڵکێکی زۆر بەبێ جیاوازی.

لێرەوە کارە تیرۆرستییەکان سیمایەکی ڕێکەوتئامێزیان هەیە، هەر بۆیە زۆرینەی خەڵك تیرۆر بە خراپەی ڕەها دادەنێن.

**سەرچاوە**

**بیان الکتب – 15ی نۆڤەمبەری 2004**

# بنەچەکان

## ئەمین مەعلوف حیکایەتی

خێزانەکەی خۆی دەگێڕێتەوە

**ئەمین مەعلوف**

**لە عەرەبییەوە: شیرین. ك**

نووسەری ئەم کتێبە ئەمین مەعلوف-ی نووسەری لوبنانی بەناوبانگە کە لەساڵی 1949دا لەلوبنان لەدایکبووە, لەساڵی 1976ەوە لەفەرەنسا نیشتەجێ بووە. تا ئێستا چەندین کتێبی

گرنگـــی بڵاوكردۆتـــەوە كـــە ناوبـــانگێكی نێودەوڵـــەتی بـــۆ پەیـــداكردووە لەوانـــە رۆمـــانی (صـخرة طـانیوس) كـە لەساڵی 1993 خـــەڵاتی گۆنكـــۆری ئـــەدەبیی لەســـەر وەرگـــرت. هـــەروەها چـــەندین كتێبـــی تـــر لەوانـە رۆمـانی (لیـون الافریقـي)، (حـــدائق النـــور)، (مـــواني‌ء المشـــرق)، (القـــرن الاول بعـــد بیـاتریس)، (سمرقنـد)، (رحلـة بالدســـار)، هـــەروەها چـــەند كتێبێكـــــی فیكریشـــــی بڵاوكردۆتـەوە لەوانـە (الحـروب الصـلیبیة كمـا رأهـا العـرب) و (الهویـات القاتلـة). بەرهەمـەكانی ئـەم نووسـەرە بـۆ سـی و حـەوت زمان وەرگێڕدراون.

لـەم كتێبـە نوێیەشـیدا ئـەمین مەعلوف باسی بابەتێك دەكات كە زۆر خۆشەویســـــتە لـــــەلای: خێزانەكــــــەی و بنەچـــــــە لوبنانییەكـــەی، كتێبەكـــەش شـــــــێوەی رۆمـــــــانێكی سەرنجڕاكێشـــی وەرگرتـــووە هەرچـــەندە رۆمـــانێكی خـــەیاڵی نییـــە، بـــەڵكو چـــیرۆكێكی راســـــتەقینەی بنەماڵەیـــــەكی لوبنانییـە ئـەویش بنەماڵـەی (ال مەعلووف) خۆیەتی.

نووسـەر وەكـو زەمـەن چـەند نەوەیەك دەگەڕێتەوە بۆ دواوە تا باووباپیرانی و بن و بنەچەی لە (جبـــل لبنـــان) بدۆزێتـــەوە، لەرۆمانەكـــەدا تێبـــینی ئـــەوە دەكرێ كە نووسەر جەخت لەسەر كەسـێتی بـاپیرەی دەكـا: واتـە باوكی باوكی كـە نـاوی (بطـرس معلوف)ەو كەسێتی سەرەكییە كە هـەموو كەسـێتییەكانی تـری نـاو خێزانەكە لـەدەوری ئەسوڕێتەوە، بـــەڵكو رووداوەكـــانی نـــاو لوبنـانیش هـەر لـەدەوری ئـەم دەســوڕێنەوە، ئـەو رووداوانـەی سـەردەمی عوسمانییـەكان پـێش ئـــەوەی ئینتیـــدابی فەرەنســـی جێیان بگرێتەوە، كەواتە زیرەكی نووسـەر لەوەدایـە كـە زانیـوێتی چۆن شتە تایبەتی و گشتییەكان پێكـەوە ببەسـتێتەوە: لـەنێوان خێزانـە بچـكۆلەكەیداو خێزانـە گەورەكەیـــدا: واتـــە هـــەموو نیشتمانەكەی.

بـۆ نووسـینی ئـەم رۆمانـە پشتی بەجانتایـەكی گـەورەی پـڕ لەئەرشـیفی كـۆنی خێزانەكـەی بەسـتووە، بەتایبـەتی ئـەو نامـە تایبەتیانـــــەی ئەنـــــدامانی خێزانەكـەی لـەنێوان خۆیانـدا ئاڵوگۆڕیان كردووە، ئەو جانتایە گەنجینەیـەكی لـەبن نـەهاتووی زانیارییـە سـەبارەت بەبنەماڵـەی مـــەعلوف و ئـــەو رووداوانـــەی بەســـــەری هـــــاتووە هـــــەر لەكۆتاییـەكانی سـەدەی نـۆزدەوە تـانیوەی سـەدەی بیسـت لێـرەوە تێدەگـەین كـە لـەو سـەردەمەدا ململانێـــی نێـــوان تایەفـــەی كاســــــۆلیكی و تایەفــــــەی پرۆتســـتانتی لەوپەڕیـدا بـوو، هـەروەها لـەوەش دەگـەین ئـەو مژدەدەرانـــــەی لەئـــــەمریكاو شوێنانی ترەوە هاتووە مەزهەبی پرۆتســـــتانتیان لەنێوەنـــــدی مەســــــیحییەكانی لوبنانــــــدا بڵاوكردۆتـــــەوە كاســـــۆلیك مەزهەبــــــــــــــــەكانیش بەدوژمنایەتییـــــــــەكی زۆرو بـەقێزوبێزەوە بەرپەرچـی ئـەم هەوڵانەیان داوەتەوە، لایـەنگرانی مەزهـــەبی پرۆتســـتانتی وەكـــو هراطقـــة و لادەر لەمەزهـــەبی مەسـیحی راسـتەقینە تەماشـا دەكەن واتە مەزهـەبی كاسۆلیكی پاپەوی رۆمانی.

ئینجا ئـەمین مـەعلوف باسـی بەشداریكردنی بطرسـی باپیرەی دەكات لـەو رووداوە مێژوویانـەی كـە ئەوسـا لەرۆژهـەڵات روویـان ئـەدا، بـەڵام پـێش ئـەوە بنەچـە مەزهەبییەكانی خێزانەكەی روون دەكاتـەوەو دەڵـێ: لـەرابردوودا بنەماڵەكـەمان سـەر بەتایەفـەی مەسـیحی ئەرسۆدۆكسـی بـوون وەكـو زۆربـەی یۆنانییـەكان و ئەرمـــــەن و ســـــــڕبەكان و

رووســەكانیش, بــەڵام لــەكۆتایی ســـەدەی هـــەژدەو ســـەرەتای سـەدەی بیسـتدا دابەشـبوونێكی ئـــایینی لەناومانـــدا روویـــدا, خێزانەكـەی ئێمـەش لەبـەر چـەند هۆیـــەكی نادیـــار چـــووە ســـەر مەزهـــەبی كاســـۆلیكی و بـــۆ یەكـەمجار دانـی بـەپاپای رۆمـادا نا.

ئەمـــە هـــەروا بـــێ كێشـــەو شەڕوشـۆڕی نـاو ماڵـەكان تـەواو نـــەبوو, بـــەڵكو لەئـــەنجامی ئـــەم رووداوانــــــەوە تـــــــاوانێكی بـــەناوبانگی كوشـــتن روویـــدا, پـــەتریاركێكی كاســـۆلیكی كـــە هـاتبوو بۆئـەوەی هانمـان بـدا تـا مەزهـــەبی ئەرسـۆدۆكســـی واز لێبهێـــنین و بـــاوەڕ بەمەزهـــەبی كاســـۆلیكی بهێـــنین, بەدەســـتی یەكێك لەئەندامانی بنەماڵەكەمان لەقـەراغ گوندەكـەمان كـوژرا, ئـەو كەسەی ئـەو پەتریاركـەی كوشـت نـــاوی (أبـــو كشـــك) بـــوو, لـــەوە دەچـــــــوو زۆر پابەنـــــــدی مەزهەبەكـــەی- ئەرسـۆدۆكســـی- بــــووبێ و نەیویســــتبێت وازی لێبهــێنێ, ئـــیتر ئـــەو بكـــوژە هەڵهاتووە بۆ قبرص, بەڵام دوای كـــەوتوون بـــۆ ئـــەوێ و بـــەفێڵ هێناویانەتەوە بۆ لوبنـان و دواتـر لەسـێدارەیان داوە. ئینجـا ئـەمین مــــەعلوف لەســــەری دەڕوات و دەڵـــێ: ئـــەو رووداوە برینێكـــی قوڵی كردە خێزانەكەمانەوە كە تا ئێســتاش بەســەر دوو مەزهەبــدا دابــــــەش بــــــووە, یەكـــــــەم ئەرسۆدۆكســــــــــــــی و دووەم كاسـۆلیكییە بـەڵكو مەزهــەبێكی تریشـــی بـــۆ زیـــاد بـــوو كـــە پرۆتســــتانتیە كەواتـــە ئێمـــە خێزانێكی فرە مەزهەبین.

لەكتێبەكـەی ئـەمین مەعلوفـدا ئـــەو شـــتەی خوێنـــەر تووشـــی سەرسـوڕمان دەكـات ئەوەیـە، كـە ئێمــــە وامانــــدەزانی ململانـــێ ئاینییـەكانی لوبنـان هـەر لـەنێوان ئیسـلام و مەسـیحییەكاندا بـووە, كەچی دەبیـنین ململانـێ لـەنێوان مەسـیحییەكان خۆشـیاندا هەیـەو هەمان شتیش لەنێوان ئیسلامییە شـیعەو سـوننەو دروزەكانیشـدا هەیـــە. تایبەتمەنـــدێتی ئـــەمین مـــەعلوف لەوەدایـــە كـــە هـــەموو ئەمانـە بەراسـتگۆیی و دڵسـۆزی دەگێڕێتـــەوە بێئـــەوەی قـــەت هەوڵبـدات وێنەكـە جـوان بكـات یان راستی بشارێتەوە, بێگومـان سـەركەوتوویی كتێبەكـە لێـرەوە دێت كە وێنەیەكی ورد سەبارەت بـەبارودوخی لوبنـان پێشـكەش دەكات لـەو سـەردەمە شـڵەژاوەی عوسمانییەكانـــدا, گـــرنگترین فەسـڵی كتێبەكـە ئـەو فەسـڵەیە بەناوی (أنوار) یان (تنویر) تیایدا باسـی ئـارەزووی بـاپیری دەكـات بۆ گۆڕینی بارودۆخی رۆژهـەڵات لەسـەرەتاكانی سـەدەی بیسـتدا, ئـــەو كاتـــەی ئیمپراتۆریـــەتی عوسمـانی خـەریك بـوو هەنـدێ رووداوی گـــەورەی بەخۆیـــەوە دەبینی.

ئینجـــا ئـــەمین مـــەعلوف لەســـەری دەڕوا: (بـــەڵكو هـــەموو رۆژهەڵات گینگەڵی دەداو دەبزوا, هـــەزاران خوێنـــەوارو رووناكـبیر بـــەنهێنی كاریـــان دەكـــرد بـــۆ رەواندنـــــەوەی تاریكییــــەكان, لەوانـە سـەن یـان سـەن لەچـین و كمال ئەتاتورك لەتوركیا).

بطـرس مـەعلووف بـاپیرەش هەرچـەندە لەئاسـتێكی سـاكاردا بوو, بەڵام هـەر لـەو كەسانە بـوو, ئـــەوو چـــەندانی وەكـــو ئـــەو لەلوبنانـــــــــدا خـــــــــەونیان بەسـەردەمێكی نوێـوە دەدی كـە سـەردەمی سـتەم و دەمـارگیری ئایینی و تـاریكی نـەبێ, بطـرس مامۆســـتا بـــوو لەپـــەیمانگای رۆژهـــەڵاتی لەشـــاری زحلـــە-ی لوبنـان, لـەو شـوێنەی خۆیـەوە دەیویسـت روونـاكی و زانیـاری لـــەنێوان قوتابییەكانیـــدا بـــڵاو بكاتــەوە. لــەو كاتــەدا پیــاوانی ئـایینی بەسـەر عـەقڵی هـەموو تایەفەكانـــدا زاڵبـــوون هـــەر لەمەســــــیحییەكانەوە تـــــا

ئیسلامییەکان، بەڵام خوێندنی تازە لەسەر دەستی کۆمەڵێ مامۆستای عەلمانیدا دەستیپێکردبوو لەوانە بطرس-ی باپیری، ئەوانە دەیانویست ببنە مەشخەڵ تا رێگە بۆ ئەوانی دی رووناك بکەنەوە، ئەمە ئەو رۆڵە بوو کە باپیری دەیویست بیگێرێ چ وەکو مامۆستایەك چ وەکو شاعیرێك یان نووسەرێك.

بۆ نموونە باپیرەی دەیوت: سوپاس بۆ خوا گەلە رۆژهەڵاتییە گەورەکەمان لەهیچی کەم نییە و هیچ خەوشێکی نییە، تەنیا نەزانی نەبێ، بەداخەوە زۆربەی خەڵکی نەخوێندەوارن، خوێندنەوەو نووسین نازانن ئەم نەزانینییەش چەندین کەموکوڕی بەرهەم دێنێ لەوانە دووڕوویی، درۆ، دووفاقی، فێڵ و هەڵخەڵەتاندن و شەڕوشۆڕی بەردەوام. ئەم نەخۆشییەش ترسناك و درێژخایەنە هیچ چارەسەرێکی نیە جگە لەزانیاری راستەقینە، هەر بۆیە (بطرس المعلوف) لەیەکێك لەقەسیدەکانیدا هێرش دەکاتە سەر تەربووش و تەربووش لەسەرەکان و بەهێمای جەهل و تاریکی دەمارگیرییان دادەنێ، هەر دوای ئەوە بەماوەیەکی کورت ئەفسەرێکی لاو دەرکەوت بەناوی کمال أتاتورك و تەربووشی بەتەواویی قەدەغە کردو دژی نەزانین و خورافات وەستایەوەو پەیڕەوی شارستانی نوێی کرد، ئەمە بۆ بطرس دڵخۆشکەرە بوو.

ئینجا ئەمین مەعلووف دەڵێ: گۆڕینی رۆژهەڵات ئەوەی باپیرم خەونی پێوە دەدی ئەوەندەی نەخایاند لەیەکەم رۆژەکانی تەمووزی 1908دا سەریگرت، ئەمەش لەسەر دەستی حزبێکی نوێدابوو بەناوی: -ترکیا الفتاة- ئیتر سوڵتان عبدالحمید ناچار بوو ملکەچی ئارەزووەکانی بانگەشەکەرانی تازەگەری بێت ئەوانەی داوای پەیڕەوکردنی دەستوورێکی لیبڕاڵیان دەکرد کە ئازادییەکان بپارێزێ و شمشێری سانسۆر و تۆس لەسەر ملی خەڵکی لاداو فەرمان بدا بەرێکخستنی هەڵبژاردنێکی گشتی هەروەکو چۆن لەدەوڵەتە ئەوروپاییە پێشکەوتووەکاندا روودەدا، بەڵام سوڵتان هەر بەسەرزاری ئەو چاکسازییانەی پەسەند کرد، چونکە بەنهێنی کەوتە دروستکردنی تەگەرەو رێگەگرتن لێیان، دەستیکرد بەناردنی لایەنگران و جاسووسەکانی بۆ لای نێوەندە تەقلیدییە موحافیزکارەکان تا بەخەڵکی بڵێن داواکارانی چاکسازیی کەسانێکی بێباوەڕو کافرن و باوەڕیان بەخوا نییەو دەیانەوێ شەریعەتی دین بگۆڕن و لەجێی زەندیقیە شەیتانییە نامۆکان دانێن گەورەترین بەڵگەش ئەوەیە کە ژنان بەسفوری و ئارایشتەوە هەروەکو ئەوروپاییەکان دەچنە دەرەوە ئەو ژنانەی کە تا ئێستا داپۆشراوو سەرپۆش بەسەر بوون، بەمشێوەیە سوڵتان عبدالحمید توانی شۆڕشگێڕان و داواکارانی چاکسازی بوەستێنێ و بشیانخاتە زیندانەوە لەچاوەڕوانی شۆڕشێکی تردا، لەراستیشدا چاوەڕوانییەکەیان زۆری نەخایاند، هەر دوای دە ساڵ وەکو وتمان لەسەردەستی ئەفسەرێکدا روویدا بەناوی مستەفا کەمال ئەتاتورك، بەمجۆرە بیرە نوێیەکان لەئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بڵاوبووەوەو لەکۆتاییشدا بووە هۆی ئەوەی ئەو ستەمکارییەی هەمیشە عبدالرحمن الکواکبی بەدەستییەوە دەینالاند نەمێنێ، ئا بەمشێوەیە رۆژهەڵات لەو خەونە درێژەی خەبەری بووەوەو بەسەر بیروباوەڕی پێشکەوتووخوازو عەقڵانییەت و

زانســــت و تازەگـــــەری و تێگەیشـتنێکی نـوێ بـۆ بـاوەڕدا کرایەوە.

دوایی ئەمین مەعلوف دەڵێ: لـە24ی تـەمووزی 1909دا کـە یەکـــەم ســـاڵیادی راگەیانـــدنی دەســتووری عوسمــانی بــوو، وا رێکـەوتن کـە ئـەو رۆژە بکرێتـە رۆژی ئـازادی، کـەوتنی سـوڵتان عبدالحمیدی ستەمکار روداوێکی گەورە بوو بۆ هەموو رۆژهەلات، لەبەرئـــەوە بطـــرس معلـــوف پێشـــوازی لـــەو رووداوە کـــرد بەنووسـینی چـەندین شـانۆنامەو چـــەندین قەســـیدەی شـــیعر، سـوودی لـەو کەشـی ئازادییـە وەرگـرت بـۆ گوزارشـت کـردن لـەڕاکانی، بـەلام خـەمێك لـەدڵیا مایـەوە، سـەرەڕای ئـەو خۆشـییە زۆرەی بــــەو گۆڕانکارییانــــە هـــەیبوو، بـــەلام دەیزانـــی کـــە شـتەکان وا بەئاسـانی نـاگۆڕرێن، دیـارە ئـەو مەسـەلەیەی کـە زیـاتر لەهـەموو شـتێکی تـر بەلایـەوە گــــرنگ بــــوو بــــارودۆخی کەمایەتییــــــەکانی نــــــاو ئیمپراتۆریەت بوو، لێرەدا بگرس تێبـــینی ئـــەوەی کردبـــوو کـــە گۆڕانکارییەکان زۆر خاووخلیچك دەبـــن تـــا ئـــەو رادەیـــەی لەمەودایـەکی دیـاریکراودا وەکـو ئـەوە دەبـێ کـە هـەر نـەبن، ئینجا مـەعلووف ئـەو گوتـە پـڕ بایەخـە تەواو دەکات و دەڵـێ: مەسـەلەکە پەیوەنـدی بەلێبوردنـــەوە نییـــە بـــەمانا ســـلبیە رەزاقورســـەکەی وشـــەکە، واتـــە سەردەســـتە رێ بەژێردەسـتە بـدات کـە هـەبێت، بـــەڵکو ئـــەوەی کەمایەتییـــەکان داوایـــان دەکـــرد ئـــازادی و هاونیشتمانی تەواو بوو هەروەها یەکســـانی لـــەهاولاتی بوونـــدا لەگـــەڵ رۆڵـــەکانی زۆرینـــە ئیسـلامییەکەدا ئـەو شـتەش لـەو سەردەمەدا نەدەکرا.

ئەمـە نهێنی ئـەو رەشـبینی و نائومێدییـــە بـــوو کـــە بطـــرس هەســـتی پێـــدەکرد، چـــونکە پیـــاوێکی منـــەور بـــوو خـــەونی بـــەوەوە دەدی کـــە لەرۆژهەلاتـــدا ئـــەو سیســـتەمە مرۆڤانـــە شارســـتانیانەی لـــەرۆژئاوادا روویـــدەدا لێـــرەش ســـەربگرێ، هـــەموو ژیـــانی بـــەوەوە بەســـەر دەبـرد خـەڵکی فێردەکـردو بـیری رووناك دەکردنەوە تا بۆ ئەو رۆژە مژدەپێـدراوە ئامادەیـان بکـات، واتـە رۆژی ئازادکردنی فیکـری و سیاسـی و کۆمەلایـەتی، لێـرەوە مـەزنی ئـەو نەوەیـە دەرئەکـەوێ، نەوەی بطرس مەعلووف کە خۆی بـــەختکرد لـــەپێناوی بـــەهاو پرنســـــیپە میســـــالییەکاندا نەشـیتوانی بەچـاوی خـۆی بـەری ئـەو خۆبەختکردنـە ببینـێ، بـەلام نەوەکانی دوایـی توانیـان لەبـەری تێکۆشـــان و قوربانیدانـــەکانیان بخۆن.

دواجـــار ئـــەمین مـــەعلووف توانیـــوێتی وێنەیـــەکی جـــوان پێشکەش بکات سەبارەت بەحاڵ و ئەحواڵی ئەو نەوەیە لەمیانـەی ژیاننامـــەی باپیرەیـــەوە، بـــەلام ژیاننامەکە واقیعییەو زیادەڕۆیی نـــــەکردووە لەفـــــەنتازیاو پاڵەوانێتییـە بەپیرۆزکراوەکانـدا، بـــەڵکو وێنەیـــەکی مێـــژوویی قەناعـەت پێهێنـەرە، یەکـەم بـن و بنەچـــــەکانی خۆمانمـــــان بیردەخاتەوەو پێماندەڵێ لەکوێوە هـاتووین، ئـەو ئەرکانـەش چییە کـــە لەســـەر شـــانمان مـــاوە بەجێیبهێنین، ئـازادکردن ئـەرکی چەندین نەوەیە نەك بەتـەنیا هـەر یـــەك نـــەوە لەبەرئـــەوەی پرۆسەیەکی دوورودرێژو ئاڵۆزە.

لێـرەدا ئـەو پرسـیارەی خـۆی تـەرح دەکات ئەوەیـە: ئایـا ئـەمین مـــەعلووف تەواوکـــەری ئـــەم ژیاننامەیـە دەنوسـێ کـە دواجـار ژیاننامـــەی هەموومانـــە؟ ئایـــا کتێبێك سەبارەت بەنەوەی باوکی دەنووسێ؟ خوێنەران چاوەڕوانی ئەوە دەکەن، چونکە نووسـەرێکی گەورەی رووناکبیرە.

## بۆیە دەنووسم تا درۆكان رسوا بكەم و راستیە تاڵەكانیش بخەمە بەرچاوی خەڵكیی.

جۆرج ئۆرویل

لەعەرەبییەوە: سەردەم



**سەرچاوە**

سایتی/ البنك العربی للمعلومات.
ناوی كتێب/ أصول.
لەبلاوكراوەكانی/ خانەی گراسیێ-پاریس-2004.
ژمارەی لاپەرە/ 486.

جۆرج ئۆرویل بۆ دەینووسی، یان بابڵێین نووسەر بۆ دەنووسێت؟ پرسیارێكە بەردەوام خۆی دووبارە دەكاتەوە، بە تایبەتی كە زۆربەی وەلامەكان بەوە كۆتاییان دێت كە لە ژێر خۆردا هیچ شتێكی نوێ نییە و ئەوەی لە سەرەتای دروست بوونی نووسینەوە جارێك یان چەند جارێك نووسراوە. بەشێوازی تر وەك كاری هونەری دەوترێتەوە. بەلام وەك بابەت هەر لە داستان و ئەفسانە بەراییەكانەوە هیچی تری لێ زیادنەكراوە. هەتا ئەمرۆیش هەر ئەوانە بوونەتە سەرچاوە ئیلهام و بەخششە گەورەكان.

جۆرج ئۆرویل هێشتا لە تەمەنی پێنج شەش ساڵیدا بوو كە هەستی كرد لە ئایندەدا دەبێتە نووسەر. لە نێوان حەڤدە ساڵی و بیست و چوار ساڵیدا دركی تووشی شۆكێكی ئەوەندە بەهێز بوو كە ویستی واز لە نووسین بهێنێت. بەلام ئەوە بێجگە لە دەست درێژییەكی مازوشی بۆ سەر سروشت و بەهرەكەی هیچی تر نەبوو، ئۆرویل بڕوای وایە كە "نامۆییەكەی" وەك منداڵێك لە نێو خوشك و براكانیدا كە پێنج ساڵێك یان لەو گەورەتر بوون یان بچووكترو ئەوەیش كە تاتەمەنی هەشت ساڵی باوكی خۆی نەدەناسی، هۆكارێك بوون بۆ ئەوەی لە ناو تەنیایی و تەریكی تایبەتی خۆیدا بژی و، حیكایەت و كەسانێك دروست بكات تا لە گەڵیاندا بدوێت، بۆ ئەوەی هەستی تەریكیی و بە پەراوێزكراوی لە خۆی بتەرێنێت.

هەستی ئۆرویل بە بەهرەی داهێنانی بووە هۆی ئەوەی بەرگەی دۆخە كۆمەلایەتی و چركەساتە نا جۆرەكان بگرێت، وەلێ نووسینە سەرەتاییەكانی چ مزگێنییەكی ئەدەبیی دیار و درەوشاوەیان بۆ ئایندە پێنەبوو، بەڵكوو لەسەر شێوازی جیورجی لاسایی شیعری رۆمانسی دەكردەوە و چیرۆك و وتاری گاڵتەجاڕ و بەپێی بۆنەكانیش شتی نیشتمانی دەنووسی. ئەوەی لە قۆناغی هەرزەكاری ئەودا سەرنجی ڕادەكێشا ئەوە بوو كە دەقە سەخت و گرانەكانیشی بەزوویی دەنووسی، تەنانەت قەسیدە درێژەكانیش. لە نووسینی بلاوكراوەكانی قوتابخانەیشدا یەكێك بوو لە هەرە چالاك و وریاكان.

"بەپاڵ هەموو ئەمانەوە" ئۆرویل دەڵێت: "لە زەینی خۆمدا

چیرۆکی بێ کۆتایم دەنووسی کە خۆم بەردەوام پاڵەوانەکەی بووم" جارێك روبن هودی سەرکێشی لە یاسا دەرچوو، جارێکی دی سوار چاکێکی بە توانا لە بەرانبەر مەرگا" لەو خەیاڵانەوە ئۆرویل لە زەینی خۆیدا وەسفێکی وردی هەندێك هەڵوێست دەکات. پاشان لە بۆنەیەکی تردا دایدەڕێژێتەوە. ئەم نەریتە هەر دەمێنێتەوە و ئەویش کاریگەریی وەسف و زمانی ڕازاوەی لەسەرە، کە سیمای ڕۆمانەکانی دوای شەڕی جیهانی یەکەمە. ئۆرویل دەڵێت ستاتیکای وشە مووچڕك بە بڕبڕەی پشتیدا دێنێت و ئەوەی قەناعەتیشی لا دروست دەکات کە ئەو کتێبانەی دەیەوێت بیان نووسێت کتێبی گەورە دەردەچن و بەوەسف و وشەی جوان دەڕازێنەوە. لە ڕاستیشدا ڕۆمانی یەکەمی "ڕۆژانی بورما" بێجگە لەوەی ڕەنگدانەوەی ئەزموونی ئۆرویلە لە ڕاژەکردنی پاشایەتی لەسەر زەوی بورما. شێوازێکی داڕشتنی ڕیوایەتە کە پڕە لەوەسفی ڕازاوە و بارکردنی بە جوانکاریەکی زیاد.

ئۆرویل جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە زۆر پێویستە زەمینەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەدەبیی نووسەر بزانین تا وێنایەکمان لە بارەی ڕەوتی داهێنانەکانیەوە لا دروست بێت. بۆیە پێش وەلامدانەوەی پرسیاری: بۆ دەینووسی؟ دەبێت سەرەتایەکمان لە بارەی ئەوەوە هەبێت کە چۆن لەگەڵ قەڵەمدا ژیاوە و پێگەیشتوە.

ئۆرویل هۆی نووسین دەگێڕێتەوە بۆ چوار شت، بە تایبەتی نووسینی پەخشانی هونەری وەك ڕۆمان و کورتە چیرۆك و شانۆ، یەکەمیان بە پێی ڕوانینی ئۆرویل ئەوەیە کە نووسەر ئارەزوویەتی وەك یەکێکی زیرەك دەربکەوێت. هەروەها ببێتە سەرچاوەی بێنەوبەردەو دوای مردنی بە نەمریی بمێنێتەوە و دووقات هەق لەوانەیش بکاتەوە کە لە منداڵیدا گوێیان نەداوەتێ و خستوویانەتە پەراوێزەوە. ئۆرویل دەڵێت: "گومان لەوەدا نییە کە ئەم هۆکارانە هۆکارێکی کاریگەر و ئامادەن" لە دیدی ئەودا ئەمە کۆمەڵێکی زۆر و فراوان لە داهێنەران دەگرێتەوە وەك زانا و هونەرمەند و سیاسی و پارێزەر و سەرباز و بزنزمانە سەرکەوتووەکان. بە کورتی: لووتکە زیرەکەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی. وەلێ خەڵکەکەی دی بەم ڕادەیەی ئەمان خۆپەرستنین. بەڵکو و زۆربەی زۆریان لە دوای تەمەنی سی ساڵیەوە تاك ڕەویەتیە ڕووتەکەی دەڕەوێتەوە یان ژیان لووتی دەشکێنێت. بەلام ئەمە نووسەر ناگرێتەوە، چونکە ئەمان تەواو لووت بەرزن و سوورن لەسەر ئەوەی تا کۆتایی تەمەنیان وەك ئەوەی خۆیان دەیانەوێت ژیان بەسەر بەرن.

هۆی دووەم شەیداییە بۆ جوانیی دەرەوە و هونەرییش. چێژ لەوە دەبینن کە لەسەر هەموو ئاستەکان ئەو جوانییە بەرهەمبهێنن. هەروەها مەیلی هاوبەشیکردن و بەردەوامی و ڕاگەیاندنیان هەیە.

وەلێ ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە جوانکاریی لە خۆیدا ئەنگێزەیەکی بەهێز و کافی بێت. بەڵکوو هۆیەکی یارمەتیدەر و بەگەڕخستنە.

هۆی سێیەم هەستی مێژووییە، واتا نووسەر دەیەوێت وێنای هەقیقەتی مێژوویی بکات لە هەلومەرجە مرۆڤایەتییەکەیدا و لە چوارچێوەیەکی هونەری داهێنراودا بیپارێزێت.

هۆی چوارەم ئامانجی سیاسیە، بە بۆچوونی ئۆرویل سیاسەت ویستێکە بۆ گۆڕین. یان بردنی دنیایە بەرەو

بەدیهێنانی چۆنایەتیەکی باشتر.

ئۆرویل بڕوای وایە کە وتەزای جیاکردنەوەی هونەر لە سیاسەت خۆی لە خۆیدا هەڵوێستێکی سیاسیە، هەروەها جەخت لەسەر ئەوەیش دەکات کە ئەگەر ئەو لە سەردەمێکی ئاڵۆزی پڕ لە گۆڕانو شۆڕش و ململانێی سیاسیدا نەژیابە، بایەخی بەم خاڵی چوارەمە نەدەدا، بەڵکوو دوور لە سیاسەت ژیانی بەسەر دەبرد و تەنیا کارگەلێکی رازاوە بە وەسفی جوان و وتەی قەشەنگی دەنووسی.

لە ڕاستیدا ئۆرویل، ڕەنگە بێ مەبەستیش، چاوەڕێی ئەوە بووبێت، ڕووداوێکی گەورە و کاریگەری سیاسی وەک شەڕی ناوخۆی ساڵی 1936ی ئیسپانیا رووبدات تا بیکاتە بناغەیەک بۆ نووسینەکانی: "لەو کاتەوە ئەوەم لا روون بوەوە هەرچیەک کە دەینووسم دەبێت بەرەنگاری کردنی توتالیتاریەت بێت لەگەڵ دیموکراتیەتی سۆشیالستدا، وەک تێیگەیشتووم" بۆیە ئۆرویل سوور بوو لەسەر ئەوەی نووسینی سیاسی بکاتە هونەرێکی سەربەخۆ، بۆیە یەکەمین دەستپێکی گەڕانێکی بەردەوام بوو بە دوای یەکسانی و هاوکاریەکانی مرۆڤدا: "کە دەمەوێت کتێبێك بنووسم نالێم کارێکی هونەری بەرهەم دێنم، بەڵکوو بۆیە دەنووسم دەزانم درۆیەك لە ئارادایە و دەبێت من ئەو درۆیە ڕسوا بکەم، یان راستیەك هەیە و دەبێت خەڵکیی پێی بزانێت. خەمی سەرەکیشم سەرنج ڕاکێشانێکی پێویستە، لەگەڵ ئەمەیشدا ناتوانم دوور لە ئەزموونی داهێنان بنووسم، هەروەها ئۆرویل لەسەر قسەکانی دەڕوات و دەڵێت: "من ناتوانم، ناشمەوێت، واز لەو خەونە بهێنم کە بە منداڵی بە دنیاوە دەمبینی، تا زیندوویش بم و تەندروستیم باش بێت چێژ لە پەخشانی جوان دەبینم و سەرزەمینیشم خۆش دەوێت، چێژ لە شتە رەوتەنی و زانیاریە پەراوێزیەکانیش وەردەگرم"

بێگومان ئەو یەکخستنی بیرۆکە دیاریکراوە لەگەڵ خولیای داهێناندا کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە گەلێك مەسەلەی بنەڕەتی و زمانەوانی دەوروژێنێت و، هەوڵی دۆزینەوەی دەروازەیەکی تازە دەدات بۆ ڕاستگۆیی لە دەربڕیندا. لەو کتێبەیدا کە لە دوای شەڕی ئەهلی ئیسپانی بە ناوی "سڵاو لە کاتالونیا" دەریکرد، ئەمەندە بە درەوشاوەیی لایەنی تۆماریی و دەربڕینی ئاوێتەی یەکتر کرد بوو کە جێگای مشتومڕی نەهێشتبووەوە. فەسڵێکی تەواوی ناو کتێبەکە بریتی بوو لەو پارچە ڕۆژنامانەی کە رەخنەگرەکان نەك هەر بە پێویستیان نەزانیبوو بەڵکوو وایان دابووە قەڵەم کە زیانی بە بەشەکانی تری دەقەکە گەیاندووە. بەڵام ئۆرویل زۆر تووڕە بوو، ئامادەباشیەکی چاکیش هەبوو بۆ بەرگری کردن لەو عەدالەتەی شکێنراوە، هەر لەبەر ئەم هەقیقەتەیش بووە کە قوربانیی بە لایەنی داهێنانە رووتەکە داوە"

لە ساڵانی داهاتوودا، تا بڵاوبوونەوەی ڕۆمانی "کێڵگەی ئاژەڵان" ئۆرویل جەختی لەسەر ئەوە کرد کە مەبەستی نووسینی لە شێوازێکی یەکگرتوودا ڕێك بخات، شێوازێك تێکەڵ لە پەخشانێکی دوور لە چێژ پێگەیاندن و خەیاڵاندنی ئایندەو رەخنە لە سەرەتای دەستپێکردنی سەردەمی ئامێرانەدن و پلیشاندنەوەی مرۆڤ. لەگەڵ ئەمەیشدا ئۆرویل ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە مەبەستی ئەو لە نووسین تەنیا خەباتێکی سیاسی رووت بێت. پاشان وتارە بەناوبانگەکەی "من بۆ

دەنووسم؟" بەم ڕستانە کۆتایی پێدێنێت: "هەموو نووسەران بە فیزن، خۆپەرستن، تەمەڵن، لە قووڵایی ئەنگێزەکانیاندا نهێنی هەیە. نووسینی کتێبیش، هەر کتێبێک بێت ململانێیەکی سامناک و ماندووکەرە، بەڵکو لە نەخۆشیەکی فرەخایەن دەچێت. کەسیش ئەم جۆرە ئەرکە لە ئەستۆی خۆی ناگرێت ئەگەر دەستێکی غەیبی تیا نەبێت (...) بەڵام مرۆ ئەگەر وەك ئەنجام نەیتوانیبێت کەسایەتی خۆی بتوێنێتەوە، هیچ شتێکی وا نانووسێت کە شایانی خوێندنەوە بێت. پەخشانی نوێ وەك شووشەی پەنجەرە وایە. من نازانم کام لەو ئەنگێزانەی باسم کردن بۆ نووسین لە مندا لەوانی دی بەهێزترە، بەڵام کە نەمزانی ئامانجی سیاسی لە نووسینەکەمدا چییە، ئیتر هەرچیەك بنووسم خاڵیە لە ژیان و بەگشتی نوقمە لە چێژپێدان و فۆرم سازیدا.

**سەرچاوە**

ڕۆژنامەی الحیاة ڕۆژی 2004/12/14.

# چی وا لە نووسەرێك دەكات واز لە نووسین بهێنێت؟

**ربیع جابر**

**لە عەرەبییەوە: سەردەم**



دەشێت بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەوە، کۆمەڵێ وەڵام بخەینە ڕوو:

1- نووسەرەکە لە چرکەساتێکی دەگمەنی ئیلهامبەخشدا بۆی دەردەکەوێت ئەو شتەی دەینووسێت بێ بەهایە. بۆی دەردەکەوێت ئەوەی پێی نەبەخشراوە ببێت بە نووسەرێکی ڕاستەقینە و ئەوەی دەینووسێت شتێکی دیار و جیاواز نییە، ئەوەی دەینووسێت جگە لە ڕەشکردنی چەند لاپەڕەیەکی سپی بە پیتەکان،

شتێکی تر نییە، شتێك کەشف دەکات بەڵام گومان لە ڕاستەقینەیی هەمیشەیی ئەو شتە دەکات، بەڵام نووسەرەکە ئەمجارە بە بوێرییەوە ڕووبەڕووی حەقیقەت دەبێتەوە: بۆی دەردەکەوێ ئەوەی دەینووسێت بێ بەهایە بۆیە بڕیار دەدات واز لە نووسین بهێنێت. ئەمە مەسەلەیەکە بە دەگمەن ڕوودەدات. نووسەرێك لە بیرکردنەوەدا بگاتە ئەو ئاستە، ئەوا ئەو نووسەرە، لانی زۆر، نوسەرێکی ڕاستەقینەیە. واتە نووسەرێکە شتی پێیە بۆ نووسین، وازهێنانیشی لە نووسین زیانێکی گەورەیە.

2-لێرەدا وەڵامێکی دیکە هەیە کە لە وەڵامەکەی پێشوو ماقووڵترە؟ نووسەرەکە بۆی دەردەکەوێ کە سەرچاوەی داهێنان لە هەناویدا وشکی کردووە، تێدەگات ئیدی لەم چرکەساتەوە شتێکی پێ نییە بۆ نووسین. بەڵێ پێش زەمەنێکی دوور شتێکی پێ بوو بینووسێت و شتێکی دەنووسی ئەدەب بوو، بەڵام ماوەیەکە بێتوانایە لە نووسین، گەر بشنووسێت، خۆی بەو نووسینە رازی نییە، لەم ساتەدا رێک هەستی ئەو نووسەرە بەم شێوەیە دەبێت: ئەمڕۆ وەکو ڕۆژانی رابردوو توانای نووسینی نەماوە بۆیە بڕیار دەدات واز بهێنێت، دنیا پڕە لە کتێبی ناچیزەو خراپ ئیدی بۆچی کتێبی دیکە بەسەر ئەو کتێبانەدا کەڵەکە بکات؟

3-نووسەر، لە دوای چەندین شکست و نیگەرانی، هەست بەوە دەکات کە هیچ کەسێ نووسینەکانی ناخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێ کتێبە چاپکراوەکانی لە مەخزەنەکاندا خۆڵیان لەسەر نیشتووە. دەتوانێ خەیاڵی ئەوە بکات چەندین کتێب لە نێو کارتۆنەکاندا هەڵگیراون و مشکەکانیش لە تاریکیدا بە نێو کارتۆنەکاندا فرتە دەکەن، ئەو نووسەرە وا هەست دەکات جیهان ئاگای لە بوونی ئەم نییە، مەرج نییە ئەم نووسەرە عەرەب بێت، لەگەڵ ئەوەی هەموو نووسەرێکی عەرەب دوچاری هەستێکی لەم چەشنە دەبێت تەنانەت بێئەوەی ئەو راپۆرتە گرنگەش بخوێنێتەوە کە لە بارەی پەرەپێدانی مرۆیی لە جیهانی عەرەبیدا، نووسراوە. ئەو نووسەرە وا هەست دەکات کە شەونخوونی و ماندوبوونی بە خۆڕایی دەڕوات، چارەنووسی کارەکانی ڕوو لە تاریکییە، ئەم هەموو هیلاکییە لە حاڵەتی ئەو ژنە دەچێت کە منداڵێکی دەبێت و کەچی منداڵەکەی فڕێ دەداتە دەریاوە. باشە بۆچی منداڵە ئازیزەکەی خستە دەریاوە؟ بۆچی ئەم ژنە جگەرگۆشەکەی فڕێ دا؟ بەمجۆرە ئەو نووسەرەی بەرهەمەکانی ناخوێنرێنەوە، هەستێکی لەم چەشنەی دەبێت. ئەو هەروەکو ئەو ژنەی منداڵەکەی فڕێ دەداتە نێو دەریاوە، کتێبەکانی خۆی فڕێ دەداتە نێو جیهانەوە. ئیدی ئەو نووسەرە لەم حەقیقەتە تێدەگات و واز لە نووسین دەهێنێت. ئەمە نووسەرێکە جیهان نیگەرانی کردووە و دوچاری داکەوتنی کردووە. دەشێت ئەو نووسەرە ناوی هێرمان ملیڤڵ بێت.

4-نووسەر وای دەبینێت نێوبانگ ماندووی دەکات و سنوورەکانی بەرتەسک دەکاتەوە. هەر کە ڕۆمانێك و دوو ڕۆمان بڵاودەکاتەوە ئیدی هۆیەکانی راگەیاندن دوای دەکەون و لە هەر شوێنێکدا بێت وازی لێناهێنن. ئەم نووسەرە دەبینێت ئەم هەموو بایەخدانەی راگەیاندنەکان شتێکی ماندووهێن و خەمهێنەرە. ئەو حەز لە نووسین دەکات و هەروەها حەز لە وازهێنانیش دەکات. چۆن، بەبێ وازهێنان، بنووسێت؟ ئەم نووسەرە پشت لە جیهان دەکات و دەچێتە نێو چوارچێوەی تەنهایی خۆیەوە. دەشێت ئەو نووسەرە ناوی ج.د.سالنجەر بێت، ئاخۆ لە نێو ئەم تەنهاییەی خۆیدا دەست بە نووسین بکات. بێئەوەی بڵاویان بکاتەوە، بێئەوەی ئەو شتانە بڵاوبکاتەوە کە لەوێدا، لە دەرەوە، لە جیهانی گەورەدا دەیاننووسێت؟ لەوانەیە. کەس نازانێت. بەڵام، بە زۆری وا پێدەچێت، وازی لە نووسین هێنابێت.

5-نووسەر تەماشای نووسەرەکانی دیکە دەکات و بە

بەرهەمەکانیاندا دەچێتەوە و بیر لەوە دەکاتەوە، هەروەکو سامۆیل جۆنسون، نووسەرە هاوچەرخەکانی خۆی خۆش ناوێت. بۆی دەردەکەوێت حەز لەوە ناکات خۆی بداتە سەر نووسین. لە هەموو ژیانیدا ویستوویەتی جیاواز بێت و لەوانی دی نەچێت، لە هەموو ژیانیدا ویستوویەتی خۆی خۆی بێت و کەسێکی تر نەبێت، مادامەکی هەموو خەڵکی بەرەو دانانی کتێب دەڕۆن (تەماشای ئەو ژمارە زۆرەی کتێب بکەن!) تەنها ڕێگەیەك لەبەردەمیدا بۆ جیاوازبوون بریتییە لە وازهێنان لە نووسین. بەمجۆرە واز لە نووسین دەهێنێت.

6–ئەو نووسەرە لەگەڵ خۆیدا بڕیاری ئەوە دەدات ئەو شتانەی نووسیونی بەسە و زۆریشە. ئیدی پێیەکانی درێژ دەکات و چایەکی شیرین دەخواتەوە و سەیری ئاسمان دەکات، لەمەوپاش چیتر نانووسێت، زۆر ماندووبوو، ئێستا کاتی پشوودانە و نووسین هیلاکی کردووە، ساتی پشوودان هات.

سەرجەمی ئەو وەڵامانەی سەرەوە لە دوو وەڵامدا کورت دەبنەوە: لێرەدا دوو هۆکار هەن وا لە نووسەرێك دەکەن واز لە نووسین بهێنێت، یەکەم: گرفتێکی لەگەڵ نووسیندا هەیە. دووەم: گرفتی لەگەڵ جیهاندا هەیە.

سەیر ئەوەیە لە یەکێ لەم دوو هۆیەدا نهێنییەکی



# مارکیز

## ئاهەنگی خۆشەویستی سازدەکات.. بە پیری

لە عەرەبییەوە: سەردەم

سەمەرە هەیە کە لە بنەڕەتدا پاڵ بە نووسەرەوە دەنێت بنووسێت.

**سەرچاوە**

لە ئینتەرنێتەوە

(*www.balagh.com*).

دوای ئەوەی نزیکەی دەساڵ گابریل گارسیا مارکیز لەسەر شانۆی ڕۆماننووسی دیارنەما، جارێکی تر بە ڕۆمانێکی چڕو بچووك هاتەوە گۆڕێ. بابەتی ڕۆمانەکە ناوەڕۆکێکی خۆشە کە بریتیە لە ژیانی خۆشەویستی لە پیریدا. کە ئاسایی بێ توانایی و تەریکیی لەگەڵدایە، بەڵام لە ڕۆمانەکەدا "یادوەری هەر شۆخە غەمبارەکانم" وەرگێڕانی (سالح عەلمانی – دار المدی) پیریەتی ڕەوتێکی تر لە خۆ دەگرێت. لە ڕۆمانەکەدا "موستوکویاد" ڕۆڵی کەسایەتیەکی ڕەها دەبینێت کە ئاهەنگی نەوەد ساڵەی تەمەنی ساز دەکات. موستوکویاد ڕێك پۆشێکە هیچ لە ژیانی رابووردووی پەشیمان نییە، ئەو ژیانە خۆشەی ئێستا روو لە ئاوابوونە.

مارکیز لە کاتی خۆیدا گەلێك سەرسام بوو بە ڕۆمانی (ماڵی شۆخە نوستوەکان)ی نووسەری یابانی یاسوناری کاوابات. جارێك لە بابەتێکی ڕۆژنامەنووسیدا لەم بارەیەوە دواوە و باسی سەرسامی خۆی

بەو ڕۆمانە کردووە. دەربارەی ژنێکی جوانە کە لە فڕۆکەدا لە پاڵیا دانیشتوەو لە سەفەرێکی دوور و درێژدان. ژنەکە لەسەر کورسیەکەی خەوی لێکەوتووە ئەمیش بە درێژایی ڕێگاکە لێی ورد ئەبێتەوە. لەو ڕۆمانەوە ئەو ئاگادارکردنەوەیەی دێتەوە بیر کە ژنە بەڕێوەبەری ئوتێلەکە بە ئایگوشی پیری دەدات دەربارەی تەماشاکردنی کچە جوانەکانی گیشا کە بەرووتی نووستوون: نابێت لەو شتە نزیك بکەویتەوە کە پێچەوانەی زەوقە..

مارکیز جارێك لە بارەی خۆیەوە وتی: "لەباری غەمباریو گۆشەگیریەوە لە هەموو ئەو کەسانە لەسەرترم کە دەیانناسم" مارکیز لەم ڕۆمانەدا پەیجوری گۆشەگیریی پیاوێکی پیرە، پیاوێکی تاق و تەنیا کە هەمیشە لە بەزم و ڕەزمی تایبەتی خۆیدایەو وەك منداڵ هەڵس و کەوت دەکات. بە دەیە حساب بۆ تەمەنی دەکات نەك بە ساڵ. بەڵام لە ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەڵاتی زەماندا هەمیشە بە خۆشویستن ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ئاهەنگەکانی خۆی بە "شەوێکی عەشقی شێتانە" تەواو دەبێت. چونکە لای ئەو هەمیشە خۆشەویستی هاوشانی ژیانە و لەگەڵیایەتی، مانای خۆشەویستی و ڕەمزەکانی نەگۆڕن، ئەگەرچی کەشوهەواو جۆرایەتیەکەی بەپێی کات و کەسەکان بگۆڕێت. ئەو بە تێرامان دەگەڕێتەوە بۆ لای رابوردوە حیسیەکەی، بیر لەو ژنانە دەکاتەوە کە کەم تا زۆر بەردەوام لە ژیانیدا ئامادەبوون و نەیانهێشتوە لە کاتی خۆیدا ژن بێنێت. ئەو لە نەوەد ساڵەی تەمەنی ناترسێت. چونکە دەیەوێت بە یادوەریەکانی ئاهەنگی سەد ساڵەی تەمەنی بگێڕێت و وزە زەینی و جەستەییەکانی لە کەشی ئاهەنگ گێڕانێکی تردا تاقی بکاتەوە کە بگونجێت لەگەڵ سەرگەردانیەکانی خۆشەویستی لەگەڵ ژنێکی مەلوولی رووبازاڕیدا کە دەشێت پەندێك دەگمەن لە وتەکانیان وەربگرێت، وەك: مرۆڤ لە ناوەوەیدا هەست بە پیریەتی ناکات، ئەوە ئەوانی ترن کە لە دەرەوە دەیبینن.

لێرەوە "موستوکویاد"ی پاڵەوانی ڕۆمانەکە بە هەموو هەستی بەرەنگاری سروشت دەکات و دیوارەکانی گۆشەگیری دەڕوخێنێت. "لە خۆراوابووندا ڕووبەڕووی لێزمە باران بوومەوە، زریانێك بوو هەڕەشەی لەبندەرکێشانی ماڵەکەی دەکرد. کەوتمە پژمینێکی سەرومڕەوە، سەرم کەوتە ئێش و تام لێ هات، بەڵام توانا و بڕوایەکی وام هەبوو کە هیچ کاتێکی تر ئەوەم بە خۆمەوە نەبینیبوو، لە ڕێگای هیچ مەسەلەیەکیشدا"

ڕەنگە ئەم ڕۆمانە بکەوتایەتە خانەی ئەدەبی سێکسیەوە کە لە وێزگەکانی سەفەردا زۆرترین فرۆختیان هەیە ئەگەر نووسەرەکەی مارکیز نەبوایە کە لە درێژدادڕی و پێ لێ هەڵبڕینی سێکسیەوە دوورە.

مارکیز تەنیا بە هێما و وەرچەرخانە ڕۆژانەییەکانی کەسە راستەقینەکان لە روو دەمامکەکاندا وازی هێناوە. وەك پیشەی خۆی راوی ئەو چرکەساتە درەوشاوانەی ژیانی کەسایەتیەکانی کردوە کە لە کات و شوێن و لە نێوان شەوورۆژدا بە هەموو جوانی و خولیا مرۆڤایەتیەکان ڕوویانداوە، حاڵەتە تایبەتیەکانی خۆشەویستی. تەنانەت کاتێك ئەو خۆشەویستیە دەبێتە کوتاڵێك لە بازاڕی لەزەتدا.

مارکیز وەك ڕەوشتی خۆی حەزی بە شاردنەوە و

فێڵ نییە، کاتێك دیمەنێکی ئەفسوناوی لەناکاومان لەناو ئەو هەموو دیمەنانەدا پیشان دەدات کە وادەزانی لە ژیانی ئەوانەدا کە پاش دەیان ناسین ئاساییە، بەڵام هەندێك جار لەودیو دەمامکەکانەوە شتی تر هەن.

ڕۆمانی "یادوەریی هەرە شۆخە غەمبارەکانم" هەڵایەکی زۆری لەو وڵاتانەدا بەرپاکرد کە بە زمانی ئیسپانی دەدوێن. لە پێش بڵاوبوونەوە و دوای ئەوەیش لە کۆتایی ساڵی رابوردوودا، یەك ملیۆنی لێ بڵاوبوەوە، سێ سەد و پەنجا هەزاری تەنیا لە کۆلۆمبیادا. کاتی چاپ و بڵاوبوونەوەیشی زۆر بە نهێنی کرا لە ترسی چەتەکان. لە دابەشکردنیشیدا ئۆتومبیلی زریێ پۆش و لە ژێر پاسەوانیەکی توندا بوو. لەگەڵ ئەمانەیشدا چەتەکان توانیان خۆیان بە نهێنی چاپی بکەن و لە پێش بڵاوبوونەوەی ڕەسمی بە دوو هەفتە لە شەقامەکاندا دابەشی بکەن، لە بوگوتای پایتەختی کولومبیادا بە نیوە قیمەت فرۆشتیان.

لەگەڵ ئەوەی کە باری تەندروستی مارکیز خراپە، هەواڵەکان وا دەگەیەنن کە لە هاوینی داهاتوودا ڕۆمانێکی تری بچووکی بڵاودەبێتەوە. خوێنەر و بڵاوکەرەوە و چەتەکان بەیەکەوە چاوەڕوانن. بەمەیش مارکیز ململانێ لەگەڵ نەخۆشیدا دەکات و بەردەوامە لەسەر نووسین. دوای ئەوەی پێش پێنج ساڵ قەسیدەیەکی نووسی کە ماڵئاوایی لە ژیان دەکات کە شانۆیەکی دەوڵەمەندی بەرهەمەکانی بوو.



# مێژووی فەلسەفەی سیاسی
## -لە سەردەمی یۆنانەوە تا ئەمڕۆ-

**لە عەرەبییەوە: سارا ئەحمەد**

### سەرچاوە

ڕۆژنامەی الحياة، 2005/1/31.

*Understanding the Philosophers Political*
*From ancient to moderne times*
*Alan haworth*
*Routhedge- London, 2004 P. 304*

نوسەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆر "ئالان هاورس"ە. "هاورس" مامۆستای فەلسەفەیە لەزانکۆی لەندەنو لەوێدا وانەی (فەلسەفەی سیاسیو ئەخلاقناسیو مێژووی بیر) دەڵێتەوە. خاوەنی چەند کتێبێکە, لەوانە: (فەلسەفەو ئەفسانە *1994*), (گوتاری ئازاد *1998*). لەم کتێبە تازەیەدا باس لە مێژووی فەلسەفەی سیاسی دەکات, لەسەردەمی یۆنانەوە تاڕۆژگاری ئەمڕۆمان. کتێبەکە کراوەتە سێ بەشو هەربەشێکیشی لەچەند نەسکێك پێکهاتووە.

بەشی یەکەم باس لەبیریارە مەزنەکانی ئەسینا دەکات, واتە "سوکرات و ئەفلاتونو ئەرستۆ". دوای ئەوە نوسەر دەپرسێت: (پاشان چی روویدا؟). لێرەوە باس لەدواین گۆڕانکاریەکانی فەلسەفەی

سیاسی دەکات, لای بیرمەندانی یۆنانی دوای "ئەرستۆ"و هەروەها باس لەڕۆمانەکانیش دەکات کەدوا بەدوای ئەوان دێن. ئەقڵو شۆڕشەکان, ناونیشانی دووەم بەشی کتێبەکەیەو بەسەر چەند نەسکێکدا دابەش بووە. نەسکی یەکەم, باس لە فەیلەسوفی بەریتانی "تۆماس هۆبس"و سەفەرکردنی ئەو بۆ پاریس دەکات. لەنەسکی دووەمیشدا نوسەر تیۆریای "هۆبس" دەخاتە روو.

ناونیشانی نەسکی سێهەم بەمجۆرەیە: (جۆن لۆكو سستمی نوێ). لە چوارەم نەسکدا, نوسەر بەردەوامە لەسەر قسەکردنی دەربارەی "لۆك"و تیۆریاکەی سەبارەت بەموڵکایەتی. هەرچی نەسکی پێنجەمە, ئەوا تەرخانە بۆ "جان جاك رۆسۆ". بەشی سێهەمو کۆتایی کتێبەکە بەناوی: (سەردەمە نوێیەکانو بابەتە نوێیەکان). نوسەر لەم بەشەدا دێتە سەر باسی فەیلەسوفی بەریتانی "جۆن ستیوارت میل"و تیۆریاکەی دەربارەی پراگماتیزمو لیبرالیزمو پاش ئەوە قسە لە"مارکس"و مارکسیزم دەکات.

نەسکی دوای ئەو تەرخانە بۆ فەیلەسوفی هاوچەرخی ئەمریکایی "جۆن رۆس"و تیۆریا بەناوبانگەکەی لەمەڕ (دادپەروەری). کتێبێکە بەم پرسیارە کۆتایی دێت: (پاش ئەوە چی رویدا؟). لێرەدا باس لەدواین ئەو مشتومڕانە دەکات کەتایبەتن بەفیکری سیاسی لە ئەوروپاو ئەمریکادا.

ئەمە سکێچێکی گشتی کتێبەکەیەو ئیستا هەوڵ دەدەین بچینە ناو وردە کاریەکانەوە.. ئەڵبەتە یەکەمین بیریاری سیاسی "ئەفلاتون"ەو لەم بوارەدا دوو کتێبی سەرەکی هەیە, کەبریتین لە: (کۆمارو یاساکان). یەکەمیانی لە ناوەڕاستی تەمەنیدا نوسیووە, بەڵام دووەمیانی وەختێك نوسیوە کە بەساڵدا چوو بوو. سیاسەت بەپێی پێناسەی "ئەفلاتون" : (بریتییە لە پەروەردەکردنی رەگەزی مرۆڤایەتی. هەروەها ئەو هونەرەیە کە بەهۆیەوە دەتوانین رێنوێنی کۆمەڵگای ئینسانی پێ بکەینو دیسپلینیشیان بکەین. دەکرێت لەڕێی زەبرو زۆرو تەنانەت توندوتیژیشەوە رێبەرایەتی مرۆڤ بکەین, بەڵام دەکرێت بەپێی خواستو ویستی خۆشیان ئەو کارە بکەین).

حوکمکردنی مرۆڤ لەڕێی بەکارهێنانی هێزەوە, "ئەفلاتون" ناوی دەنێت ستەمکاری, بەڵام حوکمکردنیان بەباشیو لەڕێی قەناعەت پێکردنەوە, ناودەنێت سیاسەت. کەواتە سیاسەت بەبۆچونی "ئەفلاتون", بریتییە لە حوکمکردنی مرۆڤ بەویستی خۆیو رازی بوونو راگۆڕیینەوە لەگەڵیدا.

سیاسەت مەداریش ئەو کەسەیە کەدەزانێت ئەوە بکات: واتە بەچاکی لەو هونەرە قورسە شارەزابێت. بەبۆچونی "ئەفلاتون" پیاوانی ئاینی لەخوار سیاسەتمەدارانەوەن, ئەمەش بۆچونێکی زۆر بوێرانەیە بۆ ئەو سەردەمەی ئەو کەبڕوای بە سەرچاوەی تیۆلۆژیو ئاینیانەی دەسەڵات هەبوو, پێدەچێت "ئەفلاتون" زۆر لە زووەوە عەلمانی بوو بێت.

بەلای "ئەفلاتون"ەوە باشترین حوکم, حوکمی فەیلەسوفانو حەکیمەکانە, ئەوانەی دەزانن کاروباری خەڵك بەڕێوەبەرنو دادپەروەرانە بجوڵێنەوە, بەڵام کێشە لەوەدایە کە بەدەگمەن فەیلەسەف دەگاتە کورسی حوکمڕانی. هەندێ جار نەزانو گەمژەو سەرەڕۆکان دەگەنە ئەو جێیە, بەڵام جاری

واش هەیە گەورە پیاوانی وەك "چەرچڵ" لە بەریتانیاو "شارل دیگۆل" لە فەرەنساو.. هتد, ئەو پۆستە دەگرنە دەست. دوای "ئەفلاتون", نوسەر دێتە سەر شرۆڤەکردنی تیۆریاکەی "ئەرستۆ" دەربارەی سیاسەتو دەڵێت: (لەساڵی *366* پ.ز ئەفلاتونی یۆتۆبیست نائومێد بوو لە هاتنە ئارای فەرمانڕەوای دادپەروەرو دانا, پاش ئەوەی نەیتوانی دیکتاتۆرەکانی سقلیە والیٚ بکات کە بە فەلسەفە ئاشنابن. بەمجۆرە بەتێکشکاوی و نائومێدیەکی قوڵەوە گەڕایە ئەسینا). بەڵام خۆشبەختی لەوەدابوو کە چەند خوێندکارێکی بینیەوە لەچاوەڕوانی ئەودا بوون, یەکێکیان بلیمەتی و زیرەکی لەچاویدا دیاربوو, ئەوکەسەش "ئەرستۆ" بوو. ماوەی بیست ساڵ لە "ئەفلاتون" دوور نەکەوتەوە, بۆ ئەوەی فەلسەفەو دانایی لێوە فێربێت. دواتر خۆی بووە مامۆستاو تەنانەت وای لێهات لەسەر گرتنی لوتکەی مەعریفە, بووە گەورە رکابەری "ئەفلاتون".

"ئەفلاتون" چەند یۆتۆبی و خەیاڵی بوو, "ئەرستۆ" ئەوەندە واقعی و مادی بوو. یەکەمین خەسڵەتی "ئەرستۆ" واقعیەت بوو, ئەو میتۆدەی بەسەر زانستە سروشتیەکاندا پراکتیزەی دەکرد بەسەر زانستی مرۆڤیشدا دەیکرد. بەرهەمە سیاسیەکانی "ئەرستۆ" لەڕوی ریزبەندیەوە پاش بەرهەمە ئەخلاقی و ئابوریەکان دێت, ئەمەش مانای وایە کە پەیوەندی لەنێوان سیاسەت و ئەخلاق و ئابوریدا هەیە. بەبۆچونی ئەو سیاسەت بەبێ ئەخلاق مانایەکی نییەو بێ نرخە.

"ئەرستۆ" وەکو تەواوی فەیلەسوفانی بەر لە خۆی, پێی وایە ئامانجی سیاسەت ئەوەیە مرۆڤەکان والێبکات چاکەکارو سەر راست و دەست پاك بن. کەواتە دەبێت سیاسەت ملکەچی ئەخلاق بێت و لە ئەخلاق جیانەبێتەوە, نەك بەپێچەوانەوە, وەکی هەلپەرست و پراگماتیە کان پێیان وایە.

"ئەرستۆ" وا پێناسەی سیاسەت دەکات کە: (بریتیە لە هونەری رێبەرایەتیکردنی دەستە جەمعیانەی مرۆڤایەتی, هەر کەسێکیش لە سەردایەتیکردنی خەڵك و کۆمەڵگە بزانێت, دەکرێت بە سیاسەتمەدارێکی لێهاتووی بدەینە قەڵەم. ئامانج لە سیاسەت بەختەوەر کردنی مرۆڤە لەڕێی حوکمکردنیان و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان بەشێوەیەکی راست و دروست. بەختەوەریش واتە قوتاربوون لەسەر قاڵی و خەمە لاوەکیەکان و پەیداکردنی بژێوی, ئەمانەش ئەو شتانەن کە سیاسەتی باش بۆ کۆمەڵگای دەستە بەردەکات. دوای ئەوەی لە خەمی شتە مادیەکان دەبینەوە, دەکرێت خوبدەینە چێژە فیکری و تێڕامانە فەلسەفی و رۆحانیەکان. مرۆڤ مادامەکی گرفتاری کێشەکانی ژیان و پەیداکردنی نان و ئاوبێت, ناتوانێت خۆی بۆ مەسەلە بەرزو باڵاکان تەرخان بکات).

"ئەرستۆ" پێی وایە سێ جۆر حکومەت هەیە, حکومەتی تەنها کەس هەیە کە ئەمە حکومەتی ستەمکاریە, حکومەتێکی تریش هەیە کەحکومەتی کەمینەیەو ئۆلیگارشی پێ دەوترێت, لەلایەکی ترەوە حکومەتی زۆرینەشمان هەیە کەبە دیموکراسی ناو دەبرێت. بێگومان ئەمەیان چاکترین جۆری حکومەتە, لەبەرئەوەی بوار بە زۆرترین خەڵك دەدات تاڕاوبۆچونی خۆیان لەسەر مەسەلە گشتیەکان بدەن.

پاشان "هاورس" دێتە سەر سەردەمە نوێیەکانو لەلای سێ تیۆرسینی گەورە کەبریتین لە: "تۆماس هۆبسو جۆن لۆکو جان جاك رۆسۆ" دەوەستێت. سەبارەت بە "هۆبس" دەڵێت: (لە سەردەمێکی دژوارو ناهەمواردا ژیاو ترسێکی زۆری لەژیانی خۆی بوو، ئەمە وایکردووە تیۆریا سیاسییەکەی لەژێر کاریگەری ئەو هەلومەرجەدا بێت کەتیایدا ژیاوە. ئەو بەردەوام لەدالغەی ئەوەدا بووە لەلایەن توندڕەوە مەسیحیەکانەوە تیرۆربکرێتو لەناوی بەرن).

سەبارەت بە "جان جاك رۆسۆ"ش، نوسەر دەڵێت: (ئەو بەرەخنەکردنی سستمی فیوداڵی مەسیحی کۆن دەستی پێکرد، پاش ئەوە تێرمی ئیرادەی گشتی هێنایە ئاراو مەبەستیشی لێی ئەوە بوو: هەموو یەکێك دەست بەرداری بەشێك لە ئیرادەی خۆی دەبێت، لە پێناو ئیرادەیەکی بالاتردا کەئیرادەی گشتییە. کەواتە ئیرادەی گشتی بریتیە لە کۆبونەوەی تەواوی ئیرادەکانی ناو کۆمەڵگاو ئەمەش لە دەوڵەتو دەسەڵاتو یاساکاندا بەرجەستە دەبێت. کەوابێت مرۆڤ بەخواستی خۆی گوێرایەڵی دەسەلات دەکات، لەبەرئەوەی ئیرادەی تێکەڵ بە ئیرادەی گشتی دەبێتو بەشداری لە دروست بونیدا دەکات. دەسەلاتیش لە سستمی حوکمڕانی نوێدا وەکی ئەوەی "رۆسۆ" خەونی پێوە دەبینی، دەسەلاتێکی رەهاو هەتا هەتایی نییە، بەڵکو بەردەوام یان ناو بەناو لە گۆڕاندایە. بەئەنجامدانی هەر هەڵبژاردنێکی گشتی، دەسەلاتێکی تازە دێتە ئارا یاخود دەرفەتێکی تر بە دەسەلاتی پێشو دەدرێت تاماوەیەکی تر لە حوکمدا بمێنێتەوە. کەواتە ئەوە هاولاتیانن کە لەرێی دەنگدانەوە، دەسەلات دروست دەکەنو ئەندامانی پەرلەمان دەست نیشان دەکەن).

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کەسی حوکمڕان بێ ڕاوێژو وەرگرتنی رای خەڵکی، خۆی بەسەر هەمواندا دەسەپاندو دەسەلاتی دەگرتە دەست. بەلام لەسەردەمی تازەدا گەل دەتوانێت کەسی فەرمانڕەوا هەڵبژێرێت یان لەسەر کاری لاببات. ئەم پرۆسەیەش تاڕادەیەکی زۆر بەرهەمی فیکری "جان جاك رۆسۆ"یە، ئەمەشە کەبە حوکمی دیموکراسی یاخود حوکمی گەل ناودەبرێتو لە سەردەمی "ئەرستۆ"و لە شاری ئەسینادا بەرقەرار بووە. بەلام دیموکراسی ئەو کاتە ناتەواو بوو، لەبەرئەوەی دەنگدان بەتەنها مافی پیاوە ئازادەکان بوو، ژنانو خزمەتکارو کۆیلەکان بۆیان نەبوو بەشداری ئەو پرۆسەیە بکەن. ئەم هەلومەرجە لەسەردەمی تازەدا گۆڕاو مافی دەنگدان درا بە هەموو کەس، ئەگەرچی ژنانی فەرەنسا لەساڵی *1945*و لەسەردەمی ژەنەڕاڵ "دیگۆل"دا ئەو مافەیان پێ برا.. پێشتر لە فەرەنسا تەنها پیاوان مافی دەنگدانیان هەبوو.

لە درێژەی قسەکانیدا، "ئالان هاورس" دەڵێت: (سستمی نوێی دیموکراسی هەروا بەئاسانی لە ئەوروپادا نەچەسپیو زیاد لەجارێك هێزە کۆنسێرڤاتیڤو موحافیزکارەکان هەوڵی ئەوەیاندا کۆدێتای لێ بگێڕن، بەلام بۆ ماوەیەکی کەم نەبێت لەو کارەیاندا سەر کەوتوو نەبوون. دواجارو بەتەواوەتی لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا دیموکراسی لە فەرەنساو بەریتانیاو ئەڵمانیادا سەرکەوت، هەرچی ئیسپانیاشە درەنگتر دیموکراسی پێگەیشتو پرۆسەکە ئەو کات سەری گرت، کە لە ناوەڕاستی حەفتاکانی

سەدەی رابردوودا فرانکۆی دیکتاتۆر مرد).

کەواتە دیموکراسی بریتی یە لە پرۆسەیەکی درێژخایەن و ناکرێت لەشەو رۆژێکدا بێتە دی. چەند مەرجێك هەیە دەبێت لە ئارەدا بێت بۆ ئەوەی دیموکراسی بەفیعلی بچەسپێت، گرنگترینیان بریتییە لە: فێرکردن و رۆشنبیرکردنی میللەت و قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری و نەزانین. پاشان بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی و چاکردنی باری ئابوری میللەت، چونکە هەژاری دوژمنی دیموکراسیە. ئەگەر ئابوریەکی بەهێز لە ئارەدا نەبێت ناپشتیوانی حوکمی دیموکراسی بکات، ئەوا دوای تەقینەوەی کێشە کۆمەلایەتیەکان هەرەس دێنێ و پشێوی دەست پێدەکات و شۆڕشی برسیەکان بەرپا دەبێ.

ئەوروپا زۆری بە دەست ململانێی نێوان رێبازی فیودالی کۆن و ئاقاری لیبرالیزمی دیموکراسی نوێوە چەشت. تەواوی مێژووی شارستانیەتی ئەوروپا لەسەدەی حەڤدەهەمەوە، بریتییە لە ململانێی بەردەوام و هەندێ جاریش ئاگر بڕی کاتی نێوان ئەم دوو ئاقارە. گەورە فەیلەسوف و ئەدیب و شاعیرانی ئەوروپاش لەم ململانێیەدا بەشدار بوون.

لەوانە دەتوانین ناوی: "سپینۆزاو تۆماس هۆبس و جۆن لۆك و ڤۆلتێرو جان جاك رۆسۆو کانت و هیگڵ و فیکتۆر هیگۆو.. هتد"، بێنین. ئەمانە بوون توانیان میللەتەکانیان وشیار بکەنەوەو لە دەست نەزانین و دەمارگیری ئایینی و کێشە مەزهەبی و خێڵەکیەکان رزگاریان بکەن، بەلام لەم کارەیاندا رووبەڕوی پیاوانی ئایینی بوونەوە.

وەکی ئاشکرایە پاپاکانی رۆما، رۆلێکی بەرچاویان هەبوو لەدژایەتیکردنی ئایدیا تازەکانی وەك: (لیبرالیزم و دیموکراسی و سۆسیالیزم و.. هتد). کلێسا لە دژی ئەوانە فتوا گەلێکی داو ئەوانەی لەخانەی کوفرو بیدعەو گومڕایدا ریز کرد. ئەم حاڵەتەش تا ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی رابردوو بەردەوام بوو، دوای ئەوە پاپا لەرۆما کۆنگریەکی گەورەی بۆ پیاوانی ئایینی مەسیحی سازداو، هەموویان رێکەوتن لەسەر ئەوەی ریفۆرمێکی ریشەی لەبیروباوەڕیاندا ئەنجام بدەن، بۆ ئەوەی لەگەل رۆحی سەردەمی تازەدا بگونجێت و بۆ هەمیشە لەپێکداداندا نەبن.

لەم کۆنگرەیەدا پیاوانی ئایینی مەسیحی، بەکۆمەڵە بریارێکی گرنگ و بوێرانەوە هاتنە دەرێ کە لەگەل ئاقاری پەرەسەندن و بەرەو پێشچونی رۆژگاردا بگونجێت، هەروەها هەندێك بیروبۆچونی سەرەکی رۆشنگەری و فەلسەفەی ئەقلانیان پەسەند کرد.

## سەرچاوە

بیان الکتب- 2004/11/9.

# بۆ خوێنەرانی
# "گۆڤاری سەردەم"

ئاگاداری خوێنەرانی گۆڤارەکەمان دەکەین کە لە ژمارەکانی داهاتووماندا دوو فایلی تایبەت بە :

*گابریل گارسیا مارکیز
*میشێل فۆکۆ

دەکەینەوە.

چاوەڕێی هاوکاری و بابەتەکانی ئێوەن

